باشترین هاوڕێ ١٦

د. عبدالله عزّام

# تێگەیشتن و ئیجتیهاد لە جیهاددا

ابو علي الكردي

منتدى اقرأ الثقافي

وەرگێڕانی بە دەستکارییەوە

م. هەورامان گەچێنەیی

چاپی دووەم

﴿ وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦ ﴾

الحج: ٧٨

# تێگەیشتن و ئیجتیهاد

# لە جیهاددا

شەهید دکتۆر عبداللە عەززام

وەرگێڕانی بەدەستکارییەوە

هەورامان گەچێنەیی

١٤٣٣ ك ٢٠١٢ ز

## پێشکەش بێت:

* بە هەموو شەهیدە بەڕێز و پایە بەرزەکانی بزووتنەوەی پارێزەری کیانی بوونی ئیسلامەتی لە کوردستان بەتایبەت (کاك ئەبوبەکر) ناسراو بە (مەلا سەلمان).

*بەو لاوە موسڵمانانەی دەیانەوێت وەك (عبدالله عزام) بیر بکەنەوە و بژین و هەروەك ئەویش بمرن.

* بە موجاهیدانی بزووتنەوەی ئیسلامیی... ئەوانەی کە هەموو بەرژەوەندییەکانی خۆیان واز لێهێناوە و بەرەو مەیدانەکانی جیهاد و تێکۆشان بەڕێ کەوتوون لە پاش کۆچ کردنیان لە خاك و وڵاتی خۆیان... وەك موجاهیدانی کەلار و کفری و گەلاڵە و هەولێر و گشت جێیەکانی دیکە.

* بەو موسڵمانانەی کە تامەزرۆ و مشتاق و تینوی ئەوەن کە لە جیهاد تێبگەن و پاشان هەموو درك و داڵێك و بەربەستێك کە لەبەردەمیاندا هەیە رایبماڵن و بەبێ سستی و دوودڵی بین بە چەکدار و پارێزەرێکی ئەم ئیسلامە.

* بەو دایك و باوکە خۆشەویستانەی کە رۆڵەکانیان لەسەر جیهاد و رۆحی بەرەنگاری پەروەردە دەکەن و رایان دەهێنن بەو هیوایەی کە لە لایەن خوای پەروەردگارەوە بە پلەی بەرزی شەهیدی شاد بن.


- ناوی کتێب : تێگەیشتن و ئیجتیهاد لە جیهاددا .
- وەرگێڕانی : هەورامان گەچێنەیی .
- هەڵەچنی : سەردار عبدالرحمن .
- دیزاینی ناوەوە : علی دیزاین .
- تیراژ : ١٠٠٠ دانە .
- ساڵی چاپ : ٢٠١٢ .
- نۆبەی چاپ : دووەم .
- ژمارەی سپاردن : لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە (١٦٥٥) ی ساڵی (٢٠١٢) ی دراوەتێ .

بسم الله الرحمن الرحیم

## پێشەكی چاپی دووەم :

إن الحمد لله نحمده و نستعينه و نستغفره و نعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا ، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له ، وأشهد أن لا الله الا الله وحده لاشريك له ، و أشهد ان محمدا عبده و رسوله .

أما بعدُ :—

زۆرن ئەو زانایانەی بە مرەكەبی قەڵەمەكانیان یاساو ڕێسای ئیسلام ، دەنوسن و بە شان و باڵی كەڵە پیاوانی ئیسلامدا هەڵدەدەن !!

بەڵام ئەو زانا و سەركردانە كەمن كەوا خوێنیان لەگەڵ مرەكەب تێكەڵ دەكەن و یاساو ڕێسای زیندوو دەنوسن و خۆشیان دەبن بە سەرمەشق بۆ نەوەی نوێ و تەفسیری ئایەتی ﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟﴾ الأحزاب: ٢٣ یان بەكردەوە پیشانی موسوڵمانان دەدەن .

د.عبدالله عەززامیش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) یەكێكە لەو زانا و سەركردە بێ وێنانەی كەوا لەگەڵ ڕوون كردنەوەی یاساكانی ئیسلام بەنوسین ، بە كردەوەش پیشانی لاوانی ئەم ئومەتەی دەدان ، وە بەردەوام بوو لە نوسین و كاركردن تاكو سەرئەنجام بەخوێنیش مێژووی تۆماركرد و خۆی و قەڵەمەكەی بوونە سەرمەشقێكی زیندوو بۆ موسوڵمانان بە گشتی و لاوان بە تایبەتی ...

عەززامی شەهید [1] (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بۆ خوا صوڵحاوانە و سەر ڕاستانە هاتە مەیدان و بەئیزنی خوا پاشان هەوڵی بێ وچانی خۆی توانی موسوڵمانان لەخەوی بێ ئاگایی بەئاگا بهێنێتەوە و ڕایان پەڕێنێ و كۆیان بكاتەوە و حارێكی تر كەڵە پیاوانی لەشكری ئیسلام دروست بكاتەوە ، توانی بە (ئیزنی خودا) تەمبێ كوفر بكات و سام و هەیبەتی موسوڵمانان لە دەرونی دوژمنانی ئیسلام و موسوڵمانان دروست بكاتەوە ...

پیاوانە شانی خستە ژێر ئەم بارە گرانە و موسوڵمانانی لەسەر تا سەری جیهانەوە كۆ كردەوە بۆ كارێكی گرنگ ، بۆ ڕزگاركردنی وولاتێكی ئیسلامی داگیر كراو پاشان مەشق و خۆ ئامادە كردن بۆ ڕزگار كردنی وولاتانی تری ئیسلام و بەرەنگار بوونەوەی دوژمنانی ئەهلی ئیسلام و تەمبێ كردنیان ، لەپاش شەهید بوونی خۆشی قوتابیەكانی سەر ڕاستانە و پیاوانە بەردەوام بوون لە بەرەنگاربوونەوەی كوفری داگیر كەر و ئەوانەی

---

[1] بەڕاستی ئێمە كەس ناوبنێین شەهید چونكە تەنها خوا دەزانێت كێ شەهیدە ، بەڵام وەك گومانێكی باش بە كوژراوی موسوڵمانان دەڵێین شەهید [illegible]

دەستیان ناوەتە بیناقاقای موسوڵمانان و بەردەوام خوێنیان دەرێژن و ئافرەتیان ئەتك دەکەن و سەروەت و سامانیان بە تالآن دەبەن .

بەتایبەت برایانی (عەرەب ئەفغان) کە شاهیدن بە سەرمانەوە کەوا جیهاد بەردەوامە (ماضٍ إلى يوم القيامة) و وەستان بۆ موسوڵمانان نییە تا بستە خاکێکی موسوڵمانان بە داگیر کراوی مابێتەوە ، تا موسوڵمانێك لە زیندانی تاغوتاندا مابێت تا کوفری جیهانی و ئەڵقە لە گوێکانی لە وولآتانی ئیسلام تەمبێ نەبێ و نەوەی نەوەکەشی بزانن کەوا موسوڵمانان پیاون و گوندەیی کوفر قبوڵ ناکەن .

پێشەوای موجاهیدین و سەرکردەی شەهید (د.عبدالله عەززام ـ رحمه الله ـ) زمان لآڵە لە پیاهەڵدانی ئەودا :

**ستظل يا عزام يذكر الفدا**
**شيخاً شهيداً رغم كل جبان**

عەززام (رحمه الله) عەقیدەیەکی پاکی کۆمەڵی سەرکەوتوو (فرقة الناجية) ی هەبوو ، جگە لەو کاریگەرییە زۆرەی (سيد قطب ـ رحمه الله ـ ) لەسەری ، خۆشی دەستێکی باڵای هەبوو لە پەروەردەکردنی نەوەی نوێدا بە بیرۆکەیەکەی جیهادی بە خزمەت کردنی دینی خوا ، دەیفەرموو : (علمني الجهاد أن الاسلام شجرةٌ لا تعيش إلا على الدماء) وە ڕاستیشی فەرمووە و بەخوێنی خۆشی ئەم داری ئیسلامەتیەی ئاودا و سەلماندی قسە و کرداری یەکێکە !!

بەڵآم داخەکەم ئوممەتی ئیسلامی لەم ڕۆژەدا پێویستی بەسەرکردەیەکی لەم جۆرە هەیە بۆ کۆکردنەوەی مسوڵمانان و ڕاپەڕاندنیان دژ بە ستەمی کافرە مل هوڕەکان ...

ئوممەتی ئیسلامی خەمخۆرێکی وەك عەززامی دەوێ کە مشورێك لە مسوڵمانان و خاك و سەروەت و سامانیان بخوات و ببێتە بەربەست لەبەردەم داگیرکاریان و پارچە پارچە کردنی وولآتانی ئیسلامی و بە هەدەردانی سەروەت و سامانی مسوڵمانان .

ئوممەتی ئیسلامی پێویستی بە سەرکردەیەکی وەك عەززامە کە هەموو ئاواتی خزمەت کردن بوو بە مسوڵمانان و جیهادیش ببوو بە خولیای مێشکی و زۆر تامەزرۆی شەهیدی بوو ، بۆیە بەهیچ جۆرێك سڵی لە مردن نەدەکردەوە و ببۆیە مەردی مەیدان و دەیشی فەرموو : (إن اقوالنا و أفعالنا ستظل جثثاً هامدةً مالم نسقها بدمائنا) .

ئەم کتێبە ناوازەی بەردەستیشتان (فقه و اجتهاد في الجهاد)ە ، کە برای بەڕێزمان (م.هەورامان گەچێنەیی) لەساڵی (١٩٩٧) دا وەری گێڕاوە ، یەکێکە لە بەرهەمەکانی (د.عبدالله عەززام ـ رحمه الله ـ) .

لەسەر پێشنیاری (م.هەورامان) و پێویستی ئەم ڕۆژە بڕیارمان دا چاپی بکەینەوە بە چاپێکی نوێ و جوان ، تا لاوانی ئەمڕۆش لێ ی بەهرەمەند بن .
بەلاَم لەدوای تایپ لە ڕێکەوتی (٢٠١٢/٤/١) دا ناردمەوە بۆ (م.هەورامان) تا پێداچونەوەیەکی بکات ، بەس بە بیانووی (سەرقاڵبونی بەنامەی ماجستێرەوە) هیچ دەستکاریەکی نەکرد ، گەر ڕۆژی (١٠ دەقیقە) ی بۆ دابنایە ئەوا هەرزوو تەواوی دەکرد ، ئیتر من ناچار لە ڕۆژی (٢٠١٢/٦/٢٩) دا ، دوای (سێ مانگ) لێم وەرگرتەوە و خۆم هەڵە چنیم کرد و چەند ووشەیەکم گۆڕی لە شوێنی خۆیدا ( وەك گاور بە جولەکە لەباسی فەلەستین و ڕەهنی زرێ پۆشەکەدا) ، چەند ووشەیەکی تریش کە واتاکەی جوانتربوو دام نا ، چەند فەرمودەیەکیش (تخریج) نەکرابوو ، برای بەڕێز (م.عبدالحسیب) بە کۆمپوتەر بۆی (تخریج) کردم لەسەر مەرجی (شێخ ئەلبانی ـ رحمە الله) بەلاَم سێ فەرمودەیان دەقە عەرەبیەکەی هەڵەبوو ( لە کتێبە وەرگێڕاوەکەوە هەروا وەرگێرابوو ) ئێمەش دەقە ڕاستەکەیمان دانا .
﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ ﴾ البقرة: ٢٨٦ ، منیش بەپێ ی توانا خۆم لەگەڵ هیلاك کرد و لەپاش (هەڵەچنی کۆمپوتەر) جارێکی تریش بەسەریدا چومەوە ، وەتەنها وەرگێردراوەکەم لابوو بۆیە ئەگەر هەر هەڵەیەکیش هەبوبێ لە وەرگێڕاندا نەمتوانیوە چاکی بکەم چونکە چاپە عەرەبیەکەم لانەبوو .
پاشان لەچەند شوێنێکدا پەراوێزم نوسیوە و ناوی خۆشم (سەردار) نوسیوە بۆ ئەوەی جیا بکرێتەوە لەگەڵ پەراوێزەکانی وەرگێڕدا .
حەزدەکەم مسوڵمانی قەڵەم بەدەست ئاگادار بکەم گەر هەرکەسێك کتێبی (عەززام) وەربگێڕێ بۆ کوردی ئامادەین چاپی بکەین بەو مەرجەی لێ ی کەم نەکاتەوە ، گەر بۆی زیاد بکات لە دووکەوانەدا () یان پەراوێزی بۆ بنوسێ ئاساییە ، وە هەرکتێبێك کە سوود مەند بێ و خزمەت بە ئیسلام و مسوڵمانان بکات ئامادەین چاپی بکەین .
خوایە ئیسلام پەیامی تۆیە و ئێمەش بۆ سەرخستنی ئیسلام هاتوینە مەیدان ، نیازمان تەنها ڕەزامەندی تۆیە و تەنها تۆشمان بەسە ، دەی پەنامان بدە و بۆ خزمەت کردنی پەیامەکەت ڕێمان پێ بگرە بەر
﴿ إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ﴾ هود: ٨٨

سەردار عبدالرحمن سعید
(پڕۆژەی باشترین هاوڕێ )
٢٤/ شعبان ـ ١٤٣٣
٢٠١٢/٧/١٤

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على رسول الأمين محمد وعلى آله وصحبه أجمعين..

دوای شەهیدبوونی دکتۆر عەبدوڵڵا عەززام (رحمه الله) لە پیشاوەری پاکستان بووم کە نووسینگەیەك دامەزرا بۆ لێکۆڵینەوە و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە جۆراوجۆرەکانی دکتۆر...

لیژنەیەکی تایبەت کە دوو خوشکەزای خۆی تێدا ئەندام بوون و بەرپرسی نەقڵ کردنی کاسێتەکانیان گرتە ئەستۆی خۆیان بۆ سەر کاغەزو ئامادەکردنیان بۆ بڵاوکردنەوە..

الحمد لله لیژنەکە بە سەرکەوتوویی تا ئێستاش کارەکانی ئەنجام دەدات..

لەسەرەتای بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکاندا بەشێوەی کتێب زۆر دڵخۆش دەبووم پێی و لە پاکستان و لە وڵاتانی تریش خەڵکم هان دەدا بۆ تەرجەمەکردنیان، بەڵام وا الحمد لله کۆمەڵێك لاوی خواویستی چووست و چالاك و سەنگەرنشینی جیهادی کوردستان رەخساوی ئەم کارەن.. یەکێکیش لەوانە (کاك هەورامان)ە کە ئەم بەشەی یەکەمی زنجیرەی سێیەمی ئەو بەرهەمانەی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی بە ناوی (في الجهاد.. فقه واجتهاد) و واش دەزانم تا رادەیەکی باش سەرکەوتوو بووە، چونکە لەو باوەڕەدام وەك چۆن نووسەرە دڵسۆزەکەی زۆر ئەم سەنگەرو ئەو سەنگەری جیهادی کردووە و لە نزیکیەوە زانیویەتی نەوەی نوێمان پێویستی بە چ ئاراستەیەك هەیە... کاکی وەرگێڕی خۆشمان بە هەمان دڵسۆزییەوە هەستی کردووە کە برا موجاهیدەکانی چەند پێویستیان بە ئاراستەی وا هەیە.. و لە عیبارەتە سەربەخۆکانی خۆیدا ئەمە سەلمێنراوە.

دڵنیام کتێبەکەی کاك هەورامان کەلێنێکی گرنگ دەگرێتەوە لە کتێبخانەی تەوژمە جیهادییەکەماندا و خوێنەرانیشی بە دڵخۆشییەوە وەریدەگرن بەتایبەتی کە هێشتا کاك هەورامان خوێندکارە و لەسەرەتای تەمەنی لاویدایە.. زۆر بە گەرمی پیرۆزبایی ئەم بەرهەمە جوانەی لێ دەکەم و سەرکەوتوو بێت...

کرێکار

هەڵەبجە ـ ١٩٩٨

# پێشەکی

**الحمد لله رب العالمين هادي الحواري والتائهين أنيس الغرباء والسالكين والصلاة والسلام على رسول الله (ﷺ) وعلى آله وأصحابه ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين.... آمين.**

**خوای پەروەردگار دەفەرموێت:** ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ﴾ **(الصف: ٩).**

**واتە: خوای پەروەردگارە کە نێرراوەکەی خۆی ناردووە بە رێگە پیشاندەرێك و بەرنامەیەکی راست و دروستەوە بۆ ئەوەی ئەو بەرنامەیە سەرکەوتوو شکۆمەند بکات بەسەر هەموو بەرنامە دەستکردەکانی دیکە لە لایەن مرۆڤەکانەوە ئەگەرچی هاوەڵ بڕیاردەرانیش پێیان ناخۆش بێت.**

**لە ژێر تیشکی بە فەڕی ئەم ئایەتەوە دەردەکەوێت کە ئیسلام بەرنامەیەکی بزووتنەوەیی جیهانییە و پەروەردگار ناردوویەتی و دەیەوێت سەرکەوێت بەسەر هەموو کۆتەرە بەرنامەکانی تردا و ببێتە یاسا لە تەواوی جیهاندا، بەڵام بەڵگەنەویستە کە هەریەکێك لەو بەرنامە دەستکردانەش تاقمێکی هەیە کە دەیەوێت بەرنامەکەی خۆی سەرکەوێت و ببێتە یاسای وڵات، جا لێرەدا خوای گەورە دەیەوێت دینەکەی خۆی سەرکەوێت، شەیتانیش وای نیازە کە خێڵەکانی خۆی سەرکەون، لێرەدا یەکسەر پێکدادانی نێوان سەربازەکانی (رەحمان) و سەربازەکانی (شەیتان) دروست دەبێت، چونکە ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت:**

﴿ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمۡ عَن دِينِكُمۡ إِنِ ٱسۡتَطَٰعُواْ ﴾ **(البقرة: ٢١٧) واتە: ئەو بێباوەڕانە بەردەوام ئێوە دەکوژن هەتاکو لە بەرنامەکەتان بگێڕنەوە و پەشیمانتان بکەنەوە ئەگەر بتوانن.**

**بۆیە ئەمڕۆش بە چاوی خۆمان دەبینین کە قوڕەیشییەکانی سەدەی بیستەم چۆن موسڵمانان ئازار دەدەن و ئاوارەیان دەکەن و دەیانکوژن. موسڵمانیش لێرەدا**

دەبێت وەك پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بیر بکاتەوە و خۆی ئامادە بکات بۆ ئەوەی ئاوی سازگاری ئیسلام بگەیەنێت بە باخچە وشك بووەکان و هەر پارچە بەردێکیش هاتە ڕێگەی ئاوەکە یەکسەر بە پاچێکی توند بیشکێنێت، دەبێت دەستنوێژ بشوات و بە دەستێك چەك و بە دەستێك قورئان هەڵگرێ بۆ ئەوەی جارێکی تریش مرۆڤەکان لە بەندایەتی بەندە دەربهێنێت بۆ بەندایەتی خوای گەورە، چونکە بەراستی چەك هەڵگرتن بۆ سەربەرزی دینی خوا بەخششێکی زۆر گەورەیە بێگومان هەر کەسێك خوای گەورە خۆشی نەوێت ڕێنموونی بۆ ناکات، ئەی موسڵمانانی بەڕێز ئەگەربێتو سەیری ژیانی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) و هاوەڵە بەڕێزەکانی بکەین دەبینین هەموو ژیانیان لە مەیدانی کۆچ کردن و جیهاددا بەسەر بردووە، دەبینین لە یەکەم ڕۆژی باوەڕهێنیانەوە یەکسەر شانیان خستووەتە ژێر ناڕەحەتی و کۆچ کردنەوە... لە پێناوی سەرکەوتنی ئیسلامدا وازیان لە هەموو بەرژەوەندییەکانی تر هێناوە، ئەو هاوەڵە بەڕێزانە بە تێکڕا شەیدای شەهیدی و جیهاد بوون لە ڕێگەی خوای پەروەردگاردا، بەهەمان شێوەش تابیعییەکان و زانا بەڕێزەکانی ئیسلام تامەزرۆی ڕێگەی جیهادبوون و هەموو ئاواتێکیان شەهیدی بووە لە ڕێگەی خوادا.... جا یەکێك لەو زانا بەڕێزانەی سەدەی بیستەم کە ڕێگەی جیهادی گرتبووە بەرو لەرزەی بە کافران هێنابوو شێخ عبدالله عزام بوو بە هەزاران سەلامی خوای پەروەردگاری لێ بێت... بەراستی دەتوانم بڵێك جیهاد بوو بووە خولیای دڵ و مێشکی عبدالله عزام...

بە کورتی دەڵێم: عبدالله عزام یەکێك بوو لەو پیاوانەی کە خوای گەورە کردی بە هۆکارێك بۆ سەربەرزی دینەکەی خۆی لە سەدەی بیستەمدا.

جا بۆیە منیش بە پشتیوانی خوای گەورە و بۆ ڕەزامەندی پەروەردگار شانم دایە ژێر ئەم خێرە گەورەیە و دەستم کرد بە وەرگێڕانی ئەم نووسراوەی شێخ عبدالله عزام بۆ زمانی کوردی بەو هیوایەی کە ببێتە هۆی تێگەیشتنی نەونەمامەکانی ئیسلام لە جیهاد و تێکۆشان لە ئیسلامدا، داواکارم لە گشت خوێنەرێکی بەڕێزی

ئەم پەڕاوە کە بێبەشم نەکات لە دوعای خێر بۆ سڕینەوەی تاوانەکانی رابردووم و شادبوونمان بە فیردەوسی نەبڕاوەو لەگەڵ شەهیدەکانی ئیسلامدا کۆمان بکاتەوە . إن شاء الله ..

تێبینی:

* هەر عیبارەتێك لە نێوان ئەم دوو کەوانەدایە [ ] و بەخەتێکی جیا نووسینەکە نووسراوە ئەوە وتەی وەرگێڕن.

* ئەم نووسراوەی لەم کتێبەدایە لە کاسێتەوە نقڵ کراوە، بۆیە ڕەنگە داڕشتنەکەی وەك پێویست نەبێت و گەلێ بابەتیش دووبارە بوونەتەوە، کە لەڕاستییدا بەهەموویانەوە تەواوکەری یەکترن و بابەتەکان لەچەند کات و شوێنێکی جیاوازدا بەشێوەی وتار و موحازەرە دراون.

هەورامان گەچێنەیی

١٩٩٧/٤/٢٩

## چەند تیشکێك لەسەر جیهاد

**سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار، سەلام و ستایش بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) و بۆ سەر هاوەڵە بەڕێزەکانی هەتا ڕۆژی دوایی، خوایەگیان هیچ ئیشێك ئاسان نییە ئەگەر تۆ ئاسانی نەکەیت و ئەگەر تۆ بتەوێ خەفەت و ناڕەحەتی ئاسان دەکەیت.**

**جیهاد فەرزی عەینە (فرض العین) لە گەورەترین فەرزەکانە.**

**ئێمە چەندین جار وتوومانە (جیهاد) تێکۆشان گەورەترین بەندایەتی و پەرستشە بۆ خوای گەورە، ئەگەر جیهاد فەرزی کیفایەش بوو (فرض الکفایە)[1] ئەوە لە لە فەرزە کیفایەکاندا لە جیهاد گەورەتر دەست ناکەوێت، واتە گەورەترین فەرز لە فەرزە کیفایەکاندا بریتییە لە جیهاد، بەڵام کە جیهاد بوو بە فەرزی عەین (فرض العین)[2] بە هەمان شێوە لە پێش هەموو فەرزە عەینەکاندایە جگە لە نوێژ، پێشکەوتنی نوێژیش لە جیهاد بەم شێوەیە لەسەر بۆچوونی زانایان.[3] هێزی بێ باوەڕی و خراپە هێرشی کردە سەر موسڵمانان ئەوە لەوکاتەدا هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان (جیهاد کردن و نوێژکردن) وەکو (ابن تیمیە) - رەحمەتی خوای لێ بێت - دەفەرموێت: (العدو الصائل الذي یفسد الدین والدنیا لیس أوجب بعد الإیمان من دفعه، أولا الإیمان لا إله إلا الله، محمد رسول الله (ﷺ)، ثم دفع الصائل). واتە: ئەو دوژمنەی کە هێرش دێنێ بۆ موسڵمانان کە دەیەوێ بیروباوەڕو ژیانی موسڵمانان تێك بدات ئەوە لە دوای ئیمان هێنان هیچ شتێکی تر واجب نییە لە**

---

[1] واتە: کۆمەڵێك موسڵمان ئەنجامیان دا لەسەر باقی تر دەکەوێت.

[2] واتە: لەسەر یەکە یەکەی موسڵمانان فەرزە، بە ئەنجامدانی کۆمەڵێك لەسەر باقی تر ناکەوێت.

[3] أ- ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و شوێنکەوتووانی دەڵێن: نوێژ لە پێش جیهادە، چونکە لە نوێژنەکردنی کەسێك بە کافری دەزانن و بەوە لە ئیسلام دەچێتە دەرەوە، بەڵام وازهێنان لە جیهاد لە ئیسلام ناچێتە دەرەوە. ب - ئیمامی شافیعی و مالیك و ئەبوحەنیفە دەڵێن: ئەگەر داوای دەرچوون بە گشتی کرا لە موسڵمان دەبێ دەرچن، داواکردنەکەش لەلایەن ئیمامی موسڵمانانەوە بوو.

**بەرامبەر وەستانی ئەو دوژمنە و دەرکردنی، یەکەم باوەڕهێنان بەوەی کە هیچ پەرستراوێکی تر نییە جگە لە خوای گەورە کە شایەنی پەرستن بێت، موحەممەد پێغەمبەر و نێردراوو پەیام هێنەری خوایە ﷺ، دووەم دەرکردنی ئەو دوژمنەی کە هێرشی هێناوە.**

[بەڵێ برای خۆم ئەمە بیروبۆچوونی ئەو کەڵە پیاوانەی ئیسلامە، ئەمە بیروبۆچوونی جوانی قورئانیی ئەو زانا لەخوا ترسانەیە، ئەمە بۆچوونی ئەوانەیە کە شەووڕۆژیان دایە دەم یەك بۆ شارەزابوون لە "قورئان و سوننەت" ... ئەمە هەڵوێستی ئیمام ئەحمەدی خۆشەویستی پایەبەرزە کە ملیۆنێك (١,٠٠٠,٠٠٠) فەرموودەی پێغەمبەری ﷺ لەبەربوو، ئەمە هەڵوێستی ئیبن تەیمیەی ئازیزە کە (الحافظ أبو الحجاج المزي) لەبارەیەوە دەفەرموێ: "ما رأيت مثله ولا رأى هو مثل نفسه، وما رأيت أحداً أعلم بكتاب الله وسنة رسوله ﷺ ولا أتبع لهما منه". واتە: نموونەی وەك ئیبن تەیمیەم نەدیووەو خۆیشی نموونەی خۆی نەبینیوە و کەسم نەبینیوە وەك ئەو زاناتر بێت لە قورئان و سوننەت و شوێنکەوتووتر بێت بۆ قورئان و سوننەت].

**بەڵێ ئەگەر جیهاد بوو بە فەرزی عەین[1] پێشی نوێژ و ڕۆژوو و حەجیش دەخرێت، بۆ ئەمیش بەڵگەمان لە هەڵوێستی پێغەمبەردا ﷺ هەیە:**

**١ـ جیهادکردن بوو بە فەرزی عەین بە هیچ شێوەیەك دواناخرێت، بەڵام ڕۆژوو لە مانگی ڕەمەزاندا بەهۆی جیهادەوە شکاندنی جائیزە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژووی شکاند لە کاتی "فەتحی مەککە"دا کە دەرچوون گەیشتنە شوێنێك کە پێی دەڵێن "كراع العميم"، پێغەمبەر ﷺ خۆی لە بەردەم خەڵکەکەدا ئاوی خواردەوە لەناو قاپێکدا، کاتەکەیشی دوای نوێژی عەسر بوو، فەرمووی: "إنكم مصبحوا عدوكم الفطر أقوى لكم، وبلغه أن بعض الصحابة لم يفطروا فقال: أولئك العصاة.. أولئك العصاة". رواه مسلم. واتە: ئێوە ئەگەن بە دوژمنتان ڕۆژوو شکاندن**

---

[1] لە شوێنەکانی تری ئەم کتێبەدا باسی دەکەین کە لە کوێدا دەبێتە فەرزی عەین ـ إن شاء الله ـ.

بەهێزترە بۆتان، وە پێی گەیشت کە کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانی نەیانشکاندووە، فەرمووی: ئەوانە لایان دا... ئەوانە لایان دا.[1]

گومانی تێدا نییە ئەگەر جیهاد کردن و ڕۆژووگرتن بەرامبەری یەك بوونەوە بەجۆرێك ئەگەر یەکێکیان ئەنجام بدەی ئەویترت بۆ نەکرێت ئەوە جیهادەکە پێش دەخەیت ئەمەش بۆچوونی کۆی زانایانە واتە (بإتفاق الأمة).

٢ـ زانایانی ئیسلام هەموویان باوەڕیان وایە ئەگەر جیهاد بوو بە فەرزی عەین ئەوە پێش حەج دەخرێت، واتە: بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام جیهادکردنەکە پێش حەج کردنەکە دەکەوێت بەجۆرێك کە هیچ زانایەکی بەڕێز بە پێچەوانەی ئەم هەڵوێستە نییە.

کەواتە جیهاد کردن پێش ڕۆژوو دەکەوێت، پێش حەج و نوێژیش دەکەوێت، چونکە ئەگەر تۆ بتەوێ بچی بۆ شەڕو کاتی نیوەڕۆ بوو دوای ئەخەی بۆ عەسر یا نوێژی عەسر لەگەڵ نیوەڕۆ دەکەی.

بەڵێ برای خۆم نوێژەکان کۆ دەبێتەوە لەبەر جیهاد، ئەمەش لات غەریب نەبێت تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عەسری فەوتاند لە ڕۆژی خەندەقداو فەرمووی: "ملأ الله قبورهم وبيوتهم نارا شغلونا عن صلاة الوسطى ـ صلاة العصر) رواه مسلم. واتە: خوا گۆڕو ماڵیان ئاگر تێبەردا خەریکییان کردین و نەیانهێشت بپەرژێینە سەر نوێژی عەسر.

کەواتە جیهاد کە بوو بە فەرزی عەین پێش هەموو فەرزەکانی تر دەکەوێت لەکاتێکدا ئەگەر یەکیان ئەنجام بدەی ئەویتریان بفەوتێ ئەوا جیهادەکە ئەنجام دەدرێ و پێش دەخرێت.

---

[1] تەنها بەهۆی چەند عوزرێك شەرعییەوە نەبێت ئەوانیش باس دەکەین ئەویش تاکە تاکەی موسڵمانان نەك وەك کۆمەڵ.

[بەڵێ برای خۆشەویستم دە تۆش وەرە مەیدان، دە تۆش وەك "حەمزە و عەلی و عومەر و موصعەب و تەڵحە"، وەرە بەرەو مەنزڵگای موجاهیدانی ئیسلام بەڕێ کەوە، دە تۆش وەك شێری ناو بێشە خۆت بخەرە ناو کورەی ئاگرەوە و چەك و تاقمەکەت هەڵگرە و فیشەك بخەرە بەرکار و چاوەکانت بە وردی لە نیشانەی تفەنگ و پەنجە لەسەر ماشەکەی دابنێ بە کەللەی بۆگەنی بەچکە کافرەکانیەوە بنێ و مێشکیان تێکەڵ بە خوێن و گۆشت و خاك بکە.... ئەی موسڵمانی ئازیز ئەمە هەڵوێستی کۆی زانایانی ئیسلامە، هەرکەسێکیش ئەمەی بە دڵ نییە و بە لایەوە چاك نییە با بڕوات مجادلە لەگەڵ بۆچوونەکانی ئیمامی بەڕێزو خۆشەویستمان ئیمام شافیعی بکات بۆ وەڵامی].

## چۆن جیهاد دەبێتە فەرزی عەین؟

ئێستا ئەوە ماوە کە پرسیار بکەین، ئایا ئەو حاڵەتەی ئێستا ئێمە لە ناویدداین لە ئەفغانستان و فەلەستین و فلیپین [و کوردستان]... لەهەر پارچە زەویەکی تردا کە موسڵمانان تێیدا دەژین ئەبێتە فەرزی عەین؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەندەی من سەیری پەڕاوەکانی تەفسیر و حەدیس و فیقهم کردبێت لەو کاتەوە کە نووسینەوەی هەرسێکی دەستی پێکردبێت، واتە: "تەفسیر و حەدیس و فیقه" هەر لە سەرەتاوە تاکو ئەمڕۆ باسی ئەوەیان کردووە کە جیهاد دەبێتە فەرزی عەین لە چەند کاتێکدا، یەکێك لەو کاتانە ئەوەیە ئەگەر: هێزی کوفر هاتنە ناو خاکی ئیسلام ئەوە جیهاد دەبێتە فەرزی عەین وەك نوێژو ڕۆژوو. جوولەکە بنکەی ئیسلام و شاری پیرۆزی قیبلەی یەکەمی موسڵمانانیان داگیر کردووە، سەرەڕای داگیرکردنی ئەو ناوچە و وڵات و شارانەی تری ئیسلام، کەواتە جیهاد کردن فەرزی عەینە لەسەر یەکە یەکەی موسڵمانان. رووسیا خاکی ئەفغانی داگیرکردووە، [نە لە کوردستان] نە لە هیچ پارچە زەویەکی خاکی ئیسلام نابینین کە بەرنامەی خوای گەورە تێیدا فەرمانڕەوا بێت، ئایا جیهاد نابێتە فەرزی عەین؟! کەواتە ئێستا جیهاد لە ئەفغانستان فەرزی عەینە، بەڵکو جیهاد بوو بە فەرزی عەین لەوکاتەوە کە رووس هاتە ناو ئەفغانستان، بەڵکو جیهاد هەر لەو کاتەوە فەرزی عەین بووە کە (نصاری) ئەندەلوسی لە موسڵمانان سەندەوە و داگیری کرد، ئەو حوکمە لەو ڕۆژەوە هەتا ئەمڕۆ نەگۆڕاوە و وەکو یەك وایە.

جیهاد فەرزی عەین بووە لە ساڵی ١٤٩٢ز بەردەوامیش ئەبێت هەتاوەکو پارچە زەویەکی خاکی ئیسلام کە ڕۆژێك موسڵمانان فەرمانڕەواییان تێدا کردبێت بگەڕێتەوە ژێر فەرمانڕەوایی ئیسلام و ژێر چنگی موسڵمانان. ئەی برای ئامادەی موجاهید: وا گومان نەبەیت ئەگەر ساڵێك لە ئەفغانستان یان دوو ساڵ یان سێ ساڵ یان پێنج ساڵ جیهاد بکەیت ئیتر فەرزییەتی جیهادت لە کۆڵ کەوتووە، دوای ئەفغانستان ڕاپەڕە بۆ فەلەستین، ئەگەر توانای شەڕ کردنت هەبوو، هەتاوەکو وزەت

**تێدا بێت دەبێت بڕۆی، بڕۆ بۆ بوخارا بۆ فلیپین....** [تۆی موسڵمان نابێت بیر لە دانیشتن و قاچ ڕاخستن بکەیتەوە لەهەر پارچە زەوییەکدا کە بتوانی چەکی تێدا هەڵگری جیهاد فەرزی عەینە، قەت لێت جودا نابێتەوە، تۆی موسڵمان دەبێ بیر لەوە بکەیتەوە کە گەلان لە تاریکی بێ باوەڕیی و ئابڕوویی دەربهێنی و ڕۆشنایی ئیسلامی خۆشەویستیان پێ بناسێنی، ئەی برای خۆشەویستم خۆ ئەم ئیسلامە پیرۆزە ئەگەر بە خوێنڕژان نەبوایە بەی ئێمە نەدەگەیشت و پاك نەدەبوویەوە، چاکترین بەڵگەش ئەوەیە کە شوێنی لاشەکانیان لە دەشتەکانی ئەفغانستان و ئێران و تورکیا و کوردستاندا دەبینرێ "واتە لاشەی یارەکانی موحەممەد ﷺ"] **تۆش ئەم فەرزە خواییەت لەسەر ناکەوێت هەتاوەکو دەمریت، هەروەکو نوێژ وایە هیچ جیاوازییەکی نییە، هەروەك چۆن نوێژکردن لەسەر مرۆڤ ناکەوێت مەگەر بە مردن، یان نەخۆشی یان کوێری یان شەلی هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا﴾ **النساء: ٩٨ واتە: تەنها ئەو پیاوە پیرو ژنو مندالانە نەبێت کە ناتوانن بە فێڵ لە چنگی موشریکەکان ڕا بکەن، یان ئەگەر ڕاش بکەن ڕێگەی کۆچ کردن نازانن، ئەوانە عوزریی شەرعییان هەیە** [ ﴿فَأُولَٰئِكَ عَسَى اللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ﴾ النساء: ٩٩ واتە: ئومێد هەیە کە ئەوانە خوای گەورە لێیان ببورێ]. **کەواتە بێجگە لە کوێر و شەل و نەخۆش نەبێت جیهادت لەسەر ناکەوێت هەتاوەکو دەمریت.**

## مۆڵەت وەرگرتن بۆ جیهاد

کەواتە جیهاد کردن بوو بە فەرزی عەین، ئێستا کە فەرزی عەینە وەك نوێژەکانی لێ دێ هەروەك (فقهاء) دەفەرموون: ئەگەر هێزی بێ باوەڕی زەوی موسڵمانانی داگیر کرد ئەوە جیهاد دەبێتە فەرزی عەین وەك نوێژ و رۆژوو و ناتوانرێ وازی لێبهێنرێت.

لەوکاتەدا پێویستیش بە ئیزن وەرگرتن ناکات، ئیزن نە لە دایك و باوکت وەرگرە و نە لە ئەمیرەکانت، نە لە مامۆستاکەت، نە لە بەخێوکەرت، نە لە خێزانەکەت، نە لە خاوەن قەرزەکەت، لە هیچ کەسێك داوای ئیزن وەرگرتن مەکەو بکەوەرە ڕێ بەرەو جێگای پیرۆزی بارەگای موجاهیدان و پێشمەرگەکانی ئیسلام ملی رێ بگرە. ئایا ئەی برای بەڕێزم تۆ داوای ئیزن لە دایكو باوکت دەکەی بۆ ئەنجامدانی نوێژی نیوەڕۆ یان نوێژی عەسر؟؟!!

ئەگەر پێیان وتی: کوڕم مەچۆ بۆ مزگەوت، چونکە موخابەراتی شیوعی و بەعسیی بەسەرتەوەن دەترسی بت کوژن رۆڵە نوێژەکە مەکە. ئایا "جائیزە" رەوایە فەرمانی خوای گەورە واز لێ بهێنرێت بۆ فەرمانی دایك و باوك؟ [بەڵێ راستە دایكو باوك دڵیان بۆ جگەرگۆشەکەیان دەسووتێ و دەترسن لەوەی کە کوڕە شیرینەکەیان زیندانی بکرێ یان بکوژرێ!]. بەڵام ئایا جائیزە کە فەرمانی خوای گەورە تەرك بکرێت و کاری پێ نەکرێت؟ [نەخێر ئەی موسڵمانی بەڕێز هەرگیز بۆت نییە وازو لە فەرمانی خوای گەورە بێنی]. کێیە دەڵێت فەرمانی دروستکراو دەخرێتە پێش فەرمانی دروست کەرەوە؟ لە سەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (إنما الطاعة في المعروف) واتە: گوێڕایەڵی لە چاکەدا دەکرێت، لە فەرموودەیەکی تری سەحیحدا هاتووە کە ئیمامی موسلیم ریوایبەتی کردووە پێغەمبەر ﷺ

**ئەفەرموێت: (لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق) واتە: گوێڕایەڵی نییە بۆ دروستکراو لەسەرپێچی دروستکەردا.[١]**

**ئیبن روشد زانایەکی مالیکییە دەفەرموێت: (وطاعة الإمام واجب ولو كان غير عدل ـ ولو كان فاسقا ـ إلا إذا أمر بمعصية ومن المعصية منعه الجهاد الستعين) واتە: گوێڕایەڵی بۆ ئیمام فەرزە ئەگەرچی ئەو ئیمامە دادپەروەریش نەبێت یان لادەر بێت تەنها ئەگەر فەرمانی کرد بە تاوان ـ واتە ئیشێك کە خوای گەورە پێی ناخۆش بێت ـ ئەوە بە گوێی ناکرێت، جا بەشێك لەو تاوانانە ئەوەیە کە ئەگەر ئیمامەکە ڕێگەی جیهادی لێ بگرێت، لەکاتێکدا کە فەرزی عەین بێت،** ﴿بەڵام کۆمەڵێك لەو کەسانەی کە دڵیان نەخۆشە لەوانەی کە حەز ناکەن ڕۆژێك لە ڕۆژان جیهاد بکەن و جیهادیان لە مێشکی خۆیان سڕیوەتەوە و دەشیانەوێ لە مێشکی موجاهیدەکانیشی بسڕنەوە دێن بۆ گومان دروست کردن﴾ **ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ دێنن دەیکەن بە بەڵگە بۆ فەرزبوونی ئیزن وەرگرتن لە دایك و باوك، فەرموودەکە ئیمام بوخاری دەیگێڕێتەوە کە ئەمەش بەشێکی فەرموودەکەیە: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: (إن لي أبوين وأردت الجهاد قال ففيهما فجاهد)، واتە: من دایكو باوکم هەیە دەشمەوێ جیهاد بکەم، فەرمووی: بڕۆ جیهادی دایكو باوکت بکە. واتە خۆت لەگەڵ ئەوان ماندوو بکەو خزمەتیان بکە. بەڵێ ئەم فەرموودەیە ڕاستە، بەڵام ئەمە لە کاتی فەرزی کیفایەدا بووە، چونکە ڕۆژانی شەڕکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێ لە شەڕەکانی سوننەت بوون، هەندێکیان فەرزی کیفایە بووە، نازانین لە زەمانی پێغەمبەردا ﷺ شەڕێك جیهادی تێدا بووبێت بە فەرزی عەین تەنها لە (خەندەق و تەبووك)دا نەبێت، تەبووك چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کرد کە هەموو موسڵمانان دەرچن بۆ شەڕ بە گشتی و خەندەقیش چونکە مەدینە چواردەوری گیرابوو لە لایەن بێباوەڕەکانەوە هەتا لە کاتی "فەتحی مەککە"دا لە ساڵی**

[١] سەیری کتێبی جامع الصغیر، رقم: ٧٥٢٠ بکە.

**هەشتەمی کۆچیدا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی نەکرد کە موسڵمانان بە گشتی دەرچن. ئەگەر فەرمانی بکردایە بە گشتی دەربچن ئەوە دەبوویە فەرزی عەین.**

**لەپاش ئەمانە هەموو ئەی برای بەڕێزم:**

**جیهاد کردن ڕێك نەخرا واتە "حوکمی جیهاد" بە گشتی "قطعی" و بە یەکجاری و سەربەخۆ نەبوو تەنها لە دوای شەڕی تەبووك نەبێ کە حوکمی جیهاد سەربەخۆ بوو، لە دوای دابەزینی سورەتی (التوبه)[1] ئایەتی شمشێر دابەزی ئایەتەکانی تری (نەسخ)[2] کردەوە وەك واتە: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ ﴾ (النحل: ١٢٥) واتە: بانگەواز بکە بۆ ڕێگەی پەروەردگارت بە حیکمەت و لێزانی و ئامۆژگاری باش، یان ﴿ فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ ﴾ (الحجر: ٨٥) واتە لێیان ببورە و وازیان لێ بێنە بە لێبوردنێکی زۆر جوان. لەسەر ئەم ئایەتانە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵەکانی پەروەردە کرد کە بە هیچ شێوەیەك هێرش نەکەنە سەر بێباوەڕەکان و لێیان تووڕە نەبن و کوشتاریان لەگەڵدا نەکەن، ئەگەرچی ئەوانە "واتە بێ باوەڕەکان" موسڵمانان تووشی ناسۆری بکەن، بەڵام کاتێك ئایەتی شمشێر و شەڕ دابەزی ئایەتەکانی تری سڕییەوە واتە "نەسخی" کردەوە ئایەتی شمشێریش**

---

[1] مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە پێش شەڕی تەبووك و دابەزینی سورەتی تەوبە هێشتا حوکمی ئەو ئایەتانە مابوو کە تیایاندا وازهێنان و لێخۆشبوون بۆ بێباوەڕان دەردەبڕێت، دەفەرموێت: ﴿ لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ﴾ (الکافرون: ٦)، یان ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمۡ كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ (النساء: ٧٧)، بەڵام دوای دابەزینی سورەتی توبە ئەم ئایەتانە نەسخ بوونەوە و حوکمەکەیان نەماوە بە جۆرێك داوای کرد لە موسڵمانان کە هێرش بەرنە سەر کافرەکان . والله أعلم.

[2] نەسخ بریتییە لە سڕینەوەی حوکمێکی شەرعی بە هۆی دابەزینی قورئان یان فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە حوکمە شەرعییەکەی یەکەمجار پێش دابەزینی قورئان یان حەدیسی پێغەمبەر ﷺ کاری پێ کرابێت. بەڵام دوای دابەزینی گۆڕانکاری بەسەردا هاتبێ، نموونە: موسڵمانان یەکەمجار ڕوویان لە (بیت المقدس) دەکرد بۆ نوێژەکان، بەڵام ئەمە نەسخ بوویەوە و گۆڕا بۆ (مسجد الحرام) پاش دابەزینی ئەم ئایەتە: ﴿ فَوَلِّ وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ ﴾ (البقرة: ١٤٤).

ئەمەیـــە: ﴿ فَإِذَا انسَلَخَ الْأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ ۚ ﴾ (التوبة: ٥) واتـە: جا کاتێك ئەو مانگانـەی کـە شـەڕ تێیدا حەرامە رابوردن، ئـەوە موشـریکەکان بکـوژن لـە هـەر شـوێنێك دەسـتتان بکـەون، بیـان گـرن بـە دیـل و چواردەوریان بگرن مەیەڵن بێنە ناو "مسجد الحرام"ەوە، بۆیـان دانیشن لـە هـەموو رێگەیەکـەوە کـە شـوێنی گومـانی گـرتن و کوشـتنیان بێـت، چـونکە خـوای گـەورە ئـــەوەبوو فـــەرمووی: ﴿ فَسِيحُوا فِي الْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ ﴾ (التوبـــة: ٢) واتـــە: ئـــەی موشریکەکان بگەڕێن بە هێمنی و ئاسایش بەسەر زەویدا چوار مانگ. بەجۆرێك لەو چوار مانگەدا دەستدرێژییان بۆ نەکرا، بەڵام لـە ئایـەتی شمشێردا دەفـەرموێت ئـەو چوار مانگە رابوردن تەواوبوون ئەوە بیانکوژن، بەڵێ شمشێر هەر بمێنێ لە گەردنی بێ باوەڕاندا ئیشی خۆی هەر بکات هەتاوەکو دێنە ناو دینی خوا و موسڵمان دەبن ﴿ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ [خـــوای بـــاڵا دەســـت و کـــارگێڕی ئاسمانـــەکان لەسـەرووی حـەوت ئاسمـان و لەسـەر عەرشـی خـۆی بەرنامـەی دانـاوە بـۆ موسـڵمانان و ئاگاداریان دەکات] و دەفەرموێت: ﴿ وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً ۚ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ ﴾ التوبة: ٣٦، واتە: بکوژن و جەنگ بکەن لەگەڵ موشـریکەکاندا بـە گـشتی وەك چـۆن ئـەوان شـەڕو کوشـتار لەگـەڵ ئێـوە دەکـەن بـە گشتی و بشزانن بـە راسـتی خـوای گـەورە لەگـەڵ لەخواترسـەکاندایە، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ ۚ فَإِنِ انتَهَوْا فَإِنَّ اللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ الأنفـال: ٣٩ واتـە: شـەڕیان لەگەڵـدا بکـەن و بیـانکوژن هەتاکو شیرك نەمێنێ و یاسا و فەرمان هەمووی تەنها بۆ خوا بێت.

[بەڵێ ئەی برای موسڵمان ئـەوەش ئاگاداربـە خـوای گـەورە نـەهێڵان و لـەونابردنی فیتنـە و خراپەی بەستووە بە کردنی شەڕەوە و دەفەرموێت: شەڕیان لەگەڵ بکـەن هـەتاوەکو فیتنـە

بڵاونەبێتەوە، بەڵام زۆر بە داخەوە ئەمڕۆ خەڵکی لێیان شێواوە و پێچەوانەی دەکەنەوە و دەڵێن: کورە شەڕ مەکەن تا فیتنە بڵاونەبێتەوە، کورە هەی هاوار ئەمە پێچەوانەی فەرمانی خوای گەورەیە بەڵێ جیهادو شەڕکردن نەبێت چۆن فەرمان کردن بە چاکە و بەرهەڵستی کردن لە خراپە دەکرێت، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی نەیدەتوانی رۆژێك لە رۆژان لە مەککەدا بت بشکێنێ؟ بەڵام لە شەڕی بەدردا کەللەی ئەبوجەهل هاتە بەردەستی و لە فەتحی مەککەدا دە هەزار پێشمەرگەی شمشێر لە دەستی لەگەڵ بوو سێ سەدو شەست بتی کراو بە خوای ناو مەککەی رماند، ئەگەر جیهاد نەبوایە ئەمەی دەکرد؟ خۆ خوای گەورە ئەیتوانی بەبێ شەڕیش سەریان بخات، بەڵام خۆ ئەم دینە سیحری نییە] ئایەتی شمشێر ﴿ فَإِذَا انسَلَخَ الْأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ ﴾ و ئایەتی ﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً ﴾ لای دابەزینی ئایەتی شمشێردا ئەم ئایەتانە خەڵکی سەر زەوی کرد بە سێ بەشەوە وەك چۆن (ابن القيم) دەفەرموێ:

١. موسڵمانی ئەمین.

٢. پەیمان لەگەڵ خوا کردوو.

٣. بێ باوەڕی ترسنۆك، واتە باوەڕهێنان یان جزیە دان ، یان ئەگەر (جزیە)[1] نەدەن دەکوژرێن.

لەبەرئەوەی لەو رۆژەوەی ئەم ئایەتانە دابەزین هەتاوەکو ئەمڕۆ موسڵمان سێ شتی پێشنیار کردووە بۆ کوفر:

موسڵمان بوون، یان جزیەدان، یان دەکوژرێن.

---

[1] جزیە بریتییە لە بڕێك پارەی دیاریی کراو لەو موشریك و بێباوەڕانە وەردەگیرێت کە موسڵمان نابن و لەناو دەسەڵاتی ئیسلامییدا دەمێننەوە، بۆ پاراستنی ماڵ و نامووس و گیان و پاراستنی مافەکانیان.

## قۆناغەكانی شەرعیەتی جیهاد

**لە دوای دابەزینی ئایەتی شمشێر ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز یاسایەكی نەگۆڕیان دانا بۆ جیهاد لە ئیسلامدا، چونكە یاسای جیهاد واتە (حوكمی جیهاد) لە رۆژگاری ئیسلامدا بە چوار پلەو قۆناغدا تێپەڕی كە ئەمانەی لای خوارەوەن:**

**قۆناغی یەكەم:** وەك (ابن القیم) دەفەرموێ: لە مەككەدا جیهادكردن قەدەغە بوو بەرامبەر ئازار و ستەمی بێ باوەڕان. [هەرچەندە هاوڕێ و هاوەڵەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژێر ئازار و ناڕەحەتیدا ئەتلانەوە، هەرچەندە پشكۆیان بۆ گەرم دەكردن و بە پشتدا دەیان خستنە سەر پشكۆكە، هەرچەندە لە بیابانی گەرمدا لە مەككە لە رۆژی گەرمی هاویندا بەردی گەورەو گەرمیان دەخستە سەر سك و سنگیان، هەرچەندە ئەبوبەكری دڵ نەرم لە ژێر پێڵاوی جەندرمەكاندا ئەبووریایەوە!! بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا جیهادكردن قەدەغە بوو]، **چونكە پەروەردگار دەفەرموێت:** ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوا أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ﴾ (النساء: ٧٧) **ئەمە پرسیارە، واتە: ئایا ئەی سەرت سووڕنامێنێ لە گەلێك كە داوایان كرد شەڕیان لەسەر فەرز بێت كە لە مەككەدا دابوون، بەڵام پێیان وترا واز لە شەڕ بهێنن كاتی نەهاتووە و خۆتان ئامادە بكەن بە بەجێهێنانی نوێژ؟**[1]

[(ابن الكثیر) لە تەفسیرەكەیدا ئەفەرموێ: ئیبن عەباس (خوایان لێ رازی بێ) دەفەرموێ: عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف لەگەڵ چەند هاوەڵێكیدا هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئای چەند بە عیزەت بووین كاتێك كە موشریكیش بووین، بەڵام كە باوەڕمان هێنا زەلیل بووین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إني امرت بالعفو فلا تقاتلوا)[2] واتە: من فەرمان پێ كراوە بە لێبوردەیی و لێخۆشبوون، شەڕ لەگەڵ ئەم گەلەدا مەكەن].

**قۆناغی دووەم: ئیزنیان پێ درا بە جیهاد كردن، ئەمەش لە سەرەتای كۆچ كردندا بوو، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى

---

[1] صفوة التفاسیر، م١، ص١٢٩.

[2] رواه ابن أبي حاتم وأبوداود والنسائي ٣٠٨٦. قال الالباني صحیح الاسناد.

نَصۡرِهِمۡ لَقَدِيرٌ ﴾ (الحج: ٣٩) [موجاهید دەفەرموێت: ئەمە یەکەم ئایەت بوو کە دابەزی لەسەر جیهاد].(١)

**قۆناغی سێیەم: جیهاد کردن فەرزبوو، بەڵام ئەگەر کافرەکان هێرشیان بۆ کردن،** [واتە نابێ موسڵمانان دەستپێشخەری بکەن بۆ شەڕ هەتا دەستیان بۆ درێژ نەکرێت]، **وەك خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴾ (البقرة: ١٩٠) **واتە: بکوژن و شەڕ بکەن لە ڕێگەی خوادا بۆ بەرزکردنەوە ئایینی خوا ئەوانەی کە شەڕو کوشتارتان لەگەڵ ئەکەن و دەستدرێژیش مەکەن، بەجۆرێك ئێوە دەستپێشخەری شەڕ مەبن، چونکە بەراستی خوای گەورە دەستدرێژیکەرانی خۆش ناوێت.**(٢) [ابن کثیر ئەفەرموێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شەڕی دەکرد لەگەڵ ئەو کەسانەی کە شەڕیان لەگەڵ دەکرد و وازی دەهێنا لەوانەی وازیان لێ هێنابوو لەبەر دابەزینی ئەو ئایەتەی پێشەوە].(٣)

**قۆناغی چوارەم: بە گشتی جیهاد بوو بە فەرزی سەرشانی موسڵمانان بەرامبەر هەموو کافرێك، دەبێ موسڵمانان هێرش بەرن بۆ بێباوەڕان، ئەمەش بە دابەزینی ئەم ئایەتە بوو کە زانایان پێی دەڵێن: ئایەتی شمشێر**

﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلۡأَشۡهُرُ ٱلۡحُرُمُ فَٱقۡتُلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ ﴾ ، ﴿ وَقَٰتِلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ كَآفَّةٗ كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمۡ كَآفَّةٗۚ ﴾.

**بەڵێ ئەمە چوار پلە و قۆناغ بوو کە جیهادی ئیسلامی پێدا تێپەڕی. لە پلەی چوارەمدا جیهاد بوو بە فەرز بەرامبەر هەموو بێباوەڕان لەسەر زەویدا، بەردەوام نابێ بوەستێنرێ هەتاوەکو خەڵکی سەرزەوی موسڵمان بن، یان جزیە بدەن، بەهیچ**

---

١ مختصر تفسير ابن كثير. م١، ص٤٥٦.

٢ صفوة التفاسير، م١، ص١٢٦.

٣ مختصر تفسير ابن كثير، م١، ص٤١٤.

**شێوەیەك دروست نییە ئەمیری موسڵمانان واز لە جیهاد بێنێ، بەڵکو دەبێت ئەو کاروانە بەردەوام بێت هەتاوەکو هەر پارچە زەوییەك رۆژێك لە رۆژان موسڵمانان فەرمانڕەواییان تێدا کردبێت بگەڕێتەوە ژێردەستی موسڵمانەکان ئەگەر ئەو پارچە زەویە گەڕایەوە ژێر دەستی موسڵمانەکان ئەوا ئەو کاتە جیهاد دەبێ بە فەرزی کیفایە. بەڵام ئێستا فەرزی عەینە، چۆن دەتوانین بڵێین جیهاد فەرزی کیفایەیە؟** [کە پارچە زەوییەکی ئیسلام نییە کوفر داگیری نەکردبێت؟!!] **ئەگەر جیهاد وەك رۆژانی عوسمان‌و عەلی موعاویە بێت (خوا لێیان رازی بێت) ئەوە کەمترین ئەنجامدانی فەرزی کیفایە ئەوەیە کە ئەمیری موسڵمانان لەساڵێکدا جارێك یان دوو جار سوپایەك بنێرێ بۆ وڵاتی دوژمنان بۆ ئەوەی شەڕیان لەگەڵدا بکەن و فەرزەکە لە گەردنی موسڵمانان بکەوێ.** [بەڵام ئەی موسڵمانان یەك پارچە زەوی بۆ دەرمان پیشانمان بدەن کە حوکمی خوای گەورەی تێدا پیادە بکرێت؟!! نەك ئەوەندە، خۆزگە لەوە زیاتر سەری نەکێشایە، بەڵکو پارچەیەك زەویم پیشان بدەن کە موسڵمانانی تێدا ئازار نەدرێ؟!! لە رۆژانی فەرمانڕەوایی یەکەم جێنشینی پێغەمبەر ﷺ ئەبوبەکری صدیق (خوای لێ رازی بێت) کۆمەڵێك پەیدا بوون کە زەکاتیان نەئەدا بە ئەبوبەکری صدیق، بەڵام ئایا خەمخۆری موسڵمانان هەروا دائەمێنێ و وازیان لێ ئەهێنێ لەسەر ئەم کارە گەورە؟ نەخێر شێرانە لەشکری پێکەوەنا و فەرمووی: (أينقص الدين وأنا حي)، ئایا دین بە ناتەواوی ئەنجام بدرێت و منیش بژیم. ئەمڕۆ نەك بە ناتەواویش ئەنجام نادرێ، بەڵکو دژایەتیشی دەکرێ، بەڵکو لەسەر دین هەزاران ئافرەتی داوێن پاك هەتك دەکرێت و ریشی دەیان گەنجی خوێن گەرم دەسووتێنرێ[1]، ئەی کۆمەڵی موسڵمانانی بەڕێز بۆچی هەڵوێستی ئەبوبەکر

---

[1] هۆ خەڵکینە....

دەزانن چی لەم ئەستێرە گەورەدا

جێی نابێتەوا:

ریش و سیواك !

دەرسی قورئان!

نوێژی جەماعەتی مزگەوت!

نانوێنن؟!!! ئەگەر ئەتەوێ بەرنامەی خوای گەورە پیادە بکرێ چ جیاوازییەك هەیە لە نێوان ﴿كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ﴾ و ﴿كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِتَالُ﴾ واتە (فەرزبووە لەسەرتان رۆژوو گرتن) و (فەرزبووە لەسەرتان شەڕکردن). خوا لێرەدا نەیفەرمووە جیهاد هەتاوەکو تەئویلی ساردو سڕی بۆ بهێنیتەوە، بەڵکو بەراشکاوی و راستەوخۆ فەرموویەتی: (القتال) واتە شەڕ، هەروەك چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (يوشك أن تتداعى عليكم الأمم من كل أفق كما تتداعي الأكلة على قصعتها، قلنا: يا رسول الله أو من قلة نحن يومئذ؟ قال: لا، أنتم يومئذ كثير، لكنكم غثاء كغثاء السيل، تنزع المهابة من قلوب عدوكم، ويجعل في قلوبكم الوهن، قالوا: وما الوهن؟ قال: حب الدنيا وكراهية الموت)[1]. یان لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (حب الدنيا وكراهية القتال). واتە: نزیك بووەتەوە گەلان لە هەموو شوێنێکەوە دەستتان بۆ درێژ بکەن هەروەك چۆن دەست بۆ خواردەمەنی درێژ دەکرێ لەناو ئەو شتانەدا کە تێیدا دەخورێ، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا لەو رۆژەدا لەبەر کەمیمانە؟ فەرمووی: نەخێر، ئێوە لەو رۆژەدا زۆرن، بەڵام پۆخڵن وەك پۆخڵی سەر دەریا وان[2]. ترس و هەیبەت لە دڵی دوژمنتاندا رادەکێشرێت و (وهن) دەخرێتەوە دڵتانەوە، وتیان: ئەی ئەو (وهن) چییە؟ فەرمووی: خۆشویستنی دنیاو ترسان لە مردن، یان ترسان لە کوشتار].

---

سەرپۆش... ئافرەتی داوێن پاك!!

مۆ خەڵکینە....

ئا لەم وڵاتە بەرینە

هەموو شتێ تیای ئازادە

بەڵام ئەوەی جێگەی نابێ و تیای قاچاغ بێ:

(یەکتاپەرستی)یەو (دین)ە!!

(شیعری یەکبوون) (سەردار)

[1] رواه أحمد عن ثوبان وصححه شيخ ناصرالدين الألباني.

[2] غثاء: بريتيیە لەو گەڵا و کەفەی بەسەر دەریاوە کۆدەبێتەوە هیچ سوودێکی نییە، پێغەمبەر ﷺ مەبەستی ئەوەیە کە موسڵمانان زۆرن، بەڵام وەك پێویست بۆ خوا نەسوڵحاون تەنها بوونی ژمارەیە. کوردیش دەڵێ: ناوی زل و دێی وێران.

## جیهاد بە گیان و بە ماڵ فەرزە

**کەواتە ئێستا جیهاد چییە؟**

**فەرزی عەینە لەسەر هەموو موسڵمانێك لەسەر زەویدا و عوزرهێنانەوە نییە بۆ هیچ کەسێك،**[1] **ئیتر فەرماندەرکەر بێت یان فەرمانپێکراون خاوەن ئیش بێت یان بێ ئیش،** [خێزانی ببێ یان بێ خێزان، ترسنۆك بێت یان جەربەزەو لێهاتوو بێت]، **خاوەن شەریکە بێت** [یان عەرەبانە کێش بێت، هەرکەسێك بێت لە هەرە جۆرە چینێك بێت لە هەر شێوە و رەنگ و لەهەر زمانێك کە ئاخاوتنی پێ بکات، تەنها موسڵمان بێت ئەمڕۆ لە سەدەی بیستەمدا جیهادی لەسەر فەرزە بە کۆی زانایانی ئیسلام، بەڵی خوای پەروەردگار ئەمڕۆ جیهادی فەرز کردووە و باسی کردووە بە گەورەترین بازرگانی لە زەویدا]، **ئەگەر هەموو ماڵەکەی ببەخشێ جیهادکردنەکەی لەسەر ناکەوێت هەتاوەکو گیانیشی نەیەتە مەیدان** [هەتاکو خۆیشی نەخاتە مەیدانی شەڕو تفەنگەوە]، **هەروەك دەڵێن فلانە کەس پیاوێکی زۆر چاکە، چونکە ماڵەکەی زۆرجار بۆ جیهاد خەرج دەکات، ئەمە جیهادەکەی وەك فەرزی عەین لەسەر نەکەوتووە هەتاوەکو بە گیانیشی بەشداری نەکات مەگەر لە کاتێکدا کە ئەمیری موسڵمانانی جیهادی ئیزنی بدا و بڵێ تۆ کاسپی بکە و پارەکەت بنێرە بۆمان، چونکە پێویستمانە، لەم کاتەدا فەرزەکەی لەسەر ئەکەوێت،**[2] **هەروەکو چۆن فەرماندەی شەڕ فەرمان دەکات بە موجاهیدێك کە تەنها چێشت لێ بنێ، یان بە یەکێك دەڵێت تۆ بە تەنها بەرگدرووی جلوبەرگ بە بۆ موجاهیدان هەر بە هەمان شێوەش دەتوانێ فەرمان بە موحاهیدێك بدات کە بڕوا بازرگانی بکات.**

---

[1] جگە لەو دیاریکراوانە نەبێت بۆ چەند کۆمەڵێکی دیاری کراو لە قورئان و سوننەتدا هاتبن.

[2] فەرماندەی شەڕ حاڵی شەڕەکە دەزانێت و ئاگادارە کە پارەی ئەو دەوڵەمەندە موجاهیدە جێگیر دەکات بۆ نموونە لەوکاتەدا وای بەچاك دەزانێت بۆ کاسپی، بەلام بەمەرجێ دڵو دەروونی پێی خۆش بێ بەشداری شەڕ بکات. والله أعلم.

**لەم حاڵەتەی کە ئێستا ئێمە تێیدا دەژین جائیز نییە بۆ هیچ موسڵمانێك کە پارە هەڵگرێ و بیخاتە ناو بانقەوە، دەبێ هەرچی ماڵی هەیە هەمووی ببەخشێ بۆ جیهاد، هەتاوەکو یەك بێ باوەڕ لە زەوی موسڵماناندا نەمێنێ، واجبە لەسەر دەوڵەمەندەکان کە تەیارە بۆ موجاهیدان بکڕن، واجبە دەبابەیان بۆ بکڕن، موشەك و هەموو پێداویستی شەڕی موجاهیدان ئامادە بکەن و بۆیان بکڕن. هەتاوەکو ئەم کاروانە بەڕێزە بکەوێتە ڕێ بۆ جارێکی تریش زەوی ئاوەدان بێتەوە بە ڕۆشنایی ئیسلام.**

[پێویستە ئەگەر یەك دیناریشمان لە گیرفاندا بێت بیبەخشین بۆ ئەوەی ئەم کاروانە جیهادیە بگاتە مەنزڵ، ئەی خاوەن پارە و سامانەکان بۆچی وەکو ئیمام عوسمانی خۆشەویست نایەنە مەیدان؟ ئەو عوسمانەی کە لە کاتی شەڕی تەبووکدا دە هەزار دینار و سێ سەد حوشتر و پەنجا ئەسپی بە هەموو کەلوپەلەوە بەخشی بە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش پێی فەرموو: "دوای ئەمە عوسمان هەرچی بکات هیچی لەسەر نییە، خوایە من ڕازیم لە عوسمان تۆش لێی ڕازی بە". بۆچی وەکو موجاهید و هاوڕێی پێغەمبەر ﷺ ئەبوبەکر هەڵوێست نانوێنن؟ ئەو ئەبوبەکرە کە هەموو ماڵەکەی بریتی بوو لە چل هەزار درهەم هێنای و دایە دەستی پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی: "چیت بۆ خێزانەکەت هێڵاوەتەوە؟ وەڵامی دایەوە و فەرمووی: خوا و پێغەمبەرم بەجێهێشتووە بۆیان"]، **بەڵکو زانایانی ئیسلام فەتوایان داوە و ئەفەرموون: "إذا سبيت امرأة في المشرق وجب على أهل المغرب تخليصها". واتە: ئەگەر ئافرەتێکی موسڵمان لە ڕۆژهەڵات ژێردەستەی بێباوەڕان بوو واجب دەبێ لەسەر موسڵمانانی ڕۆژئاوا کە بچن ڕزگاری بکەن.**[1]

---

[1] با نەزانانە لۆمەی ئەو برایانە نەکەین کەوا زمانی هێز بەکاردێنن بۆ ئازادکردنی ئەو خوشکە موسڵمانانەی کە لەلای قیبتییەکانی میسر بەند کرابوون، یان لە تۆڵەکردەوەی بکوژانی خوشکە (دوعا)دا!! عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ:

كيف القرار وكيف يهدأ المسلم

والمسلمات مع العدو المعتدي

ئیمامی مالیك دەفەرموێت: (یجب علی المسلمین كف اسرارهم ولو استنفذت أموالهم)، واتە: واجبە لەسەر موسڵمانان كە ئەسیرەكانیان رزگار بكەن و فیدیەیان بۆ بدەن ئەگەر هەرچی ماڵیشیان هەیە تەواو بێت، ئەی موسڵمانان چ وەڵامێكتان ئامادە كردووە بۆ بەردەم پەروەردگار لە كاتێكدا نامووس و شەرەفی ئافرەتانی موسڵمانی داوێنپاك هەتك دەكرێت؟ لەكاتێكدا ئافرەتانی مسوڵمان لە ژێر زەمینی جەندرمەكاندا و [بەچكە تاغوتەكاندا] داوێنیان دەكەوێتە خوارەوە؟ یان[١] بۆ ئەو هەموو موسڵمانەی لە جیهاندا رۆژانە دەكوژرێن؟ بە هەزاران موسڵمان لە برسان دەمرن لەبەر نەبوونی پاروویەك نان كە خۆیانی پێ بژێنن؟ ئایا خوای گەورە و عادل قبوڵ دەكات لە دەوڵەمەند و بازرگانەكان كە پارەكەیان هەڵبگرن؟!!

دووبارە ئێمە پرسیار دەكەین ئایا كامتان بەرێزە لای خوای گەورە؟ دەوڵەمەندی پارە هەڵگریان هەژاری سك برسی و نەدار؟ لەگەڵ ئەوەشدا دوژمنانی ئیسلام رۆژانە دەیانكاتە قوربانی، دیارە لەبەر نەبوونی پارەیەكی وەها بۆ كرینی تەقەمەنی هیچ بەرهەڵستییەكیان پێ ناكرێت، ئەگەر پێشیان بكرێت وەك پێویست نییە، ئایا پاداشتی كامیان لای خوای گەورە زۆر گەورەیە؟ ئایا هەرچی پارە و ئاڵتوون و سەروەت و سامان هەیە یەكسان دەبێت لەگەڵ خوێنی موسڵمانێك یان نامووسی ئافرەتێك لای خوای گەورە؟!!! لەم كاتانەدا جائیز نییە هەڵگرتنی پارە وپول بە هیچ شێوەیەك، ئەگەر جیهادەكە پێویستی بە ماڵ و سەروەت هەبوو ئەوە دەبێت ماڵەكەتی بۆ پێش بخەی، ئایا ئەگەر كەسێك بە ویژدان و ژیرانەوە بیربكاتەوە گومانی دەبێت لەوەی كە ئەمرۆ موجاهیدان زۆر پێویستیان بە پارە و ماڵ و تەقەمەنی دەبێت؟!! ئایا زۆر موسڵمان نەبوو نینۆكی پەنجەكانی هەڵوەری لەناو بەفردا بەهۆی نەبوونی پێڵاوەوە كە لەپێی بكات؟ ئایا زۆربەی موسڵمانان لە زستاندا رەق نەبوونەوە بەهۆی سەرماوە؟ بەكۆمەڵ دەیان بینین كە سەرما رەقی

---

[١] مسوڵمان چۆن دەتوانێ دانیشێ و ئارام بگرێت و ئافرەتانی موسڵمانیش كەوتوونەتە لای دوژمن؟؟!! (سەردار)

کردوونەتەوە و مردوون، خوێن لەناو دەمار و مێشکدا هاتوچۆی لێ دەبڕێت بەهۆی سەرماوە، دەمرن بە هۆی نەبوونی جلوبەرگ لەبەری بکەن، ئەوە چی دەبێت بۆ دەوڵەمەندێك ئەگەر پاڵتاوێك بکڕێت بۆ موجاهیدێك لە دژی سەرمای زستان یان پێڵاوێكِ بکڕێ لە دژی زوقم و تەرزە لەسەر شاخەکان؟ بەڵی خوای پەروەردگار پەنجەکانیان دەپارێزێ، بەڵام بەڵکوماڵەکەی تۆ هۆیەك بێت لەو هۆیانەی کە خوا دەیکاتە هۆی پاراستن، ئایا دەزانن کە چەندین موجاهید لەبەرەکانی جەنگ رۆژانە دەچن ئیش دەکەن بۆ بەدەستهێنانی قوتێك بۆ خێزانەکانیان؟ ئایا دەزانن کە فەرماندەی شەڕەکان کە فەرماندەی وا هەیە لێپرسراوی هەزاران موجاهیدە و سەرپەرشتییان دەکات، بەڵام قەرزاری و فەقیری ناچاری دەکات کە بچێ بۆ ئێران ئیش بکات و مەیدانی شەڕ بەجێ بهێڵێ بۆ ئەوەی ماوەیەك ئیش بکات و قوتێك بۆ خاوخێزانی بهێنێتەوە؟!! لە هەمان کاتدا ئەگەر سەرچاوەیەك هەبوایە بۆ یارمەتییدانی نەئەچوو بۆ ئیش و مەیدانی شەڕی بەجێ نەئەهێڵا، زۆربەی مەیدانی شەڕەکان هەڵوەشێنراونەتەوە بە هۆی نەمانی زاناکان و فەرماندەکان لە ناویاندا... چونکە لە تاو برسێتی هەڵهاتن.

ئایا زۆربەی ماڵە موجاهیدەکان لە مانگێکدا (١٠٠) روپیەیان هەبووە بۆ دەرامەتیان کە ناکاتە پارەی کراسی جەژنی کچێکی بچووکی دەوڵەمەندێك؟!! یان رۆژانە لە پێنج دینار کەمتر بە منداڵە بچووکەکەی نادات کە مانگی (١٥٠) روپیە دەکات کە بەشی ماڵە فەرماندەیەکی مەیدانی شەڕ دەکات، بەڵکو دوو ماڵیش دەکات لە ئەفغانستان، بەڵی راستە زاناو فەرماندە بوونیان لە ناو مەیدانەکانی شەڕدا پێویستییەکە لە پێویستییە گەورەکانی شەڕ [بەتایبەتی زانایان] زۆربەیان کۆچیان کرد لەبەرئەوەی لەمانگێکدا یەك روپیەیان نییە، [کەواتە واجبە ماڵ و سەروەت و سامان بەخشین پێش بخرێت بۆ ئەم جیهادە هەتاوەکو تەواو کامڵ بێت و زیاتر بەرەوپێش بڕوات].

بەراستی جیهاد ئاشێکە نەفس و پارە دەهاڕێت، هەموو ڕۆژێك لە (جاجی)[1] (١٠٠٠ تا ٢٠٠٠) فیشەك دەتەقێنرێتە تەیارەکانی رووس، وا گومان دەبەن کە شەڕکردن کارێکی ئاسانە؟! شەڕکردن دەوڵەتە گەورەکانی بەهیلاکدا برد، لە شەڕی جیهانی دووەمدا بەریتانیا بێ پارە کەوت، فەرەنسا بێ پارە کەوت، ئەڵمانیا بێ پارە کەوت و چۆکی دادا و رووخا، بەراستی ئەم شەڕە وشك و تەڕ دەخوات، بەڵێ ئەم وڵاتانە کە چەند سەرمایەدارن هەموویان بەهۆی شەڕەوە بێ پارە کەوتن، ئەی تۆ رات چییە و چۆنە بەرامبەر بە گەلێکی وەکو ئەفغان کە نانی نییە بیخوات، بەڵام رووبەڕووی گەورەترین هێز بووەتەوە لە جیهاندا؟!! بەراستی ئەی برایانی من سەرسام ماوم ئەم جیهادە چۆن هەتا ئێستا بەردەوام بووە؟ ئەگەر دەتەوێ بژمێری، ئەوە ئەو سەربازگەیەی ئێمەی تێداین لە مانگێکدا (٦٠٠,٠٠٠) روپیە خەرج دەکرێ، کە ئاگام لێیە هەندێ لە بەرەکانی شەڕ (١٠٠,٠٠٠) روپەیەیان ناگاتێ، "پنچشیر" پێنج هەزار موجاهیدی لێیە، هەموو ڕۆژێك پێویستیان بە (١٥,٠٠٠) نان هەیە ئەگەر ژەمی یەك نانیش بخۆن، هەر نانێکیش بە یەك روپییەیە هەر ڕۆژێ پێویستیان بە (١٥٠٠٠) روپیە دەبێت، لە مانگێکا پێویستیان بە نیو ملیۆن روپیە دەبێت، دەمن ئەزانم کە نەك نیو ملیۆن، بەڵکو چارەکە ملیۆنێکیان نەگەیشتووەتە دەست، ئەمە تەنها بۆ نان.

مزارشریف (موحەممەد عەلەم) ئاگای لێیە کە (١٦,٠٠٠) موجاهیدی لێیە، پێویستییان هەموو ڕۆژێك بە (٥٠,٠٠٠) نان هەیە، لە مانگێکدا یەك ملیۆن و نیو نان... چۆن؟ کە من دەزانم لە ساڵێکدا یەك ملیۆن و نیویان پێناگات....

جیهاد چۆن دەڕوات؟ لەلای خوای گەورەوە.... پەروەردگار خۆی ئاسانی دەکات، بەڵێ برای بەڕێزم ئەوە موجاهیدە کە دەزانین راتبێکی نییە لەگەڵ ئەوەشدا ماڵ و منداڵەکەی (٥ ـ ٦) ساڵە نەدیوە و ناشزانێ کە چییان بەسەرهاتووە، کۆمەڵێکیان

---

[1] سەربازگەیەکە لە ئەفغانستان کە شەڕی تێدا کراوە.

**خێزانەکانیان کۆچیان کردووە، بەڵام خۆی لەناو جەرگەی شەڕدایە و شەڕ دەکات، نازانێ بۆ کوێ و ڕوو بە کوێ ڕۆیشتوون، نازانێ لە (پیشاوەر)ن، یان لە (کوهات)ن، لە عالەمدا ماون یان مردوون؟ پێش ١٠ ڕۆژ لەمەوبەر موجاهیدێکی ئەفغانی بەلامدا تێپەڕی کرد ناوی (حەسەن) بوو، منیش پێم وت: خێزانەکەت لە کوێیە؟ وتی: نازانم، ئەمە پێنج ساڵە ڕۆیشتوون و کۆچیان کردووە ناشزانم بەرەو کوێ کۆچیان کردووە؟! بەڵی ئەم موجاهیدە کە پێنج ساڵە خۆی لە شارێکەو خێزانەکەشی لە شارێکی ترە و یەکتریشیان نەدیوە،** [هەواڵی موجاهیدانی کوردستانم گوێ لێ بگرە، کاک تەها خانەقینی کە ماوەی دوو ساڵ بوو لە خانەقین دەرچوو بوو، لای دایك‌و باوکی وتبووی بۆ ئیش کردن دەڕۆم بۆ ئەوەی دڵی دایەی بەسۆزی ناڕەحەت نەبێ کە کوڕەکەی بۆ جیهاد دەڕوات و دەکوژرێ، بەڵام کاک تەهای خۆشەویست خۆی (L.P.K.Y) یەکەوە بەرامبەر موجریمەکان وەستاو و شێرانە بەرنگاریان بوویەوە هەتاکو شەهید بوو، ئێستاش بۆ ماوەی سێ ساڵ دەڕوات کاک تەها شەهید بووە و دایك‌و باوکی نەیانزانیوە و چاوەڕوانی گەڕانەوەی کوڕی شیرین و پارەی سێ ساڵی ئیشکردن دەکەن].

**بەڵێ ئەو موجاهیدانەی ئەفغانستان نابینی یەکێکیان تووشی ناڕەحەتی و تاڵی و ئازار نەبووبێت، بەڵی دەچیتە هەر ماڵێك لە ئەفغانستان ئەوەندە ناڕەحەتییان بەسەردا هاتووە سەریان بۆ سپی دەکەی، یەکێك ئەبینی سووتاوە، یەکێ کوێر بووە، یەکێك قاچی پەڕیوە، ... هتد، بەو شێوەی کە پارەی کرێ سەیارەیان نییە لە پیشاوەرەوە بچن بۆ لاهور تاوەکو تیماری خۆیان بکەن.**

## گومان و تاوانبارکردن

[بەڵێ هەر لە کاتی پێغەمبەری ئیسلامدا و لە دوای پێغەمبەری ئیسلامیش ﷺ کۆمەڵێك هەبوون کە چەندین گومانی ژەهراویان دروست کردووە بۆ ئەوەی بە تیرێك دوو نیشان بپێکن:

یەکەم: خەڵکی پەشیمان بکەنەوە لە خوێنڕشتن لە پێناوی خوادا.

دووەم: لەبەرئەوەی موسڵمانان عەیبیان لێ نەگرن کە نایەن بۆ جیهاد].

زۆر لە سەربازەکانی دەوڵەت هەیە کە هەڵدێن بۆ لای موسڵمانان و دێن بۆ پیشاوەر و ئەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ جیهاد، بەڵام پارەی کرێ سەیارەیان پێ نییە.

ئەگەر ئەمانەت بەراورد کرد لەگەڵ ئەوانەی گومان دروست ئەکەن لە عەقیدەی ئەفغانییەکاندا و ئەڵێن: ئەوانە بیدعەچین و دوعا و نوشتەیان پێوەیە، هەرئەوەی ئەمە ئەڵێت ئەبینی کە بلیتێکی تەیارە ئەبڕێ و ئەچێ بۆ ئەمریکا بۆ سەیری یاری و ئەگەڕێتەوە، گوایە ئەو ١٠٠٪ عەقیدەکەی تەواوە، ماشاءالله! هەربۆیە عەقیدەکەی پاڵی پێوەناوە کە بچێ بۆ سەیری یارییەکانی ئۆلۆمپی لە لۆس ئەنجلۆس کە تەنها بلیتی تەیارەکە (١٥٠٠) دۆلارە، کە ئێمە یارمەتی هەندێ لە بەرەکان ئەدەین بە (٣٠,٠٠٠) روپیە.

کۆمەڵێك دروست بوون لە پیشاوەر ئیش‌وکاریان تەنها گومان دروست کردن بوو لەسەر جیهادی ئەفغانی، گوایە ئەوانە ئەهلی بیدعەن و موشریکن و نابێ جیهادیان لەگەڵدا بکرێت.

ئەی برایان! ئێمە پرسیار دەکەین: ئەفغان موسڵمانن یان نا؟ ئایا لە ئیسلام و میللەتی ئیمان چوونەتە دەرەوە؟!! ئایا هەر بە بوونی بیدعە لەناو موجاهیدانی ئەفغانی جائیز نییە یارمەتییان بدەی؟ [نەخێر وانییە برای موسڵمان، وانییە، دەبێ چاك تێبگەی] نەخێر بە یارمەتیدانی حەیوانەکانیش پاداشت دەنووسێت!! (وإن لنا في البهائم لأجر يا رسول الله؟ قال: في كل كبد رطبة أجر). واتە: یارەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاریان کردو وتیان: ئایا ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لە چاکەکردن

لەگەڵ گیانداراندا ئەجرمان هەیە؟[1] فەرمووی: لە هەموو جگەرێکی تەڕدا پاداشت هەیە، واتە هەموو گیاندارێك. لە فەرموودەی سەحیحیشدا هاتووە: (بينما بغي من بغايا بني إسرائيل تطوف بركية بئر ـ بغي وافقة عند بئر ـ وإذا بكلب يلهث يمتص الثري من العطش، فنزعت موقها ـ خفها ـ وملأته ماء، ثم سقت الكلب، فشكر الله لها، فغفر لها)[2]. واتە: جارێکیان ئافرەتێك لە ئافرەتی بەنی ئیسرائیلییەکان دەسوڕایەوە بە دەوری بیرێکدا لەو کاتەدا بینی سەگێك زمانی دەرهێناوە و خۆڵەکە دەمژێت لە تینوێتیدا، ئافرەتەکە پێڵاوەکەی خۆی داکەندو پڕی کرد لە ئاو بۆی دوایی ئاوەکەی دایە سەگەکە سوپاسی خوای کرد بۆی و خوای لێی خۆش بوو. ئافرەتەکە ئافرەتێکی زیناکەریش بوو، بەڵێ بەنی ئیسرائیلییەك خوا لێی خۆش بوو لەبەرئەوەی ئاوی دا سەگێك، توخوا موجاهیدین کەمترن لە سەگ؟!!

وەڵاممان بدەنەوە: جەنابی دێ و دەڵێ جائیز نییە پارەی زەکات بدرێ بە موجاهیدان، لەبەرچی؟ ئایا زانایانی ئیسلام نافەرموون: ئەگەر گاورێك یان جولەکەیەك لەگەڵماندا بوو تۆش دەزانی برسیەتی ئەگەر نانت پێ بدایە نەئەمرد، بەڵام لە برسا مرد لەبەرئەوەی نانت پێ نەدا، ئەوە فەرزە لەسەرت خوێنەکەی بدەی بەمەرجێ توانات هەبێت. بەڵێ ئەمڕۆ ئەم فەتوایە بخوێنەرەوە لە کتێبی (حاشية الدسوقي على شرح الكبير) لە بەرگی دووەمدا لاپەڕە ١١٠ـ ١١١[3] کە ئەفەرموێ: ئەگەر یەکێك دای بە لای پیاوێکی برسیدا دەیتوانی نانی بداتێ، بەڵام نانیشی پێ نەدا تاکو مرد، ئەوە جیاوازی تێدا هەیە:

کۆمەڵێك لە زانایان ئەفەرموون: دەبێ خوێنەکەی بدات کە (١٠٠) حوشتر دەکات و دەبێ (٤٠) حوشتریان بەچکەی لە سکدا بێت.

---

[1] سەیری کتێبی صحیح جامع الصغیر رقم٤٢٩٦ بکە.

[2] ئیمامی موسلیم رسوایەتی کردووە.

[3] فەتوای ئیمام مالیکە.

کۆمەڵێك دەڵێن دەبێ بکوژرێت لەباتی مردووەکەدا، چونکە ئەم بووەتە هۆی مردنی، بەڵێ چۆن ئەم فەتوایە شاراوە؟!! چۆن خۆتی لێ بێ ئاگا ئەکەی، بەراستی گەلی ئەفغان خوای گەورە کردی بە هۆی سەربەرزی موسڵمانان، چونکە عیزەتیان دا بە ئیسلام[1]، بەڵێ ئێمە پرسیار دەکەین و دەڵێین لەبەرئەوە نایەن قەبر بەرز دەکەنەوە و نوشتە دەکەن؟ کەواتە موسڵمانان کافرن، چونکە قەبر بەرز دەکەنەوە؟!! با چاك بزانی موجاهیدان ئەم شتانە ناکەن، چونکە بۆیە جیهاد دەکەن کە فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە بکەن.

وەرە با بچین بۆ میسر بۆ لای قەبری (الحسین بن علی) خوایان لێ رازی بێت کە بەناو کردوویانە بە گۆڕی (الحسین)، بزانە چی لێ دەکرێت، چونکە خۆی لە کەربەلا کوژراوە، لە ١٠٠ مەتر کەمتر لەولای ئەو قەبرەوە گەورەترین و کۆنترین زانکۆی ئیسلامی تێدا هەیە لەکاتێکدا دەچیتە ژوورەوە لای گۆڕی (الحسین) یەکسەر دەستت دەگرن و دەڵێن دەبێ بە چواردەوریدا بسوڕێیتەوە، دەبێ چەیوانی بۆ سەرببڕی، چەندین پارە و پول بەسەر گۆڕەکەیدا رژاوە، سەیردەکەی خەڵکی ماچی دەکەن و کڕنووشی بۆ دەبەن، ئیتر ئەوە باسی ئەوانە مەکە کە خۆیانی پێوە هەڵئەواسن و دەستی پێدا دێنن، ئایا ئیتر ئێمە ئەبێت واز لە خەڵکی میصر بهێنین؟!! بڵێین بەراستی خەڵکی میصر کافرە و لە ئیسلام دەرچوون، جائیز نییە یارمەتییان بدەی؟!! ئایا ئەمە رەوایە؟! پرسیار کرا لە موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب لە بارەی ئەو کەسانەی کە کێلی (الکوان) لە ریاض دەپەرستن ئایا تۆ کافریان دەکەی؟ واتە: حوکمی کافریان هەیە؟ فەر مووی: نەخێر ئێمە کافریان

---

[1] ئیسلام خۆی هەر بە عیزەتە، دەبێ بڵێین جارێکی تر عیززەت و سەربەرزی و کەرامەتی گەڕانەوە بۆ موسڵمانان و کوفری تێگەیاند کەوا موسڵمانان بوونیان هەیە، ئەو موسڵمانانەی بەشداری جیهادی ئەفغانیان کرد زۆربەیان بوون بە قەڵاو خەمخۆر بۆ ئیسلام و مسوڵمانان و توانیان زەبری گورچك بڕ لە کوفر بوەشێنن و سامی موسڵمانان لە دڵیاندا دروست بکەنەوە، سوپاس بۆ خوا. (سەردار)

ناکەین، چونکە کەس نییە لە دینەکەیان شارەزایان بکات و ڕێیان پیشان بدات، [بەڵێ ئەمە وەڵامی زانای بەڕێزو خۆشەویست (موحەممەد بن عەبدولوەهاب)]

"ابن القيم" خوای لێ ڕازی بێت دەفەرموێت: "والذين يستغيثون بالقبور لا نكفرهم إن كانوا جهلة". واتە: ئەو کەسانەی کە پەنا بۆ گۆڕەکان دەبەن و هاواریان لێ دەکەن کافریان ناکەین ئەگەر نەزان بن بەوەی ئەوە شیرکە.

بەڵی ئەو زانا بەڕێزانە وەکو "ئیبن تەیمیە" کە موناقەشەی لەگەڵ "الجهمیە" دەکرد لەدوای موناقەشەکە دەیگوت ئێوە بە کافر نازانم واتە فەتوای کافرێتیتان بۆ نادەم. چونکە ئێوە نەزانن. سوپاس بۆ خوای گەورە جیهاد بیروباوەڕیانی پاك و جوان کردووە، ئێستا کەسێك نابینی نوشتە و دوعا هەڵواسێت ئەگەر هەڵیشی بواسێت ئامۆژگاری بکەیت یەکسەر لای دەبات ئەمەش هۆکەی بوونی جیهادە لە ناویاندا، ئەی برای بەڕێزم ئەو دوعا و نوشتەیەی کە هەلی دەگرێت وا دەزانێ (قورئان و سوننەت)ی تیا نووسراوە.

(١٠٠) زانای بەڕێز دەڵێن: ئەگەر قورئان و سوننەتی تێدا بێت ئەوا جائیزە، بەڵام کۆمەڵێك دەڵێن کەراهەتی هەیە.[1] با قورئان و سوننەتیش بێت، چونکە بەرەو شیرکی دەبات، بەڵام نەیانوتووە حەرامە. من پرسیاریان لێ دەکەم ئەگەر تۆ مەدالیایەك هەڵدەگری لەناویدا (آية الكرسي) نووسراوە، هەڵی دەگری بۆ بەرەکەت، ئایا حەرامە یان حەڵاڵە؟ ئایا کەس دەڵێ هەڵگرتنی (آية الكرسي) حەرامە؟ یان ئایا ئەگەر (آية الكرسي) لە ماڵەوە هەڵبواسرێ حەرامە یان حەڵاڵە؟ ئایا هیچی تێدایە؟ بەڵێ خۆ من لەسەر بۆچوونی ئەو زانایانەم کە دەڵێن باش نییە و بە باشیشی نازانم و هەرکەسێکم دیبێ کردبێتی ئەوە ئامۆژگاریم کردووە و پێم لابردووە، بەڵام بەشێوەیەکی جوانی موسڵمانانە، کەسیشیان ئینکارییان لەگەڵ نەکردووم.

---

[1] واتە: ئەگەر نەیکەیت چاکە، بەڵام ئەگەر بیشیکەیت ئەوا ئەوا تاوانبار نابیت بەمەرجێك قورئان و سوننەت بێت لەوانەش لە هاوەڵە بەڕێزەکان کە بۆچوونی وایە "ابن مسعود"ە (خوای لێ ڕازی بێ).

بەڵێ شتێکی باش نییه، بەڵام ناتوانم بڵێم یەکسەر (مشرك)ه کێ دەڵێ موشریکه؟ ئەی برای بەڕێز وا بزانه که ئەم دوعایه قورئان و سوننەتی تێدا نەبێ، بەڵام ئەو له نەزانی هەڵی دەگرێ و وا دەزانێ که قورئان و سوننەتی تێدایه، ئایا ئەوه موشریکه؟! نەخێر لەبەر ئەوەی نەزان بووه موشریك نییه، ئایا حەرامه، نەخێر حەرام نییه، چونکه گومانی وایه خێری تێدایه وا دەزانێت قورئان و سوننەتی تێدایه، بەڵام ئەگەر تۆ به شێوەیەکی نەرمی وەك پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری بکەیت و پێی بڵێیت ئەوه خراپه و قورئان و سوننەتی تێدا نییه و خوای گەوره پێی ناخۆشه ئەویش لای دەبات، بەڵام ئەگەر بەشێوەیەکی ناشیرین و بەتوڕەیی پێی بڵێیت ئەوا ئەویش لای نابات و وازی لێ ناهێنێ، بەڵکو بەردەوامیش دەبێت لەسەری.

[ئێمه مەبەستمان ئەوه نییه که ئەم کردەوانه چاکن، بەڵام ئەی موسڵمانی بەڕێز نابێ ئەم شتانه بکەی به بەرهەڵست بۆ نەکردنی جیهاد، با ئەوەش بزانی دوعا کردن ئەگەر سێ مەرجی تێدا بێت ئەوه بەلای کۆی زانایانی ئیسلامەوه جائیزه. "ئیمامی سیوتی" دەفەرموێت: "قد اجمع العلماء على جواز الرقى عند اجتماع ثلاث شروط: أن تكون بكلام الله أو بأسمائه أو صفاته وباللسان العربي وما يعرف معناه ويعتقد أن الرقية لا تؤثر لذاتها بل بتقدير الله تعالى".[1] واته: کۆی زانایان لەسەر ئەوەیه که نووسینی دوعا جائیزه ئەگەر سێ مەرجی تیابوو:

یەکەم: دەبێ قورئان بێت یان به ناوەکانی خوا و سیفەتەکانی بێت.

دووەم: به زمانی عەرەبی بێت یان ماناکەی بزانرێ.

سێیەم: بیروباوەڕیش وابێت که دوعاکه سەبەبه واته چاك کردنەوەکه به ویست و توانای خوای گەوره دەبێت واته (ئەسباب تەنها له دەستدا بێت نەك له دڵ).

---

[1] فتح المجيد شرح كتاب التوحيد. محمد بن عبدالوهاب. ص١٣٢.

ئێمە دەمانەوێ بزانین ئەو کەسانەی کە قاچ دەخەنە سەر قاچ و خەڵکی لە جیهاد سارد دەکەنەوە نایەڵن ئەو گەنجە تازە پێگەیشتووانە ڕۆحی خۆیان بە ئیسلام و ئەزموونی ئیسلامی ببەخشن، ئایا بۆچی نایەن جیهاد بکەن؟ بە چ بەڵگەیەك خۆیان لە جیهاد دەشارنەوە، ئەمانە لە بنچینەدا نایانەوێ جیهاد بکەن، بەڵام چەند تەئویلێکی سارد دەهێننەوە بۆ ئەوەی عەیبیان لێ نەنرێت.

بزانن ئەوا خوای گەورە سڕیان هەڵدەداتەوە و دەفەرموێت: ﴿ فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓاْ أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُواْ لَا تَنفِرُواْ فِى ٱلْحَرِّ ۗ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُواْ يَفْقَهُونَ ﴾ (التوبة: ٨١) واتە: بە کەیفو خۆشحاڵ بوون ئەو کەسانەی کە نەڕۆیشتن بۆ غەزوەی تەبووك لە مەدینەدا مانەوە لە پاش سەنگەری پێغەمبەر ﷺ و یارەکانی و حەزیان نەدەکرد بە ماڵ و نەفسیان جیهاد بکەن لە پێناوی خوا وە کۆمەڵێکیان بە کۆمەڵێکی تریان دەوت لەم کاتی گەرمایەدا لە جێگای خۆتان دەرمەچن تۆش پێیان بڵێ ئاگری دۆزەخ گەرمترە کە ئێوە تێدەفرێت بەهۆی نەچوونتانەوە بۆ تەبووك.

ئەگەر مونافیقەکان بیانزانیایە و تێبگەیشتنایە لە پێغەمبەری خوا ﷺ و یارەکانی بەجێ نەدەمان و دەچوون بۆ ناو ئەو گەرمایە لەبەرئەوە بەو گەرمایە خۆیان لە ئاگری دۆزەخ ڕزگار بکردایە کە چەندین ئەوەندەی ئەو گەرمایە گەرمترە.[1]

هەروەك ئەبوهورەیرە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە دەفەرموێت: (إن ناركم هذه جزء من سبعين جزءا من نار جهنم وظربته في البحر مرتين، ولولا ذلك ما جعل الله منها منفعة لأحد).[2] واتە: ئەو ئاگرەی ئێوە بەشێکە لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ کە حەفتا بەشە تەنها یەك بەشێتی و "٦٩" بەشەکەی تری

---

[1] مختصر ابن كثير ، م٤، ص١٦٠.

[2] أخرجه أحمد قال ابن كثير اسناده صحيح.

دابەزێنراوە، ئەو یەك بەشەش دوو جار دراوەتە ناو دەریا، ئەگەر وا نەبوایە ئەوا خوای گەورە سوودی تێدا دانەئەنا بۆ کەس.

جا خوای گەورە لەبەر خاتری ناوە پیرۆزەکانی دەم و چاوی ئێمە و ئێوەی ئیماندار بپارێزێ لەو ئاگرە.

جا ئەی برای خۆم سەیری ئایەتەکە بکە کە خوای گەورە دەفەرموێت خۆیان حەز ناکەن جیهاد بکەن، بەڵام دەڵێن کورە مەڕۆ بۆ ناو ئەو گەرمایە. کەی کاتی شەڕە، جارێ کاتی نەهاتووە، نازانم ئەم جیهادە کەی کاتی دێت؟!!! بە چ بەڵگەیەك نایەنە ناو موجاهیدین، بەو بەڵگەیەی کە بیدعە دەکەن؟[1] بەو بەڵگەیە رێ لە خەڵك دەگرن؟ هەرواش دابنێ کە ئەمانە تاوانبارن، ئایا جائیزە جیهادکردن لەگەڵیاندا یان جائیز نییە؟ جائیزە بەڵکو واجبیشە.

ئەوەتا ئەگەر قەناعەت بە زانیاری و لەخواترسانی ئیبن تەیمیە دەکەی گوفتاری ئەوتان بەسەرا دەخوێنینەوە، سەری (فتاوی الکبری) بەرگی (٢٨)، لاپەڕە (٥٠٦) بکەی چی دەفەرموێ: "ولهذا کان من أصول أهل السنة والجماعة: (الغزو مع كل بر وفاجر) "إن الله يؤيّد هذا الدبن بالرجل الفاجر وبأقوام لا خلاق لهم".[2] واتە: شەڕکردن لەگەڵ هەموو چاکێك و گوناهبارێك. [مەبەستی ئەوەیە گوناهباریش بێت هەردەبێ جیهادی لە پشتەوە بکرێ]، چونکە خوای گەورە ئەم دینە سەردەخات بە پیاوی گوناهبار یان بە کۆمەڵێك کە لە رۆژی قیامەتدا هیچ بەشێکیان بۆ نییە لای خوا (کما أخبر بذلك النبي ﷺ لأنه إذا لم يتفق الغزو مع الأمراء الفجار أو مع معسكر كثير الفجور فإنه لابد من أحد الأمرين: إما ترك الغزو فيلزم من ذلك استيلاء الآخرين الذين هم أعظم ضررا في الدين والدنيا... وإما الغزو مع الأمير الفاجر

---

[1] ئەی خوێنەری بەڕێز ئاگاداربە لەبەرئەوەی بیدعە خوای گەورە پێی ناخۆشە ئێمەش رقمان لێیەتی، بەڵام نابێ ئەوە بکەی بە بەڵگەو واز لە جیهاد بهێنێ، ئەگەر راست دەکەی حەز لە بیدعە ناکەی وەرە ناو موجاهیدان و بیدعە مەهێڵە بکرێت، نەك ئەوە بکەی و خۆت لە جیهاد قوتار بکەیت.

[2] رواه البخاري.

**فيحصل بذلك دفع الآخرين، وإقامة أكثر شعائر الإسلام وإن لم يكن إقامة جميعها، فهذا هو واجب). واتە: لەبەرئەوەی لە قاعیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دا هەیە: وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: شەڕ کردن لەگەڵ هەموو چاك و خراپێك، چونکە خوای گەورە ئەم دینە سەردەخات بەپیاوی گوناهبار یان کۆمەڵێکیش بێت کە لە ڕۆژی دواییدا هیچ شتێکیان بۆ نەبێ لای خوای گەورە هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی بەمە داوە. چونکە ئەگەر ڕێك نەکەوت جیهاد بکەیت تەنها دەبێت لەگەڵ چەند ئەمیرێکی فاجیردا بیکەیت یان سەربازگەیەك کە گوناهی تێدا دەکرێ بە زۆری ئەوا دەبێت دوو شت هەیە یەکێکیان بکەیت:**

**١. یان دەبێت واز لە شەڕکردن بێنی لە پشتیانەوە واتە لەگەڵ ئەمیرە فاجیرەکاندا ئەوا دەبێتە هۆی سەرکەوتنی کۆمەڵێك کە خراپە و زەرەرو زیانیان زۆرترە بۆ دین ودونیاش.**

**٢. یان شەڕکردن لە پشتیانەوە** [واتە لە پشت ئەمیرە فاجیرەکانەوە] **ئەوە دەبێتە هۆی لابردنی ئەوانەی کە خراپ ترن و گوناهبارترن و دەبێتە هۆی بەجێهێنانی زۆربەی یاساکانی ئیسلام ئەگەر هەمووشیان جێبەجێ نەکرێت "ئەمەش فەرزە".**

## جیهاد فەرزە ئەگەر لەگەڵ فاجیریشدا بێت[١]

[گوتارەکەی ئیبن تەیمیە بەسە بۆ دڵ ئارامکردن، بەڵام پێویستە ئەم باسە زیاتر رۆشن بکرێتەوە بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی پەشیمانکردنەوەی موجاهیدان لە جیهاد] ئەمە فەرزە. بەڵێ چۆن فەرزە؟ بەڵێ ئەو فەرزەیە کە بریتییە لە شەڕکردن لەگەڵ ئەمیرێك ئەگەر فاجیریش بێت، شەڕو جیهاد واجبە ئەگەر لە سەربازگەیەکدا بێت کە گوناهی تێدا بکرێت، بەڵکو زۆربەی شەڕەکان لە دوای چوار جێنشینەکانی پێغەمبەر ﷺ کە موسڵمانان ئەنجامیان داوە بەم شێوەیە بوو "کۆمەڵێکی تێدا بووە کە ئیشی نادادپەروەرییان کردووە، خوایە گیان ئەو کەسەی دەیەوێت لەم باسەدا شك و گومان دروست بکات و بیکاتە هۆیەك بۆ ئەوەی خەڵکی لە جیهاد سارد بکاتەوە داوات لێ دەکەین پەروەردگار کە دەرگای زانیاری و ئیشکردن بەو زانیارییەی لێ بکەیتەوە لەگەڵ تێگەیشتندا بۆ خاتری ناوی گەورەی خۆت، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (الخيل معقود في نواصيها الخير إلى يوم القيامة الأجر والمغنم)[٢]. واتە: ئەسپ بەناوچاویەوە نووساوە و لکاوە خێر تا رۆژی قیامەت کە پاداشت و غەنیمەتە.

[مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ لێرەدا بەردەوام بوونی جیهادە].

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر مانای ئەو فەرموودەیە کە ئەبوداود ریوایەتی ئەکات کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (الجهاد ماض منذ بعثني الله إلى أن يقاتل أخر أمتي الدجال لا يبطله جور جائر ولا عدل عادل).[٣] واتە: شەڕکردن بەردەوامە

---

[١] واتە ئەوانەی لەگەڵیان دەچیت بۆ جیهاد ئەگەرچی فاجیریش بن واتە گوناهکار بێت و دادپەروەر نەبێت، مەبەستی شێخ عبدالله عزام لێرەدا ئەوەیە کە فجورەکەی بۆ نەفسی خۆی بێت، بۆ نموونە: عارەق بخوات، یان گوێ لە گۆرانی بگرێت، بەڵام ئەگەر فجورەکەی زەرەری بۆ ئیسلام و موسڵمانان هەبێت و زانیت خیانەت لە موسڵمانان و ئیسلام دەکات ئەمە ناچێتە ژێر ئەو باسەوە، ئاگات لەم جیاوازییە بێت.

[٢] صحيح جامع الصغير، ٣٣٥٥.

[٣] رواه أبوداود. سەیری کتێبی (عون المعبود شرح أبی داود) ج٧، ص٢٠٥، بکە ـ قال الشيخ الالبانی ضعيف.

**لەوکاتەوەی خوای گەورە ناردوومی هەتاکو دواینی ئوممەتم شەڕی دەجال دەکات، پووچەڵی ناکاتەوە خراپەی هیچ خراپەکارێك و دادپەروەری هیچ دادپەروەرێك.**

[بەڵێ ئەم فەرموودە شیرینە بەراستی وەکو ڕۆژی ڕووناك وایە هیچ گومانی تێدا نییە لەوەی کە قسەی ئەو کەسەی خراپ تێیان گەیاندووە بەبیرێکی زۆر تەسکی دوور لە قورئان و سوننەتەوە دەڵێت کاتی جیهاد نەهاتووە. ڕاست نییە و هەڵەیە ئەگەر هەر کەسێك یەك ئەندازە ئینصافی تێدا بێت دەزانێ ئەم فەرموودەیە ئەو گومانە پوچەڵ دەکاتەوە کە بووە بە هۆی سارکردنەوەی هەزاران گەنجی خوێنگەرم لەم جیهانەدا]. **ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لا تزال طائفة من أمتي ظاهرين على الحق لا يضرهم من خالفهم إلى يوم القيامة))**،[1] [وفي رواية: ((ولا تزال عصابة من أمتي يقاتلون على الحق ظاهرين على من ناوأهم إلى يوم القيامة)).] **واتە: بەردەوام کۆمەڵێك لە ئوممەتەکەم سەرکەوتوون لەسەر حەق و ڕاستی، هەرکەسێك پێچەوانەیان بکات زەرەریان پێناگەیەنێت هەتا ڕۆژی دوایی.** [لە ریوایەتێکی تردا هاتووە: بەردەوام کۆمەڵێك لە ئوممەتم شەڕ دەکەن لەسەر حەق و سەرکەوتوون بەسەر هەرکەسێکدا کە دوژمنایەتییان بکات هەتا ڕۆژی قیامەت].

**بەڵێ غەیری ئەم فەرموودانەش چەندین فەرموودەی تر هەیە کە ئەهلی سوننە و جەماعەت کۆن لەسەری کە ئەوە دەسەلمێنن: جیهاد کردن ڕووبەڕووی هەرکەسێك کە حەقی ئەوەی هەیە جیهادی لە ڕووی بکرێت ئەگەرچی ئەمیرەکان باش بن یان گوناهبار و فاجیر بن.**

[ئیمام تەحاوی لە (العقيدة الطحاوية)دا ئەفەرموێت: (والحج والجهاد ماضيان مع اولي الأمر من المسلمين، برهم وفاجرهم إلى قيام الساعة، لا يبطلهما شيء ولا ينقصهما). واتە: سەردانی ماڵی خوا (حەج) و جیهادکردن بەردەوامن لەگەڵ ئەمیری موسڵمانان چاك بن یان گوناهبار، هەتا ڕۆژی قیامەت، پووچەڵیان ناکاتەوە و هیچ شتێك نوقسانیان ناکات. لەشەرحی ئەم مەتنەدا دەفەرموێت: چونکە حەج و جیهاد دوو فەرزن لکاون بە سەفەرەوە واتە

پەیوەندییان بە سەفەرەوە هەیە، کەواتە پێویستی بە بەڕێوەبەرێك هەیە بیانبات بەڕێوە و بەرامبەر دوژمن بوەستێت ئەمەش چۆن بە ئیمامێکی دادپەروەرو چاك دەکرێت بە هەمان شێوە بە ئیمامێکی فاجیریش دەکرێت].[١]

**بەڵێ ئەمە لەگەڵ ئەوەشدا کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی و هەواڵی داوە: (بانه سيلي أمراء ظلمة خونة فجرة فمن صدقهم بكذبهم وأعانهم فليس مني ولست منه، ولا يرد على الحوض، ومن لم يصدقهم يكذبهم ولم يعنهم على ظلمهم فهو مني وأنا منه وسيرد على الحوض). واتە: لەمەودوا کۆمەڵێ ئەمیری زوڵمکەر و خیانەتکار دێن، هەرکەسێ درۆکانیان بەراست بزانێت ویارمەتییان بدات ئەوە لە من نییە و منیش لەو نیم واتە پێغەمبەری خوا ﷺ وە لەسەر حەوزەکە پێم ناگات.[٢] هەرکەس درۆکانیان بەراست نەزانێ و یارمەتیان نەدات لەسەر زوڵمەکەیان ئەوە لە منەو منیش لەوم و لەسەر حەوزەکەش پێم ئەگات.**

**کەواتە ئەگەر پیاوی موسڵمان جوان بکۆڵێتەوە و ئاگادار بێت بەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردووە کە جیهادکردنە هەتا رۆژی دوایی و بەردەوامە، بشزانێ بەوەی کە بەرهەڵستی لێ کردووە لە یارمەتیدانی زاڵم و تاغوت لە زوڵمەکانیاندا، چاك بۆی روون دەبێتەوە و دەزانێت کە رێگەی دادپەروەری بریتییە بەس لە دینی خوا کە ئیسلامە و جیهادکردنە رووبەڕووی هەر تاغوتێ کە مافی ئەوەی هەیە، جیهاد رووبەڕووی بکرێت.**

**ئەگەر دەڵێن موجاهیدین نوشتە دەکەن، تۆ نوشتە مەکە، ئەگەر دەڵێن جگەرە دەخۆن تۆ جگەرە مەخۆ، ئەگەر دەڵێن تلیاك دەخۆن تۆ تلیاك مەخۆ، ئایا زۆریان لێ کردووی؟!!**

---

[١] مختصر شرح العقيدة الطحاوية، ص١٠٣.

[٢] ئەو حەوزەی کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت لە هەنگوین شیرینترە لە شیر سپی ترە لە بەفر سارد ترە، سەیری (العقيدة الطحاوية، ص٢٨) بکەو ئەم فەرموودەیە لە (صحيح مسلم)دا هەیە.

[ئەوەی تۆ دەتەوی بیکەیت بە بەڵگە و واز لە جیهادی بەرزترین پلەی ئیسلام بهێنی بەراستی ئەمە فەتوایەکی فاسد و خۆپاراستنێکی بێ هێزە بەهۆی کەمی عیلم، بەڵکو هەر لە نەبوونی عیلمەوە دروست بووە.

بەڵێ ئەی برای ئازیزم ئەمە گوفتاری پێغەمبەری خوامان ﷺ هێنایەوە، ئەمە قسەو گوفتاری زانایانی وەك ئیبن تەیمیە و هاوچەشنانی ئیبن تەیمیەمان هێنایەوە ئیتر بە چی قەناعەت دەکەیت؟ هەر بەردەوام دەبی لەسەر قسەی مامۆستاکەت کە (قل و فل) لەیەك جودا ناکاتەوە؟ هەر بەردەوام دەبی و واز لەو گوفتارەی پێغەمبەری خوا ﷺ دینێ، ئەی سبەینێ لەناو گۆڕی تەنگو تاریکدا چۆن وەڵام دەدەیتەوە کە بەرزترین پلەی ئیسلامەتیت ئەنجام نەداوە کە بریتیە لە جیهاد؟!!] ئەو هەموو کەراماتەی خوای گەورە بە موجاهیدینی بەخشیوە بەڵگە نییە لەسەر راستی و پاکی دڵ و دەروون و کردەوەیان.

چۆن ئەو کۆمەڵەت نابینی بە چاوی خۆت کە هەرچی تەیارە و دەبابەی رووسیای موجریم هەیە لەبەر دەمیاندا ڕادەکەن هەروەك مشك لەبەردەم پشیلەدا ڕادەکات یان وەکو کەری وەحشی لەبەردەم شێردا ڕادەکات.

ئایا ئەمە ڕێزی خوایی نییە بۆ موجاهیدین؟!!!

وتم بە ئەبو ئەسید باسی ئەو کەراماتانەم بۆ بکە کە بە چاوی خۆت بینیوتن؟ وتی: ئەی شێخ عبدالله ئەگەر لەو کەراماتانەت بۆ باس بکەم بەراستیان نازانیت بە تەئکید و بە چاوی خۆم بینیم موجاهیدێك (ئاڕ بی جی)یەکی بەرکەوت . کە ئاڕبیجی دەبابە دەسووتێنێت و پۆڵا ئەتوێنێتەوە . کونێکی کردە کراسەکەی و جانتای فیشەکەکانی فڕێ دا بێ ئەوەی هیچ برینێکی لێ بکەوێ؟!! چەندین کەس لەو موجاهیدانە ئەم حاڵەتەیان بەسەردا هاتووە...

بە راستی موجاهیدان لەهەر پارچەیەکی ئەم زەویەدا بن لەسەر هەقن و ئەمەش بەڵگەیە لە دینی خواوە کە دەبێت جیهادی ئیسلامی هەر بەردەوام بێت، إن شاء الله.

ئەو کەسانەی کە گومانی ژەهراوی دروست دەکەن و بەرهەڵستی خەڵکی دەکەن لە یارمەتیدانی موجاهیدانی ئیسلام ئەوانە با لە خوای گەورە بترسن با شەرم لەو مەلائیکانە بکەن کە بەسەری لای راست و چەپیانەوەن والله یەکێك بۆی گێرامەوە وتی: چووم بۆ لای یەکێك لە بازرگانەکان کە هەموو ساڵێك ٣ ملیۆن ریاڵ بۆ جیهادی ئەفغانی دەنێرێ، چووینە لای و پێمان وت بەشەکەی جیهادی ئەفغانیمان دەوێت . بەشی ساڵانە . بازرگانەکە وتی: والله کۆمەڵێك گەنج هاتن بۆ لام و وتیان درۆیە ئەفغان هیچ کەسێکی تێدا نییە کە جیهادێکی راست بکات هەموویان بیدعە دەکەن ئیتر لە کۆتاییدا وتی وازم لێ بهێنن و ئیزعاجم مەکەن دەمەوێ بینێرم بۆ ئەفریقا نایینێرم بۆ ئەم و ئەو.

گەنجێك لە گەنجەکان لە یەکێك لە مزگەوتەکانی (ریاض)دا دوای نوێژی بەیانیان وەستاو وتی: ئەی خەڵکینە زەکاتیماڵەکەتان بە ئەفغان مەدەن، چونکە موشریکن و هەتیوباز و نێربازن، لەناو مزگەوتدا، لە دوای نوێژی بەیانی! پێش تەسبیحات! توخوا رێگرتنێك لە رێگەی خوا لەمە گەورەترە،[1] [﴿ هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُواْ عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّواْ ﴾ (المنافقون: ٧) واتە: ئەو دووڕووانە ئەوان بوون کە دەیانوت یارمەتی ئەوانە مەدەن لەگەڵ پێغەمبەرن هەتا لێی دووركەونەوە].[2]

با لە خوا بترسن ئەو کەسانەی کە گاڵتە و درۆ بە ناموسی ئەو موجاهیدانە دەکەن، ئەو موجاهیدانەی کە خوای گەورە یاسای ئیسلامی پێ پاراستن و و کردنی بەهۆیەك بۆ سەربەرزی ئیسلام و موسڵمانان، ئەو موجاهیدانەی کە بەسەری شەهیدەکان پردێکی گەورەیان دروست کرد بەرامبەر ئەو لافاوە پیسە چەپەڵەی کە رووس دەیویست جیهانی ئیسلامی داگیر بکات. والله یەکێك هات بۆ لای (جلال

---

[1] لە کوردستانەکەی خۆشمان لەم جۆرە زۆر هەبوون و ئێستاش هەن کە بەردەوام خەنجەری ژەهراوی لە پشتی ئەم کاروانە جیهادییە دەدەن. (سەردار)

[2] ئەمە مەبەستی عبدالله کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بووە.

**الدين حەقانی) جەلالەدین لەو کاتەدا خۆی لەناو شەڕدا بوو ملیۆنێ روپیەی پێبوو و ملیۆنە روپیەکەی هەڵگرت و بردییەوە بۆ میران شاه وتیان ئەوە چی دەکەی بۆ کوێ دەڕۆی فلانە کەس؟ وتی بەراستی جەلالەدین حەقانی بیدعەو شیرکیاتی لا هەیە!! وتیان چی بووە؟! وتی: دایکم بینیوە نوشتەی هەڵگرتووە، بەڵێ ئەو جەلالەدینە کە قومبەلەیەك لە ژێر قاچییەوە تەقیوەتەوە هیچ ئازاری پێنەگەیشتووە، والله کراسی برایەکم لایە کە ناوی ئیبراهیمە بە سووتاوی، بەلام خۆی بریندااریش نەبووە، ئەو جەلالەدینەی کە ئەمە ١٠ ساڵە بەردەوام لە شەڕدایە هەر ئەمە نوشتەیەکی بینیوە بە دایکی کە عومری ٥٠ ساڵە پارەکەی نەدایە و گەڕاندییەوە!** [خودا تۆڵەتان لێ بستێنێ ئەمە سەلەفیەتە؟ ئەوە سوننەت جێبەجێ کردنە؟ لە کۆتایی ئەم باسەدا پێمخۆشە گوفتارێکی ئیمام ئەحمەد زیاتر دڵمان بۆ باسەکە بکاتەوە کە پرسیاریان لێ کرد "عن الرجلين يكونان أميرين في الغزو، وأحدهما قوي فاجر والآخر صالح ضعيف، مع أيهما نغزو؟ فقال: "أما الفاجر القوي، فقوته للمسلمين، وفجوره على نفسه، وأما الصالح الضعيف فصلاحه لنفسه، وضعفه للمسلمين، فتغزو مع الفاجر القوي". قد قال النبي ﷺ: "إن الله يؤيد هذا الدين بالرجل الفاجر". وروي "بأقوام لا خلاق لهم"[1]. واتە: پرسیاریان کرد لە ئیمام ئەحمەد لەبارەی دوو پیاوەوە کە ئەمیرن لە جیهاددا یەکێکیان فاجیرە، بەلام زۆر بەهێزو ئازایە، یەکێکیشیان زۆر پیاوچاکە، بەلام لاوازە و زۆر بەغیرەت نییە، لەگەڵ کامیاندا جیهاد بکرێت؟ واتە: "کامیان بکرێت بەرابەری شەڕ" ئەویش فەرمووی: فاجیرە ئازاکە ئازاتییەکەی بۆ موسڵمانانە، بەلام فاجیرەکەی بۆ نەفسی خۆیەتی، بەلام پیاوچاکە لاوازەکە چاکیەکەی بۆ نەفسی خۆیەتی و بەلام لاوازییەکەی بۆ سەر موسڵمانانە، با جیهاد لەگەڵ فاجیرەکاندا بکرێت، چونکە پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: خوای گەورە ئەم دینە سەردەخات بە پیاوێکی فاجیر، لە ریوایەتێکدا بە چەند کۆمەڵێك کە هیچ بەشیان لای خوای گەورە نییە].

---

[1] العمدة في إعداد العدة، ص٥٩.

## چاندنی دووڕووان (المنافقون) لە نێوان موجاهیداندا

ئەی برای بەڕێزم بەڕاستی خیلاف هەردەبێ لە نێوان موسڵماناندا گاورو جولەکە هەمیشە ئەمە ئیشیان بووە، دووڕووان (منافقین)یان بە کرێگرتووە بۆ ئەوەی بیاننێرن بۆ ناو موجاهیدان و دووبەرەکی لە نێوان موجاهیداندا دروست بکەن، بۆ ئەوەی گومان و دوودڵی بخەنە ناو موجاهیدانی ئیسلام!! تۆ دەتەوێ نیو ملیۆن موجاهید دە هەزار دووڕووی تێدا نەبێت؟ زۆر لە فەرماندەی موجاهیدان یەکێك دێت بۆ لای تەوبە دەکات، نوێژ دەکات و گوێڕایەڵی دەبێت، جیهادیشی لەگەڵ دەکات تاوەکو ساڵێك یان دوو ساڵ هەتاوەکو ڕۆژێك زەفەری پێ دەبات و دەیکوژێت و دەڕوات بۆ لای ئەو کەسەی دروستی کردوە بە ویستی خۆی پارەو پولی پێ دەدا، بۆ نموونە یەکێك لەو فەرمانده بەڕێزانەی بەم شێوەیە کوژرا ناوی (شێخ عبدالغنی) بوو گەنجێك لە تەمەنی ١٩. ٢٠ ساڵیدا بوو کوشتی، بەشەرتێك هەتاوەکو ساڵێکیش جیهادی لەگەڵدا کرد، هەتا ڕۆژێ بۆی رێککەوت و لەناو خەیمەکەیدا شەهیدی کرد. یەکسەر کۆمەڵێ گرتیان و تەحقیقیان لێ کرد خۆی بە زاری خۆی وتی: رووس ناردومی. بەڵێ زۆر لە فەرماندە بەڕێزەکان بەو شێوە ڕۆیشتن و گەیشتن بە خوای خۆیان (ذبیح الله) عبدالودود لە (بەدخشان).

زۆربەی ئەو فەرماندانە بەم رێگە کوژران، بەڵێ ئەمان چووزانن؟! ئەگەر بیانزانیایە کە ئەمانە دووڕوون نەیاندەهێڵا لایان بمێننەوە.[1]

بەڵێ ئەی برای بەڕێزم ئەی سوپاکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دووڕووی تێدا نەبوو؟ ئایا سێ یەکی جەنگاوەرانی ئوحود نەگەڕانەوە؟ [جا ئێستا چەند نموونەیەکی ڕۆشن لە ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ دێنینەوە هەتاوەکو بۆمان بسەلمێت کە هەتا ڕۆژی قیامەت لەناو هەموو کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی هەر دەبێ دووڕووی تێدا بێت، بەڵام ئەوەی مەبەستە

---

[1] برای سەرکردەی مەیدانی سعودی (خطاب (سیف الاسلام))یش بەم شێوەیە تیرۆر کرا، لە دوای ١٥ ساڵ جیهاد کردن. (سەردار)

لێرەدا بیزانین ئەوەیە کە بوونی ئەو دووڕووانە و کرداریان نابێت ببێتە هۆیەك وا لە ئێمە بکات لە جیهاد سارد ببینەوە].

**نموونەی یەکەم: لە شەڕی (بنو المصطلق ـ غزوة المریسیع)** ﴿ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ ﴾ **(المنافقون: ٨). واتە: مونافیقەکان دەیان وت: ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە دەسەڵاتدارمان بێ دەسەڵات دەرئەکات.** [ئەم ئایەتە لەسەر (عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول هاتە خوارەوە کە گەورەی دووڕووەکان بوو، ئەمە مەبەستی بە (الأعز) دەسەڵاتدار واتە خۆی و بێ دەسەڵاتیش پێغەمبەری خوایە ﷺ.

لە شەڕی (بنی المصطلق) دوو منداڵ یەکێکیان لەئەنصار و ئەویتریان لە موهاجرین لەسەر ئاوی (المریسع) لەسەر ئاو بوو بە شەڕیان یەکەمیان هاواری کردە کۆچەریەکان و دووەمیان هاواری کردە یارمەتیدەرەکان. عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولی دووڕوو گوێی لەم هاوارە بوو چوو خۆی پێنەگیراو دەستی کرد بە قسەی ناشیرین و وتی: های های بەراستی دەیانەوێت لە شاری خۆشماندا نەفرینمان لێ بکەن و تەنگمان پێ هەڵچنن، مەبەستی ئەوەبوو ئەنصارەکان لە موهاجیرەکان هەڵنێ، وتی: بەراستی ئەمە هەروەکو چۆن پێشینەکان وتوویانە: "سيء كلبك يأكلك" واتە: سەگی خۆت قەڵەو بکەو کەچی بشتخوات" والله ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە دەبێ دەسەڵات دارەکان بێ دسەڵاتەکان دەربکەن، ئینجا ئاوڕی دایەوە بۆ لای ئەوانەی لە لایدا بوون وتی: بەراستی ئەمە خۆتان بوون واتان لە خۆتان کردو ماڵتان لەگەڵ دابەش کردن و هێنانتاننە شاری خۆتانەوە ئەگەر ئێوە شتتان پێنەدانایە ئەوە دەچوون بۆ شارێکی تر. لەم کاتە، "زەیدی کوڕی ئەرقەم" کە منالێك بوو لەوێ بوو، چوو گێڕایەوە بۆ پێغەمبەری ﷺ، عومەری کوڕی خەتتاب لەوێ بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا فەرمان بە کوشتنی ئەو مونافیقە بکە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: شتی وا نابێ، ئەگەر من بیکوژم خەڵکی دەڵێن موحەممەد یارەکانی خۆی دەکوژێت. کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە بۆ مەدینە کوڕەکەی عەبدوڵڵای کوڕی سەلول زۆر مسوڵمانێکی چاك بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بیستوومە دەتەوێت کوڕی سەلول بکوژیت، ئەمرم پێ بکە با بچم

خۆم سەرەکەیت بۆ بهێنم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: نەو، نایکوژین، بەڵکو هەتا لە ناومانا دەژی بە جوانی و نەرم و نیانی لەگەڵیدا دەجولێینەوە، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە بۆ دەرخستنی راستی هەواڵەکەی زەیدی کوڕی ئەرقەم.[1] بەڵی ئەی برای مسوڵمانم سەیر بکە چەند خیانەتیان دەکرد بە ئاشکرا، بەڵام یارەکانی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ کەسیان نەیاندەوت واز لە جیهاد دێنم، چونکە عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولمان تێدایە].

**نموونەی دووەم: لە شەڕی (الأحزاب ـ خندق)یشی پێدەوترێت:** ﴿ وَإِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا ﴾ **(الأحزاب: ١٢) واتە: بیری ئەوە بکەرەوە، کاتێك دووڕووەکان ئەوانەی کە لەناو دڵیاندا نەخۆشی هەبوو دەیان وت: هەرچی پەیمانێك کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ پێیان داین هەمووی لە خشتە بردن بوو.** [تەنانەت یەکێکیان دەی وت: (محمد يعدنا بقصور كسرى و قيصر ونحن لا نستطيع أن نخرج نقضي حاجتنا) واتە: محمد پەیمانی قەصرەکانی کیسراو قەیسەرمان پێ دەدا لە کاتێکدا ئێمە ناتوانین بچین بۆ سەر ئاویش].

**نموونەی سێیەم: شەڕی تەبووك، بەڵێ ئەی مسوڵمانانی خۆشەویست دوایین شەڕ کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامی دا چ شەڕێك بوو؟ شەڕی تەبووك بوو لە ساڵی ٩ی کۆچیدا رووی دا** [بەڵێ دووڕووەکان هەروەك کاری هەمیشەیی ژەهراوی خۆیان لەم شەڕەدا چەندین ئیشی نابەجێیان ئەنجامدا هەر لە سەرەتای دەرچوونی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵێکی جوولەکەدا کە ناوی "سویلم" بوو هەموویان کۆبوونەوە و دەیانویست خەڵکی لە جیهاد سارد بکەنەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم جارەیان نەیویست وەك جارەکانی تر بە نەرمی لەگەڵیاندا بجولێنەوە، بۆیە "تەڵحەی کوڕی عەبدوڵلا"ی لەگەڵ کۆمەڵێکدا ناردو

[1] ئەم باسە دوورو درێژە بە کورتی هێناومە لە هەموو بەڕاوەکانی سیرەدا بە درێژیی باس کراوە سەیری کتێبی ـ الرحيق المختوم ـ بکە ص٣٠٥، صفوة التفاسير، م١، ص٥٦٨.

وتی: ماڵەکەیان بەسەردا بسووتێنن، ئەوانیش چوون ئاگریان بەردایە ماڵەکەیان و رایان کرد تا تەمێ بوون و ضەحاکی کوڕی خەلیفە لە بانەوە بازی دا و قاچی گێڕ بوو].

**بەڵێ ئەمە لە سەرەتای شەڕەکەوە. لە کاتی گەڕانەوەشدا بەهەمان شێوە کۆبوونەوە بۆ ئەوەی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ بکوژن، دەیانویست فێڵی لێ بکەن هەتاوەکو حوشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەوێتە دۆڵەکەوە و بیکوژن.** [بەلاّم ئەوەبوو خوای گەورە پلانەکەیانی پووچەڵ کردەوە و ئەو ئیشە ژەهراویەی کە دەیانویست بیکەن بۆیان نەبرایە سەرو ئەو کەسانەی کە ئەو پیلانەیان کرد پێغەمبەر ﷺ ناوەکانی یەکە یەکە هەڵدا بۆ حوزەیفە - خوای لێ رازی بێ - وتی بیشارەوە ناوەکانیان لای کەس مەیڵێ. بەڵێ ئەمە چەند نموونەیەك بوو لە ئیشی نابەجێی ئەو دووڕووانە کە خۆیشیان بە موسڵمان دەدایە قەڵەم، بەلاّم سەیر دەکەی هیچ یارێکی پێغەمبەر ﷺ بیانووی ساردو سڕی نەدەهێنایەوە و بڵێ لەبەر ئەوەی ئەم مونافیقانە لەناوماندا هەن من جیهاد ناکەم، نەخێر بەڵکو هەتاوەکو ئەو رەفتارە ناشیرینیانەیان پێوە دەبینین زیاتر بەردەوام دەبوون لەسەر جیهاد]. **لە خوا بترسن لە دڵ و دەروونتاندا، لە خوا بترسن لەوەی کە قسەی بێسەرو بنە دەربارەی ئەم جیهادە بکەن.**

**من وا گومان دەبەم - خواش چاکتر دەزانێ - بەراستی ئەم جیهادە جیهادێکی ئیسلامییە، ئێستا نموونەی نییە لە سەر زەویدا... بەڵێ نموونەی نییە بەم ناڕەحەتییەو بەم یارمەتییە خواییە، ئێمەش داوا دەکەین لە خوای میهرەبان کە بە جیهاد و شەهیدی رێزمان لێ بنێ لەسەر خاکی ئەفغانستان ئەو خوایەی کە زانایە و بیسەرە و لێمانەوە نزیکە بە عیلمەوە، هیوامان وایە إن شاء الله کە خوای گەورە لە ئەفغانستان سەرکەوتنمان پێ ببەخشێ لە دوای ئەفغانستانیش بەرەو بەیتولمەقدیس بکەوینەڕێ و لە ژێر چەپۆکی جولەکەی پیسدا رزگاری بکەین. ئامین.**

## تێگەیشتن لەناو ئەم جیهادەدا (الفقه في هذا الجهاد)

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ مَا كَانَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ الْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُوا عَن رَّسُولِ اللَّهِ وَلَا يَرْغَبُوا بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَطَئُونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ الْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِ عَمَلٌ صَالِحٌ ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ (١٢٠) وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةً صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً وَلَا يَقْطَعُونَ وَادِيًا إِلَّا كُتِبَ لَهُمْ لِيَجْزِيَهُمُ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (١٢١) ۞ وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً ۚ فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَائِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ (١٢٢) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قَاتِلُوا الَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ الْكُفَّارِ وَلْيَجِدُوا فِيكُمْ غِلْظَةً ۚ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ (١٢٣) ﴾ **(التوبة: ١٢٠ – ١٢٣)**

**نەوەکان پێویستیان بە نموونە هەیە:**

[ئەم ئایەتە لە کۆتایی سورەتی تەوبەدایە، ئەو سورەتەی کە یاسای جیهاد و شەڕ لەگەڵ بێ باوەڕاندا بە جوانی ڕۆشن دەکاتەوە، ئەو سورەتەی کە ئاشکرای کرد بەبێ پەردە کە جیهاد فەرزێکە لە فەرزەکانی خوای گەورە، ئاشکرای کرد کە دەبێ خۆت قوتار بکەی لە هەموو بێ باوەڕێك و خۆشت نەوێ ئەگەرچی باوك و براشت بێت، ئەو سورەتەی کە روونی کردەوە موسڵمانی راستەقینە دەبێ خۆنەویست بێ، دەبێ جیهاد لە ژن و منداڵ و باوك و براو کاسبی و خانوو عەشیرەت خۆشتر بوێ. بەڵێ سڕی دووڕووەکانی دەرخست کە بۆچی جیهاد ناکەن، با بچینە خزمەتی کە دەفەرموێت:] ﴿ مَا كَانَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ الْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُوا عَن رَّسُولِ اللَّهِ ﴾ **واتە: شایستە نەبوو بۆ خەڵکی مەدینە و بۆ ئەو کەسانەی کە وان لە دەوروبەری ئەوانە لە خەڵکی لادێکان لە پێغەمبەری خوا ﷺ دوابکەون "واتە تەبووك". ئەم ئایەتە هەڕەشەیەکی شاراوەیە و تێکوتاندنێکە**

بۆیان، مەبەستی لەوەیە، چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێ دێڵن دەرچێ بۆ شەڕو ئێوەش لەناو ماڵی خۆتاندا بن؟ ئەوە شەرم لە نەفسی خۆتان ناکەن؟ ئەوە شەرم لە خوا ناکەن؟ ئەوە شەرم لە پیاوەتی خۆتان ناکەن! چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێ دەهێڵن لەناو ئەو گەرمایە بیابان و ناو گەرمای چەوو خۆڵی دەشتی (تەبووك)دا؟ لە ژێر تینی تیشکی خۆردا؟!!!

هەروەکو چۆن ئەبو خەیسەمە فەرمووی: "أبو خيثمة في ظل ظليل، وماء بارد، ورسول الله ﷺ بالحر والضحى... هذا ليس بالنصف - ليس هذا بالعدل - والله لا أدخل عريشا حتى ألحق برسول الله ﷺ". واتە: ئەبو خەیسەمە لەناو سێبەری خۆش و لەلای ئاوی سارددا بێت و پێغەمبەریش ﷺ لەناو گەرمایی و تینی خۆردا بێت، بەراستی ئەمە دادپەروەریی نییە، قەسەم بە خوا ناچمە ناو هیچ کەپرێکەوە هەتا ئەگەم بە پێغەمبەری خوا ﷺ.

ئایا ئێوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ چاکتر و بەرزترن وا خۆتان لە جیهاد دەشارنەوە؟ ئەو زانایەی لەسەر زەویدا بانگەوازی ئەوە دەکات کە لە پێغەمبەری خوا ﷺ گەورەترە و یان لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئیستیفادەی زیاترە بۆ کۆمەڵگاکەی با ئیشارە بە پەنجەی دەستی بکات. ئەو زانایەی کە بانگەوازی ئەوە دەکات کە بوون و مانەوەی باشترە لەناو کۆمەڵگاکەیدا و ئەوە دەکات بە بیانوو بۆ ئەوەی جیهاد نەکات ئێمە پێی دەڵێین ئایا شاری مەدینە پێویستی بە پێغەمبەری خوا ﷺ نەبوو؟ ئەو پێغەمبەرەی ﷺ کە دینەکەی فێری ئوممەت کرد، ئەو پێغەمبەرەی ﷺ کە هەمیشە لە ریزی پێشەوەی جیهاددا بووە، ئەو پێغەمبەرەی ﷺ کە خۆی دەهاویشتە ناو کوشتن و برینداربوونەوە و دەمی خوێنی لێ دەتکا بە هۆی شکانی ددانەکانییەوە لە ئوحوددا، [ئەو پێغەمبەرەی ﷺ کە ئیمام عەلی لە بارەیەوە دەفەرموێت: لە رۆژی ئوحوددا نزیکترینمان بووە لە کافرەکانەوە هەتاکو وای لێهات ناوچاوی پیرۆزی پڕبوو لە خوێن بەجۆرێك خوێنەکەی نەدەوەستایەوە، (عەلی و فاتیمە) ئاویان پێدا دەکرد هەر نەدەوەستایەوە هەتاوەکو پارچە حەسیرێکیان هێناو کردیان بە

خۆڵەمێش و دایان بە ناوچاویەوە هەتا خوێنەکەی وەستایەوە. لەو کاتەدا خوێنەکەی لەناوچاوی خۆی دەسڕی و دەیفەرموو: (کیف یفلح قوم خض وجه نبیهم) واتە: گەلێك چۆن سەردەکەون ناوچاوی پێغەمبەرەکەی خۆیان خوێناوی کرد؟] ئێستا دەڵێن فلانە کەس یان فلانە زانا نەیەت بۆ جیهاد، چونکە کۆمەڵگا پێویستی پێیەتی، نەخێر... بەراستی جیهاد پێویستی پێیەتی وەك پێویستی کۆمەڵگاکەی، واتە جیهاد زیاتر پێویستی بە زانایان هەیە و پێویستی جیهادەکە گەورەترە.

بەراستی نەوەکان پێویستیان بە نموونە هەیە تاوەکو بیکەن بە بەرنامەیەك و خەڵکی چاوی لێ بکات هەتا رۆژی دوایی و لەسەری بڕوات، پێویستی بە کردەوەی خۆنەویستانە هەیە هەتا خەڵکی هەنگاوی بەدوادا بنێن، بەڵێ لەبەرئەمەیە ئێستا ئێمە کە باسی جیهاد دەکەین یەکسەر دەڵێین: حەمزە وای کرد و موصعەب وای کرد، موعازی کوڕی جەبەل وای کرد، موسەناو قەعقاع وایان کرد، ئەی بۆ ناڵێن فلانە زانا وای کرد، فلانە داعی وای ئەنجام دا؟! ئازایەتی فلانە کەس بوو؟ بۆچی بەس چیرۆکی یارانی پێغەمبەری خوا ﷺ و پێشینانمان لایە؟ لەبەرچی ئەم چیرۆکانە نموونەیان تازە نابێتەوە؟!!! بەڵێ ئەگەر زانایان تازەی نەکەنەوە ئیتر کێ تازەی بکاتەوە؟ ئەوانە تازەی بکەنەوە کە بە دوای تیکەیەك ناندا دەگەڕێن هەر لە بەیانییەوە دەڕوات دوای عیشا دێتەوە بۆ ئەوەی کولێرەیەك بۆ خێزانەکەیان پەیدا بکات؟!!!

زاناکان، بانگەوازکارەکان، ئەوانەی کە شارەزان لە دین و تێگەیشتوون، لێپرسینەوەیان لەلای خوای گەورە زیاترە، "داماوی و رووزەردی بۆ ئەوەی کە عیلمی نییە یەکجار، بەڵام حەوت جار داماوی و رووزەردی بۆ ئەوەی کە عیلمی هەیە و کردەوەی پێ ناکات".

ئەو کەسەی کە زانایە وەك ئەوە نییە کە نەزانە، لێپرسینەوە لە رۆژی قیامەتدا بە ئەندازەی زانینە، واتە: لێپرسینەوەی خەڵکی لە رۆژی قیامەتدا بە ئەندازەی زانیارییەکەیانە. ئەگەر نەزانێك لە جیهاد دابنیشێت و زانایەکیش دابنیشێ ئەوە

**گوناهی زاناکە چەندین جار ئەوەندەی گوناهی نەزانەکەیە... چونکە بە دانیشتنی زاناکە خەڵکانی تریش دادەنیشن و سارد دەبنەوە و هەر سەیر دەکەن. پاشان ئایەتەکەی دواتر دەفەرمویٚ:** ﴿ وَلَا يَرْغَبُوا۟ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ ﴾ **واتە: نابیٚ خۆیان بەرز بکەنەوە لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ واتە: نابیٚ پێی ناخۆش بێت لەو شوێنەدا بێت کە پێغەمبەری خوای ﷺ تێدایە.** [بەڵکو دەبیٚ چییان بۆ نەفسی خۆیان پێناخۆشە ئاواش بۆ پێغەمبەری خواش ﷺ پێیان ناخۆش بێت، نەك بە پێچەوانەوە بۆ خۆیان پێیان ناخۆش بێت و بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ پێیان خۆش بێت.

بەڵیٚ خوای گەورە لێرەدا دەیەوێت موسڵمان هەمیشە بیری لە نارەحەتی موسڵمانان بێت، لەکاتێکدا بینی موسڵمانان لە ناخۆشیدان ئەویش بڕوات بەشداری ناخۆشیەکەیان بێت یارمەتییان بدات، نەك موجاهیدان لەناو تەپو تۆزی جیهاددا بن بە برسێتی ئەویش بڕوات لە ماڵی خۆیدا دابنیشێت و بڵێ: کاتی جیهاد نەهاتووە. تەنانەت خەڵکی سارد بکاتەوە بە خۆیەوە] **بەڵی بۆچی ئایەتەکە تەوجیهات دەکات، چونکە** ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَطَـُٔونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ ٱلْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِۦ عَمَلٌ صَـٰلِحٌ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ **واتە: لەبەرئەوە ئەوان نایەت بەسەریاندا تینویەتی یان ماندوویەتی یان برسێتی لە جیهاددا و هەنگاو نانێن بەسەر جێگە هەنگاوێکدا کە بیٚ باوەڕان رقیان لیٚ دەبێتەوە پێی** [ئیبن کەسیر دەفەرمویٚ: مەبەستی ئەوەیە لە شوێنێکدا دانابەزن کە دوژمن بترسێنیٚ. لە دوژمنەکانیان تووشی هەر شتێك ببن وەك کوشتن و برینداری و ئەسیری، ئەگەرچی یەك فیشەکیشیان بۆ بتەقێنیٚ مەگەر بۆیان دەنووسریٚ بەهۆیەوە پاداشتی کردەوەیەکی باش، بە راستی خوای گەورە پاداشتی چاکەکاران بە زایە نادات.

بەڵیٚ ئێستا ئەی موجاهید بەپێی ئەم ئایەتە تۆی بەڕێز هەر لە شوێنێك بیت کردەوەی چاکت بۆ دەنووسریٚ، چونکە ئەو شوێنەی تۆ بیٚ باوەڕان ڕقیان لیٚ دەبێتەوە و لێی

دەترسن، کەواتە: ﴿ وَلَا يَطَـُٔونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ ٱلْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِۦ عَمَلٌ صَـٰلِحٌ ﴾].

**زۆرجار (قتال) لكاوە بە (فى سبيل الله)وە و وشەی (فى سبيل الله) لەهەر شوێنێكدا لە قورئان و سوننەتدا هات بە (مطلق)ی ئەوە مانای (قتال) دەگرێتەوە و وشەی (جيهاد)يش هەركاتێك لە قورئان و سوننەتدا بە (مطلق)ی هات ئەوە واتە شەڕ. ئيبن حەجەريش هەروا دەفەرموێت. جيهاد مەبەستی لە دەعوە نييە، مەبەستی ئاگاداركردنەوە نييە، مەبەستی ئامۆژگاری نييە، مەبەستی لە وتاردان نييە، تەنها مەبەستی جيهاد لە قورئان و سونەتدا واتە (قتال)[1].**

## پاداشت لە كاتی جيهاددا

**ئەی برای موجاهيد: ئەگەر لە دەرچوونتان بۆ مەيدانی جيهاد مەبەستتان تەنها رازی كردنی خوای گەورە بێت ئەوە خەوتنتان و ... نان خواردنتان و قسەكردنتان بەشەرتێك قسەی حەڵاڵ بێت و كۆبونەوەتان و دانيشتتان هەر هەمووی فريشتەكانی خوا بە چاكە بۆتان دەنووسێت، چونكە تۆ بۆ رازی كردنی پەروەردگار دەرچوويت، ئەگەر قەدەری خوای گەورەش وای دانابوو مردی ئەوە تۆ "شەهيد"ی، بەڵێ ئێستا تۆ بمری شەهيديت، لە هەركوێ مردی؟ بەهەر شتێك يان بەهەر هۆيەكەوە گيانت دەرچوو ئەوە شەهيدی بە سووتان بمری، بە خنكان بمری، بە نەخۆشيی بمری، بە هۆی مەشقی سەربازييەوە بمری، بەهۆی فێربوونی چۆنيەتی شەڕكردنەوە بمری لە شوێنێكی بەرزەوە كەوتيت سەرت بريندار بوو مردی، برايەكت فيشەكێكی لەدەست دەرچێ بەر تۆ بكەوێ و مردی لەم هۆيانە و لەهەر هۆيەكی تردا بمری ئەوە تۆ شەهيدی.**

---

[1] لە باسەكانی تردا بە جوانی ئەم مەسەلەيە روون دەكەينەوە ان شاء الله.

**بەڵێ ئەی برای موجاهیدم ئەگەر فیشەك لە دەستی خۆت دەرچێت و بەرت کەوت مردیت ئەوە هەر شەهیدیت، چونکە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ دەفەرموێت: (من وضع رجله في الركاب فاصلا فوقصته دابته فمات ـ وقصته: رمته ـ أو لدغته هامة ـ يعني: أفعى ـ أو عقرب فمات أو بأي حتف مات. مات بأي موت ـ فهو شهيد وإن له الجنة)[1]. واتە: هەرکەسێ سواری وڵاغەکەی بوو بە نیەتی جیهاد لەو کاتەدا وڵاغەکەی خستیە خوارەوە یان جانەوەرێ گەستی یان دووپشکێك و مرد یان بمرێ بەهەر هۆکارێکی تر ئەوە شەهیدە و بەهەشتی بۆ/هەیە.**

**بەڵێ لەبەرئەوەی تۆ کۆچت کردووە و هاتووی بۆ گیانبازی لە پێناوی خوای گەورە و رازیکردنی، ئیتر بە هەر هۆیەك بمری ئەوە شەهیدی، مردن و کوژران بۆ تۆ یەکێکە.... پاداشتەکەیان هەر یەکێکە** [چونکە تۆ نیەتت هەیە کە گیانی خۆت بدەی بە خوای گەورە، خوای گەورەش دادپەروەرە بە ئەندازەی نیەتەکەی خۆت، هەموو شتێکت پێدەبەخشێ].

**بەڵێ مردن و کوژران بۆ تۆ یەکێکە ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓاْ أَوۡ مَاتُواْ لَيَرۡزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٥٨﴾ لَيُدۡخِلَنَّهُم مُّدۡخَلٗا يَرۡضَوۡنَهُۥۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٞ ﴿٥٩﴾﴾ **(الحج)** [واتە: ئەو کەسانەی کۆچیان کردووە ماڵ و شار و ئەهلی خۆیان بەجێهێشتووە لە پێناوی رێبازی خوادا دوایی کوژران یان مردن ئەوە خوای گەورە رزق و رۆزییان بە تەئکید دەداتێ، رزق و رۆزییەکی باش، واتە: "هەرچی خۆیان حەزی لێ بکەن و چاویان پێی گەش ببێتەوە.. بەراستی خوای گەورە چاکترین رۆزی دەرە، خوای گەورە ئەوانە دەخاتە شوێنێکەوە پێی رازی دەبن][2].

---

[1] حديث حسن رواه أبوداود.

[2] مختصر تفسير ابن كثير، م٢، ص٥٢٢.

**بەڵێ ڕۆڵەی موجاهید، کەواتە مردن و کوژران واتە شەهیدی بۆ تۆ یەکێکە و بۆ خۆت دڵخۆش و ئارام بە، مورتاح بە و هیچ زویر نەبیت، بەلاّم هەر ئەوەیە ئەو کەسانەی کە لە شەڕ دەکوژرێن ئێمە نایان شۆرین و کفنیان ناکەین و نوێژیشیان بەسەرەوە ناکەین، چونکە ڕەفتاری شەهیدیان لەگەڵ دەکرێت.[١]**

**بەڵێ ئێستا تۆ لە مەیدانی مەشقی سەربازییدا ئەگەر فیشەکێکت بەر بکەوێت بمریت شەهیدیت، هەڵسوکەوتی شەهیدت لەگەڵدا دەکەین.**

**بەڵێ لە ڕێی کۆچکردندا بۆ جیهاد بەکرێگیراوانی کافر کوشتیتیان ئەوە ڕەفتاری شەهیدت لەگەڵدا دەکەین، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (فإنه شهيد وإن له الجنة)[٢] بەراستی ئەمەش حەوانەوەیەکی زۆر خۆش و تەواوە.** [بەراستی ئەی برای موسڵمانم ئەوەندەی سەیری قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ، پاشان گوفتار و ڕەفتاری یارانی پێغەمبەرمان ﷺ کردبێت نابنین هیچ کردەوەیەکی تر پاداشتەکەی بگاتە پاداشتی جیهاد کردن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۚ لَا يَسْتَوُونَ عِنْدَ اللَّهِ﴾ (التوبة: ١٩)

واتە: بەشێوەی پرسیار: ئایا ئێوە ئاودان بە حاجییەکان و ئاوەدانکردنەوەی (مسجد الحرام)تان داناوە وەك ئەوەی باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هێناوە و جیهاد دەکات لە ڕێگەی خوادا، بەڵکو وەك یەك نین لای خوای گەورە.

---

[١] بۆیە شەهیدان ناشۆردرێن و نوێژیان لەسەر ناکرێت، چونکە (عن جابر بن عبد الله رضى الله تعالى عنهما قال: "كان النبي ﷺ يجمع بين الرجلين من قتلى أحد في ثوب واحد ثم يقول أيهم أكثر أخذا للقرآن فيقدمه في اللحد ولم يغسلوا ولم يصلى عليهم)) (رواه البخاري: ١٢٧٨). واتە: پێغەمبەر ﷺ دوو کوژراوی ئوحودی کۆکردەوە لەناو کراسێکدا و دەیفەرموو کامیان زۆر قورئانی لەبەرەو پێشی دەخست بۆ لەحەدەکە نەشۆران و نە نوێژیشیان بەسەروە کرا. (اللحد) خۆی لەو کاتەدا قەبرەکە هەڵکەنراوە لەناو قەبرەکەدا بەلای ڕاستەوە چاڵێکی تر هەڵکەنراوە و خراوەتە ناویەوە. (بلوغ المرام من أدلة الأحكام، ص١٣٠).

[٢] روى أبو داود ٢٥٠١ من حديث بقية من فضل الله ـ ضعفه الالباني .

ئیبن کەسیر دەفەرموێت: نوعمانی کوڕی بەشیری ئەنصاری دەفەرموێت: من لەلای مینبەرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بووم لەناو هەندێ لە یارانی، پیاوێکیان وتی: من گوێ نادەم بەوەی کە دوای موسڵمان بوونم هیچ ئیشێ بۆ خوا نەکەم مەگەر ئاو بدەم بە حاجییەکان، یەکێکی تر وتی: بەڵکو ئاوەدانکردنەوەی (مسجد الحرام)، یەکێکی تر وتی: بەڵکو جیهاد لە ڕێی خوادا چاکترە لەوەی ئێوە وتتان. ئیمام عومەر سەرزەنشتی کردن و وتی: لەلای مینبەرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەنگتان بەرز مەکەنەوە "ئەو ڕۆژە ڕۆژی هەینی بوو" من نوێژی هەینیم کرد ئەوە دەچمە لای پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێ دەکەم لەوەی ئێوە ناکۆکن تێیدا، نوعمان دەڵێت عومەر ڕۆیشت ئیتر ئەم ئایەتە دابەزی ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ ... ﴾].[1]

[بەڵێ خوای گەورە لەسەرووی ئاسمانەوە سوڵحی کردن و فێری کردن کە جیهاد لە ئاودانی حاجییەکان و ئاوەدانکردنەوەی ماڵی خواش گەورەترە، چونکە جیهاد دەربەدەری و دوور لە ماڵ و منداڵ و دوور لە وڵات و غەریبی تێدایە، چونکە جیهاد برسێتی و تینوێتی و سەرمای زستان و گەرمای هاوینی تێدایە، چونکە جیهاد برینداری و کوژران و شەو نەخەوتنی تێدایە، بەڵام دانیشتن لەناو سێبەری (مسجد الحرام) و ئاوەدانکردنەوەی چ شتێکی لەمانە تێدایە؟ کەواتە بۆیە جیهادی پیرۆز پلەی گەورەترە، چونکە هەموو ئیشێك پاداشتەکەی بەپێی ماندوبوونە لەو ئیشەدا، چەندە ماندووبیت ئەوەندە پاداشت وەردەگری، هەروەك ئەم فەرموودەیە دەفەرموێت: لە ئەبی هورەیرەوە – خوای لێ رازی بێت – جارێکیان پیاوێك لە یارەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت بۆ دۆڵێك کانیەك ئاوی خۆش و بەتامی تێدا بوو، زۆر سەری سوڕما و وتی: ئەگەر من واز لە خەڵکی بێنم و بێم لەناو ئەم دۆڵەدا بۆ خۆم دانیشم و بمێنمەوە، بەڵام ئەم ئیشە ناکەم هەتاوەکو ئیزن لە پێغەمبەر ﷺ وەربگرم، چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و باسی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (لا تفعل فإن مقام أحدكم في سبيل الله أفضل من صلاته في بيته ستين عاما، ألا تحبون أن يغفر الله لكم ويدخلكم الجنة،

---

[1] نيل الأوطار، ج٧، ص٢٣٦.

اغزوا في سبيل الله من قاتل في سبيل الله فواق ناقة وجبت له الجنة).[1] واتە: نەکەی، چونکە کەمێك لە مانەوەی یەکێك لە ئێوە لە جیهاد گەورەترە لە حەفتا نوێژکردن لە ماڵی خۆیدا، ئایا ئێوە پێتانخۆش نییە خوای گەورە لێتان خۆش ببێت و بتانخاتە بەهەشتەوە، دەی شەڕ بکەن لە ڕێگەی خوا، هەرکەس شەڕ بکات لە ڕێگەی خوا بە ئەندازەی دۆشینی حوشترێك ئەوە چوونە ناو بەهەشت بۆی واجب دەبێت.

ئیمام عوسمان – خوای لێ ڕازی بێت – دەفەرموێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((حرس ليلة في سبيل الله أفضل من ألف ليلة يقام ليلها وصام نهارها)).[2] واتە: حەرەسیاتی شەوێك لە پێناوی خوادا گەورەترە لە هەزار شەو کە شەوەکەی شەونوێژ بکەیت و ڕۆژەکەیشی بە ڕۆژوو بیت.

ئەبوهورەیرە ئەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (لا يلج النار رجل بكا من خشية الله حتى يعود اللبن في الضرع، ولا يجتمع على عبد غبار في سبيل الله ودخان جهنم).[3] واتە: ناچێتە ناو ئاگر پیاوێك بگریەت لە ترسی خوا، هەتاوەکو شیر نەڕواتەوە ناو گوانەکەی، وە کۆنابێتەوە بەسەر بەندەیەکەوە تەپو تۆزی جیهادو دووکەڵی دۆزەخ.

الله اکبر ئەو دۆزەخەی کە خوا پەنامان بدات، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (يؤتى بجهنم يومئذ لها سبعون زمام مع كل زمام سبعون ألف ملك يجرونها) (رواه مسلم) واتە: لەو ڕۆژەدا دۆزەخ دێنن حەوت سەد هەزار قولاپی هەیە، لەگەڵ هەموو قولاپێکیشدا حەوت سەد هەزار فریشتە ڕایدەکێشن. خوایە بۆ خاتری خۆت ئێمە لەم ئاگرە بپارێزی بەراستی ئێمە لاوازین و بەرگەی ناگرین.

بەڵێ ئەو کەسەی دەیەوێت دەمو چاوی لە ئاگری گڕبەگڕی دۆزەخ پارێزراو بێت، ئەوا با بێتە مەیدانی جیهاد، ئەو کەسەی دەیەوێت بە ڕابواردنەکانی ناو بەهەشت بگات با خۆی

---

[1] المستدرك للحاكم ٢٣٢٤ صحيح .

[2] رواه أبوداود، نيل الأوطار، ج٧، ص٢٣٨ ، الحاكم ٢٣٦٤ صحيح.

[3] رواه الترمذي قال أبو عيسى هذا حديث حسن. رياض الصالحين، ص٣٧٩.

بخاتە ناو گڕەی جیهادەوە، ئەو موسڵمانانەی کە دەیەوێت سوننەت جێبەجێ بکات و پاداشتی دەست بکەوێت ئەمەش مەیدانی پاداشت دەستکەوتنە.

هاوار دەکەم ئەی موسڵمانان لە روانگەی ئەم ئایەت و فەرموودانەی پێغەمبەرەوە ﷺ دەردەکەوێت کە "جیهاد گەورەترین پلەی ئیسلامە"، چۆن گەورە نەبێت، کە لە ئەنەسەوە هاتووە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((ما أحد يدخل الجنة يحب أن يرجع إلى الدنيا له ما على الأرض من شيء إلا الشهيد يتمنى أن يرجع إلى الدنيا فيقتل عشر مرات لما يرى من الكرامة)) (متفق عليه). واتە: هیچ کەس نییە بڕواتە بەهەشت و حەز بکات بڕواتەوە دونیا، هەرچی بەسەر زەوییەوەیە بۆ ئەو بێت مەگەر شەهید نەبێت کە تەمەننا و داوا دەکات بگەڕێتەوە بۆ دونیا دە جاری تریش بکوژرێتەوە بەهۆی ئەو رێزەوە کە دەیبینێت.

بەڵێ ئەمانە هەموو فەرموودەی پێغەمبەری خوان ﷺ، وامان فێر دەکەن کە هەمیشە ئاواتەخواز بین بۆ گیانبەخشین لە پێناوی خوادا.

ئەوە عومەیری کوڕی حومامە — خوای لێ رازی بێت — لە کاتێکدا لە شەڕی بەدردا بوون، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەڵسن بۆ بەهەشتێك کە پانتاییەکەی وەك ئاسمانەکان و زەوی وایە، عومەیر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پانتاییەکەی ئاسمانەکان و زەویە؟!! فەرمووی: بەڵێ، عومەیر وتی: "بەخ بەخ"، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چی وای لێ کردی بڵێی "بەخ بەخ"، وتی: نا، سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا مەگەر من ئومێدم هەیە کە ئەهلی ئەو بەهەشتە بم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆ ئەهلی ئەو بەهەشتەی. عومەیریش چەند دەنکە خورمایەك بەدەستەوە بوو لێی دەخوارد و دوایی وتی: من بژیم تاوەکو ئەم خورمایانە بخۆم، بەراستی ئەمە ژیانێکی زۆر درێژە، ئەو خورمایانەی پێ بوو فڕێی دان و دەستی کرد بە کوشتن هەتاوەکو کوژرا.[1] ئەی خۆزگەم پێت ئەی عومەیری بەڕێز، خۆزگەم بەو مژدە خۆشەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دایت و وەك گزنگی بەیان هاتە دی، بەراستی کە سەیری رەفتاری تۆ دەکەم و سەیری خۆم و موسڵمانانیش دەکەم

---

[1] رواه مسلم . رياض الصالحين، ص٣٨.

غەریبی ئیسلامم پێش چاو دەکەوێت، چونکە جاران هەرکەسێ دوابکەوتایە لە جیهاد ئەوە یارەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە مونافیقیان دەزانی، بەڵام ئەمڕۆ هەرکەسێ موجاهید بێ بە گێل و دەشتەکی دەزانن، زۆرجاریش بیستوومانە دەڵێن ئەو ئایەتەی کە باسی جیهادی تێدایە ئەگەر بۆ پاداشت نەبێ نایانخوێنین، چونکە کاتی ئەنجامدانەکەی نەهاتووە، لێرەدا بەس ئەوە دەڵێم ئەگەر ئیمام عومەر بمایە دەیفەرموو: (یا رسول الله ائذن لي أضرب عنقه)].

## حتى لا تكون فتنة

[بەراستی جیهاد کردن و کۆچ کردن بۆ جیهاد واجبێکی هەمیشەییە لە ئیسلام، بەهیچ شێوەیەك لێی جودا نابێتەوە، هەر کۆمەڵە و دەستەیەکیش وازی لێ بهێنێت ئەوە ریشکی داری ئەو کۆمەڵە لەسەر هیچ پارچەیەکی ئەم زەویەدا ناچەسپێت، بەراستی خوای گەورە جیهادی لەسەر موسڵمانان فەرز کردووە نیعمەتێکی هەرە زۆر گەورەیە... بۆچی؟ لەبەرئەوەی ئەم دینە جوانە وەستاوە لەسەر ئەو کۆمەڵە کە جیهاد و کوشتار دەکەن لەسەری و ئەگەر جەنگ و جیهاد بوەستێت و پشتگوێ بخرێت، ئەوا ئەم دینە جوانەش بەسەر خۆیەوە نامێنێ و دەبێتە تۆپی یاری بێ باوەڕان.

بەڵێ کە جیهاد پشتگوێ خراو رەگی دانەکوتا لە ناو دەروونی موسڵماناندا ئەوە ئیتر فەرمان کردن بە چاکەو بەرهەڵستی لە خراپە لە بیر دەکرێت].

**بەڵێ بێ باوەڕان زاڵ دەبن، مزگەوتەکان دەفەوتێنن... هاوەڵ دانان بۆ خوای گەورە بڵاودەبێتەوە، ریشکی ئیسلام دەردێنن، بیروباوەڕی موسڵمانان دەفەوتێنن** [ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٌ﴾. واتە: شەڕیان لەگەڵ بکەن و بیانکوژن هەتا هاوەڵ بڕیاردان نەمێنێ.

ئیبن عەباس دەفەرموێت: "فتنة" واتە "شرك"، ئەمەش سیرەی پێغەمبەری خوا ﷺ شایەتی بۆ دەدات، ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ هەتاوەکو لە مەککەدا بوو خاوەنی هێز و چەك نەبوو، رۆژێك لە رۆژان نەیدەتوانی بتێك بشکێنێت، بەڵام کە کۆچی کرد و هێزی

دروست کرد توانی زۆر بەسەربەرزی بە خۆیی و (١٠,٠٠٠) موسڵمانی شمشێر بەدەستەوە بێتە ناو مەککە و بەدەستی پیرۆزی خۆی ٣٦٠ بتی ناو مەککە بشکێنێت و بە دەنگی بەرز هاوار بکات ﴿ جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَزَهَقَ ٱلۡبَٰطِلُۚ إِنَّ ٱلۡبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقٗا ﴾ ] **خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ إِلَّا تَفۡعَلُوهُ تَكُن فِتۡنَةٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَفَسَادٞ كَبِيرٞ ﴾ **(الأنفال: ٧٣) واتە: ئەگەر ئەنجامی نەدەن ئەوەی فەرمانمان پێ کردوون لە خۆشویستنی موسڵمانان و دابڕین لە کافرەکان، ئەوە فیتنە و بێ ئابڕوویی دروست دەبێت لەسەر زەوی، چونکە لەوەوە بێ هێزی موسڵمانان و بەهێزی کافران پەیدا دەبێت.**[1]

**ئێستا ئیسلام دەپارێزرێ لەسەر هەموو زەویدا بە هۆی فیشەکەوە ئەگەر فیشەك بوەستێت ئەوە کافران زاڵ دەبن، کە زاڵیش بوون ئیتر قبوڵی مزگەوت و قورئان و** [سەرپۆش]... **ناکەن** [چونکە ئەوان دەیانەوێت لە ریشکدا ئیسلامی پیرۆز هەڵکێشن بە هیچ شێوەیەك قبوڵی هیچ دیاردەیەکی ئیسلامی ناکەن].

**ئەوە حاکمی عەدەن کە ناوی (سالم البیض) دەڵێ: "بە هیچ شێوەیەك نامەوێت دەرسی قورئان لە قوتابخانەکاندا بمێنێت، چونکە پێویستمان بە قورئان نییە!!!". قوتابخانەیان دروست کردووە ناویان ناوە "ماوتسی تۆنگ"، قوتابخانەیان دروست کردووە ناویان ناوە (مارکس و لینین) ئەمە بۆچی؟ چونکە "قتال" نییە.** ﴿ وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لَّفَسَدَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ **(البقرة: ٢٥١) واتە: ئەگەر خوای گەورە خراپەی خراپەکاران لانەبات بە جیهادی چاکەکاران ئەوا زەوی تێك دەچێت، چونکە ئەگەر خراپەکاران سەرکەوتن ئەوە کاولکاری و خراپەکاری بڵاودەبێتەوە.**[2] **بەڵام بەراستی خوای**

---

[1] صفوه التفاسیر، م١، ص٥١٦.

[2] صفوة التفاسیر، م١، ص١٥٩.

گەورە خاوەنی نیعمەتە بەسەر جیهانیانەوەکە رێی نەداوە خراپە سەربکەوێت.
[بەڵێ بەراستی خوای گەورە نیعمەتی بەسەر موسڵماناندا و بەسەر تێکڕای جیهانیاندا هەیە کە جیهادی لەسەر فەرز کردوون، بەراستی نیعمەتێکی زۆر نایاب و گەورەیە. ئەی موسڵمانانی قورئانی دە تۆش بیر بکەرەوە، ئیتر هەتاکەی دانیشتن، ئیتر هەتاکەی زەلیلی، ئیتر چەکی شەرەفی جیهاد بۆچی لە شان ناکەی؟!! ئیتر بۆ شەرم لە خوا ناکەی؟!!

چۆن وەڵامی ئەو خوشکانە دەدەینەوە کە لە ژێر زیندانی کافراندا دەناڵێنن و هاوار دەکەن:

**ئێمەی کـــــلۆڵ، ئێمەی زگ پڕ لـــــــــە کۆرپەی زۆڵ**
**فەتوا بدەن خۆ بکوژین، نەك لە پاشان زۆڵ بگرینە کۆڵ**

تو خوا ئەی برای موسڵمان چۆن وەڵامی ئەو خوشکانە دەدەیتەوە؟!!

ئەگەر جیهاد هەبێت، ئیتر خەڵکی دەحەسێنەوە، دڕندە و ناپاکان ئاواتە گڵاوەکانیان نایەتەدی، ئارەزووبازان ئارەزووەکانیان پوچەڵ دەبێتەوە، هەروەك ئیبن تەیمیە دەفەرموێت: خوای میهرەبان بەرنامەیەکی بۆ ئوممەت ناردووەتە خوارەوە لەگەڵ ئەو بەرنامەشدا ئاسنی ناردووە بۆ پارێزگاری لەو بەرنامەیە[1]
هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ ﴾ الحدید: ٢٥.

---

[1] لە شوێنێکی تردا دەفەرموێت: "قوام الدين بكاتب يهدي وبسيف ينصر وكفى ربك هاديا ونصيرا".

## گەورەیی سەرف کردنی ماڵ ئەگەرچی کەمیش بێت

﴿وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةً صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً وَلَا يَقْطَعُونَ وَادِيًا﴾ واتە: هیچ شتێك نادەن لە ڕێی خوادا و هیچ ئەرك و نەفەقەیەك ناكێشن نە بچووك و نە گەورە، ئەوە نووسراوە بۆیان بۆ ئەوەی خوای گەورە پاداشتیان بداتەوە بە جوانترین و گەورەترین پاداشتی ئەوەی کە کردوویانە و بەردەوام بوون لەسەری. [ئەگەرچی ئەوەی کە دەیبەخشن کەمیش بێت لەلای خوای بەبەزەیی گەورەیە]. تۆ کە دە رووپیە دەدەیت لە ڕێگەی خوادا ئەوە گەورەترە لە یەك ملیۆن درهەم کە بازرگانێك لە سعودیە یان ئیمارات دەیدات [چونکە ئەگەر بیست دینارت هەبێت دە دیناری بدەیت ئەوە لە لای خوای گەورە زۆر خۆشەویست ترە لەوەی کە هەزار ملیۆنی هەیە و دەبەخشێت] هەروەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە دەفەرموێت: (ودرهم سبق مائة ألف درهم، أما الدرهم الذي سبق مائة درهم رجل عنده درهمان تصدق بأحدهما أما الذي أنفق مائة ألف درهم فأخذ من طرف ماله او من أرض ماله الكثير) رواه مسلم، واتە: یەك درهەم پێش سەد هەزار درهەم کەوت، ئەو درهەمەی کە پێش سەد هەزار درهەم کەوت، ئەو پیاوەیە کە دوو درهەمی هەیە و درهەمێکی ئەدا بە سەدەقە، بەڵام ئەوەی کە سەد هەزار درهەمی سەرف کرد ئەوە لە بەشێکی ماڵەکەی وەرگرت یان لە زەوی و ماڵە زۆرەکەی. [مەبەستی ئەوەیە ئەوەی یەك درهەمی داوە نیوەی ماڵەکەی داوە، بەڵام ئەوەی سەد هەزار درهەمی داوە لەوانەیە چارەکێکی ماڵەکەشی نەدابێت]، بەهیچ شێوەیەك ئەوەی کە دەیبەخشی بە کەمی مەزانە.... چاك بزانە خوای گەورە ئایەتی نارد بە هۆی دوو کیلۆ و نیو خورمای ئەبو عوقەیل، کە سەرفی کرد لە پێناوی خوای گەورە، بەڵێ دوو کیلۆ و نیو....ئەمە لە کاتی جەنگی تەبووکدا بوو، ئەبو عوقەیل هاتە لای پێغەمبەر ﷺ بۆ شەڕی تەبووك دوو کیلۆ و نیو خورمای ئامادەکردبوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من پێنج کیلۆ خورمام لابوو، دوو کیلۆ و نیوم سەرف کردو دوو کیلۆ و نیوم بەجێهێشتووە بۆ خێزانەکەم، ئیتر لەو کاتەدا موونافیقەکان لاقرتی و گاڵتەیان دەکردو دەیانوت: بەراستی خوا زۆر

**بێ نیاز و دەوڵەمەندە لە دوو کیلۆ و نیو خورما، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ فَيَسۡخَرُونَ مِنۡهُمۡ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنۡهُمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾[1] (التوبة: ٧٩) واتە: ئەو کەسانەی کە عەیب دەگرن لەو موسڵمانانەی کە سەدەقات دەدەن لە ڕێگەی خوادا و ئەو مونافیقانەش کە ڕەخنە ئەگرن لەو موسڵمانانەی کە ماڵی دونیایان دەست ناکەوێ بیدەن مەگەر ئەوەی بە تێکۆشان و ڕەنجی شانی خۆیان پەیدایان کردووە گاڵتەیان پێ دەکەن، ئەوە خوای گەورە گاڵتەیان پێ دەکات و سزایان بۆ هەیە سزایەکی سەخت.**

**بەڵێ قورئان دابەزی لەسەر دوو کیلۆ و نیو خورما هەتا ڕۆژی دوایی دەخوێندرێتەوە، هیچ شتێك بە کەم مەزانە.... بە کەمی مەزانە هەر نەفەقەیەك کە دەیکەیت ئەگەرچی کەمیش بێت ئەگەر دۆلارێك بێت یان دە ڕوپیە بێت، چونکە تۆ هەر ئەو ئەندازە کەمەت لە تواناتدا هەیە.**

## پاداشت بەنیەتی پاك و ڕاست دەبێ

**ئەی موجاهیدانی ئیسلام لە شوێنانی دوور لە مەنزڵگای خۆیان، کۆمەڵێ موسڵمان هەن پاداشتیان وەك پاداشتی ئێوە دەبێت، هاوڕێتانن لە پاداشتدا، ئەوانەش ئەو موسڵمانانەن کە نیازیان هەیە بگەن پێتان، بەڵام عوزری شەرعییان هەیە و ناتوانن بگەن پێتان، ئەوانە پاداشتیان وەك پاداشتی ئێوە وایە کە لەناو جەبهەدان... لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (إن في المدينة لرجالا ما سرتم مسيراً ولا قطعتم وادياً إلا كانوا معكم، حبسهم المرض أو حبسهم العذر).**

---

رواه البخاري، عاداتی دووڕووەکان وابوو ئەگەر یەکێك شتی زۆری بهێنایە ئەیان وت: ئەمە ڕیایی ئەکات و ئەگەر یەکێك شتی کەمی بهێنایە دەیانوت: توخوا خوا موحتاجی ئەم شتە بێ قیمەتەیە؟! ڕیوایەت کراوە ئەبوعوقەیل ئەو شەوە ئاوی کێشابوو بە ٥ کیلۆ خورما. مختصر ابن كثير، م٢، ص١٥٨.

واتە: بەراستی لەناو مەدینەدا چەند پیاوێك هەن هەرچی رێگەیەك كە بڕیوتانە و تێپەڕتان كردووە، هەر دۆڵێكیشتان بڕیوە ئەوانیش لەگەڵتاندان، چونكە نەخۆشی حەبسی كردوون، یان عوزر حەبسی كردوون.(١) هەر موسڵمانێك ماوە پێتان بگات یان ئەوەتا پارەی "جواز سفر"ی نییە یان رێگەی پێ نادەن دەرچێت ئەوە إن شاء الله لە پاداشتدا لەگەڵ ئێوەدایە، بەڵام رووزەردی و گوناهی گەورە بۆ ئەوەیە كە دەگات بە كانی و بە تینوێتی دەگەڕێتەوە.

بەراستی ئەوە موسیبەتی زۆر گەورەیە، والله موسیبەتە، دەگات بە زەوی جیهاد و دەگەڕێتەوە، بۆ كوێ؟ بۆ شارەكەی خۆی دەگەڕێتەوە، كە ناتوانێ جوڵە بكات، ناتوانێ قسە بكات و دەم بكاتەوە، ناتوانێ فیشەكێ هەڵبگرێ لەناو شارەكەیدا، ناتوانێ لە نێوان چوار پێنج گەنجدا بڵێ لا اله الا الله.

چۆن خوای گەورە موحاسەبەی ناكات و سزای نادات لە رۆژی قیامەت بە سزایەكی ناخۆش و نالەبار؟! چۆن خۆی خەسارۆمەند دەكات و دەگەڕێتەوە بۆ پاژنەی پێی دواوەی دوای ئەوەی گەشتووە بە زەوی جیهاد؟ بۆچی دەگەڕێتەوە؟!! چونكە دەروونی سووكە، [چونكە ژنەكەی خۆشتر دەوێ لە بەهەشت، چونكە كاسبیەكەی خۆشتر دەوێ لە چۆلەكەی سەر دارەكانی بەهەشت كە وەك حوشتر وان(٢) ، چونكە شەیتان كارەكەی بۆ جوان دەكات] چونكە شەیتان خانووی بەسەر لوتیەوە دروست كردووە.

---

١ ئەمە لە كاتی گەڕانەوەیان بوو لە شەڕی تەبووك.

٢ چۆلەكەكانی بەهەشت وەك حوشتر وان هەروەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە.

## ئایا قەرزاری بەرگری لە جیهاد دەکات

بەڵێ دێت و پێت دەڵێت: کە قەرزم بەسەروەیە، ئایا قەرزاری بەرهەڵستی دەکات لە جیهاد؟ [ئایا دەبێت ئیتر قەرزاری وات لێ بکات خوا حافیزی یەکجاری لە زەوی جیهاد بکەیت.] نەخێر، قەرزار دەبێ دەرچێ بەبێ ئیزنی خاوەن قەرزەکەی، بەهیچ شێوەیەك نەمانبیستووە یارێکی پێغەمبەر ﷺ قەرزاریی وای لێ بکات واز لە جیهاد بێنێت، بە شەرتێك زۆربەی ئەو یارانەی پێغەمبەری خوا ﷺ قەرزار بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت بە خوای گەورە زرێکەی بارمەتە بوو لای گاورێك بۆ جۆ.[1] ئایا ئەمە وای لێ کرد کە دەرنەچێت بۆ تەبووك و خەیبەر و بۆ خەندەق و شەڕەکانی تر؟ ئەمە چ عوزرێکە ئێوە دەیهێننەوە؟!! پرسیار لە ئیبن تەیمیە کراو وتیان: ئەگەر پیاوێك داوای دەرچوونی لێ کرا بۆ جیهاد، بەڵام قەرزارە چی بکات؟ فەرمووی: قەرزەکە رابگرێت، ئەوەندەی هەبوو توانی قەرزەکە بداتەوە ئەوە یەکەم جار خۆی ئامادە دەکات لە پارەی قەرزەکە، قەرزەکەی ناداتەوە، خۆی ئامادە دەکات و بە ئەندازەی پێویستی ماڵ و منداڵەکەی بەجێ دێڵێ، پێویستی خەرجی، لە دوای ئەمەش ئەگەر پارەی پێ ما نایگێڕێتەوە بۆ خاوەن قەرزەکان مەگەر ئەو خاوەن قەرزانە ئەو پارە سەرف بکەن بۆ جیهاد، ئەگەر خەرجیان نەکرد بۆ جیهاد ئەوە قەرزەکەیان نادرێتەوە. گوێ بگرن لە فەتوای شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە. ئایا بیستتان؟ ئەمە لەکاتێکیشدا ئەگەر پارەی ئەوەی هەبوو قەرزەکەی بداتەوە، بەڵام ئەگەر ئەوەی هەر پارەی نییە قەرزەکەی بداتەوە ئەوە چاکتر و بە هیچ جۆرێك داوای ئیزن لە خاوەن قەرزەکەی ناکات. [بەڵێ ئەگەر باوەڕتان بە زانیاری و فەتوای ئیبن تەیمیە هەیە. ئەمە گوفتاری ئەوە، ئەمە ئەندازەی تێگەیشتنی ئەو کەڵە پیاوەیە، ئەو پیاوە بەوزەی چەندی ساڵەی خۆی لە مەیدانی زانیاری ئیسلامدا تاوداوە] ئەوەتا لە

---

[1] واتە: زرێیەکی شەڕی هەبوو، جا لە ماڵەوە نانیان نەبوو چوو بۆ لای جولەکەیەك جۆی هێنا بە قەرز پارەی نەبوو حەقەکەی پێ بدات زرێکەی دا بە رەهن.

**شوێنێکی تردا پرسیاری لێ دەکەن: ئەگەر پیاوێك پارەی هەیە و دەیەوێ لە ڕێگەی خوادا سەرف بکات لە بەردەمیدا جیهاد هەیە و لە بەردەمیدا فەقیر و هەژاریش هەیە، ئەگەر ماڵەکەی ببەخشێ بۆ جیهاد ئەوە فەقیرەکان ئەمرن لە برساندا؟ فەرمووی بیدە بە جیهادەکە با برسیەکان لەبرساندا بمرن، بۆچی؟ لەبەرئەوەی لە ژێر گوفتاری هەموو (فقهاء)دا بە گشتی بڕیاریان لەسەری هەیە، لە سەر ئەوەی کە جائیزە کوشتنی ئەو ئەسیرە موسڵمانانەی کە دوژمن دەیانکەن بە قەڵغانی خۆیان، واتە: لەبەردەمیاندا دایان دەنێن و هێرش دێنن بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن. مەبەست لەوەیە: ئەگەر کۆمەڵێك لە موسڵمانان ئەسیر بوون بە دەست دوژمنانەوە ئەم کۆمەڵە ئەسیرە لەبەردەم خۆیاندا دادەنێن بۆ قەڵغانی خۆیان، وەك دیوارێك لەبەردەمیان، ئایا جائیزە بۆ ئێمە کە فیشەك بتەقێنین بۆ کافران ئەگەرچی ئەو موسڵمانانەش بکوژرێن. جا ئەگەر ئەمە گوفتاری کۆی زانایان بێت کە هیچ زانایەك پێچەوانەی ناکات، ئەوە لە کاتێکیشدا سەرف کردنی ماڵەکە بۆ جیهاد ببێتە هۆی مردنی ئەو فەقیرانە ئەوە ئەولاترە. جائیزە، چونکە لە کاتی برسێتیدا بە کردەوەی خوای گەورە دەمرن، بەڵام لە کاتێکدا کافران کردوویانن بە سەنگەرو قەڵغان بۆ خۆیان بە کردەوەی ئێمە دەمرن، مردنیش بە کردەوەی خوای گەورە ئاسانترە بۆ ئێمە لە مردنیان بە دەستی ئێمە.**[1]

**ئیبن تەیمیە دەفەرموێت: پرسیاریان لێ کردم لەبارەی یەکێکەوە کە قەرزارە دەشتوانێت قەرزەکەی بداتەوە، بەڵام لەو کاتەدا جیهاد بووە بە فەرزی عەین، ئەوە چی بکات؟ دەفەرموێت: منیش وتم: هەندێ واجبات هەن کە پێش دەخرێن لە دانەوەی قەرز وەك: سەرف کردنی ئەو پارە بۆ نەفسی خۆی، یان بۆ ژنەکەی، یان**

---

[1] مەبەستی شێخ عبدالله عزام لێرەدا فتواکەی ئیبن تەیمیە کە فەرمووی: با پارەکە بۆ جیهادەکە سەرف بکرێت ئەگەرچی فەقیرەکان بمرن، جا ئەمیش دەڵێت: لەم کاتەدا جائیز بێت خۆمان بیانکوژین ئەو موسڵمانانە ئەوە لە کاتی برسێتیەکەدا خۆیان بمرن ئاسانترە، مەبەستی ئەوە نییە کە یەکەمجار بە دەستی خوا مردوون و دووەم جار بە دەستی ئێمە، لە هەردوو کاتدا بە ویستی خوا مردوون، بەڵام هەموو شتێکیش هۆیەکی بۆ دانراوە. والله أعلم.

بۆ باوکی ئەگەر فەقیر بێت، هەندێ لە عیبادات هەن دانەوەی قەرز پێشیان دەکەوێت وەك حەج و کەفارەتی سوێند، جا ئەگەر ئەو جیهادە بوو بە فەرزی عەین بۆ بەرپەچدانەوەی زەرەرێك بوو وەك ئەگەر دوژمن هێرشی هێناو حازر بوو بۆ موسڵمانان ئەوە بۆ جیهادەکە سەرف دەکرێت، پێش دانەوەی قەرزەکە، هەروەك سەرف کردنی بۆ نەفسی خۆی چۆن پێش دەخرێت، بەڵکو جیهادەکە لە پێشترە لە نەفسی خۆشی و ژنەکەیشی، بەڵام ئەگەر ئەمیری موسڵمانان داوای کردبوو کە دەرچن بۆ هێرشبردنە سەر دوژمن ئەوە بە قەرزارەکەیشی وت وەرە لەگەڵمان ئەوە لەو کاتەدا پارەکە سەرف بکات بۆ دانەوەی قەرزەکە باشترە، چونکە ئیمام پێویست ناکات داوای دەرچوون بکات لە قەرزار ئەگەر پێویستی پێی نەبوو، جا بۆیە منیش وتم [واتە ئیبن تەیمیە]: ئەگەر ماڵێك هەبوو بۆ ئەوەی بدرێت بە خەڵکی برسی و هەژار و سەرف نەکردنی بۆ جیهاد کە دەبێتە هۆی زەرەری جیهادەکە ئەوە پێشی دەخەین بۆ جیهاد ئەگەر برسییەکان بشمرن، هەروەك چۆن دەتوانین ئەو موسڵمانانە بکوژین کە ئەسیرن و کراونەتە قەڵغان بۆ بەردەمی دوژمن ئەوە لێرەدا بە ئەولاترە، چونکە لەو کاتەدا بە کردەوەی ئێوە دەمرن بەڵام لە کاتی برسێتییەکەدا بە کردەوەی خوا دەمرن، پاشان وتم: ئەگەر ئەو خاوەن قەرزانە ئەو پارەیەی کە لە قەرزارەکانی دەستێننەوە سەرفی دەکەن بۆ جیهادە ئەمە واجبە قەرزەکەیان بدرێتەوە، چونکە دوو بەرژەوەندی دێتە دەست:

١. قەرزەکەی دەدرێتەوە.

٢. جیهادەکەش پارەی بۆ سەرف دەکرێت.

بەهەمان شێوە ئیمام ئەحمەدیش ئەم فتوایانەی داوە لەسەری رۆیشتووە، بەڵکو ئیبن تەیمیە دەفەرموێت: ئەگەر جیهاد بوو بە فەرزی عەین وەك ئەمڕۆ لە سەدەی بیستەمدا ئەوە بە مەرج ناگیرێ بوونی وڵاخ و سەیارە و خواردەمەنی بۆ دەرچوونی جیهاد، واتە وەك حەج نییە کە وڵاخ یان سەیارە و خواردەمەنی هەبێت، ئینجا دەبێ دەرچێت. [بەڵێ ئیبن تەیمیەی خۆشەویست بۆیە مەسەلەی جیهادی زۆر بەتوندی

گرتووە، چونکە دەزانێت سەربەرزی موسڵمانان و ئیسلام لە ژێر تیشکی نوکی شمشێردایە. چونکە دەزانێت ئەگەر جیهاد نەما موسڵمانان دەبێ بچن چاوەڕوان بن کوفر بڵێ: وا بکە و وا مەکە، بە نەبوونی جیهاد موسڵمانان ترسنۆك دەبن، زەلیل دەبن، سەرشۆڕ دەبن، سووك دەبن، وە با چاك بزانێت ئیمام ئیبن تەیمیە ئەو فتوایانەی کە داویەتی بە ئارەزووی خۆی نەبووە، بەڵکو لە ژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا بووە، هەروەك ئاشکرایە هەرکەسێك تەنانەت ڕۆژێك لەناو موسڵماناندا ژیابێت پایەو پلەی ئیبن تەیمیە دەناسێت].

## بەرەو ڕوو وەستان و بەرپەرچدانەوەی کافری هێرشکەر پێش خراوە لە عیبادەتەکە فەرزەکان

**فەرزە لەسەر هەموو موسڵمانێکی ئەم سەردەمە کە لە هەر پارچە زەویەکدا جیهادی تێدا هەبێت خۆی بگەیەنێتە ئەو جیهادە لەهەر وڵاتێکدا هەیە دەبێ بڕۆیت، دەبێ ڕاپەڕی وەك موسڵمان، ئەگەرچی بەپێش بڕۆیت، واجبە لەسەر موسڵمانان لە ئەردەن لە شاری عەمانەوە بێن بۆ مەیدانی جیهاد ئەگەر بە پێش بێت لە کاتێکدا پارەی ڕێی پێ نەبوو، واجبە لەسەر موسڵمانانی میصر لە شاری قاهیرەوە بێن، ئەگەر بەپێ خاوسیش هاتبن، لەگەڵ زۆرو کەمدا دەبێ ڕاپەڕی، لەگەڵ سوار و پیادەدا دەبێ ڕاپەڕی، ئەمە گوفتاری ئیبن تەیمیەیە کە دەفەرموێت: (فالعدو الصائل الذي يفسد الدين والدنيا لا شيء أوجب بعد الإيمان من دفعه، أولا لا اله الا الله، محمد رسول الله وقبل الصلاة والصوم والزكاة). واتە: دوژمنی کافری هێرشکەر کە دەیەوێت بیروباوەڕ و دین و دنیای موسڵمانان خراپ بکات و بفەوتێنێت، هیچ شتێك دوای باوەڕهێنان فەرزتر نییە لە بەرەو ڕوو وەستانی و بەرپەرچدانەوەی، یەکەم: لا اله الا الله، محمد رسول الله، دووەم: بەرپەرچدانەوەی ئەو بێ باوەڕە پێش نوێژ و ڕۆژوو و زەکات دەخرێت.**

[بەڵێ ئەم گوفتارە جوانەی ئیبن تەیمیە هەروا بەسەر زارەکی نەوتراوە لە دەمی ئینسانێکی سادەوە دەرنەچووە لە زاری مرۆڤی کەم زانیای و تێنەگەیشتووەوە دەرنەچووە، بەڵکو لە زاری ئەو پیاوەوە دەرچووە کە هەژدە ساڵ لە زیندانی بێ باوەڕاندا بووە].

**پرسیار کرا لە ئیمام ئەحمەد لەبارەی شەڕەوە لە کاتی ساردترین رۆژی زستانداو لە کاتی تەرزەو بەفر و باراندا.... وتیان: ئەو پیاوە دەترسێت ئەگەر لەم کاتەدا بڕوات لەسەرمادا نوێژەکەی لەدەست بدات، ئایا تۆ هەڵوێستت وایە بچێ بۆ شەڕ یان دابنیشێ و نوێژەکەی نەفەوتێ؟ فەرمووی: با دانەنیشێت شەڕەکە گەورەتر و خێری زۆرترە بۆی.**

**بەڵێ ئیمام ئەحمەد دەڵێ با دەرچێ بۆ جیهاد لەگەڵ ئەوەشدا کە نوێژە فەرزەکەی بفەوتێت، چونکە گومانی تێدا هەیە ئایا ئەو نوێژە فەوتاوە یان نەفەوتاوە یان دەتوانێ نوێژەکانی دوا بخات بۆ لای یەکتری، وەك هێنانی عەسر بۆ لای نیوەڕۆ و بردنی نیوەڕۆ بۆ لای عەسر، ئەگەر نوێژەکەیشی دوا بخات ئەوە پاداشتی جیهادەکە ئەوەندە گەورەیە ئەو کەلێنەی بۆ پڕ دەکاتەوە، زۆرجار پاداشتی هەندێ لە سوننەتەکان یان هەندێ لە فەرزە کیفایەکان گەورەترە لە پاداشتی فەرزێك یان فەرزێکی عەین، بەڵی ئەمە باباش بزانیت ئەم گوفتارە شیرینەی ئیمام ئەحمەد لەکاتێکدا بوو کە جیهادی فەرزی کیفایە بوو، کە دەفەرموێت: جیهاد بکە جیهادەکە پایەو پاداشتی گەورەترە، لە رۆژانێکدا کە جیهاد فەرزی کیفایە بوو، ئەم ئیمامە بەڕێزە وا دەفەرموێت. ئیبن تەیمیە قۆڵگیری دەکات و دەفەرموێت:** [واتە رۆشنی دەکاتەوەو هۆکەی باس دەکات، چونکە فەرزە کیفایەکە لێرەدا کە جیهادە پاداشتی گەورەترە لە فەرزە عەینەکە کە نوێژەکەیە]**، هەروەك ئەوە وایە کە یەکێك زەکاتی فەرز بدات بەس هەزار دیناری سەدەقەی سوننەت بدات، ئەوە هەزار دینارەکە پاداشتی گەورەترە لە یەك دینارەکە، بەڵێ ئەم سوننەتە و ئەو فەرزە، پاشان پرسیار کرا لە ئیمام ئەحمەد: لەبارەی پیاوێکەوە کە جیهاد دەکات پێش ئەوەی حەج بکات. فەرمووی: قەیدی نییە ئێمە هیچ خراپەیەك نابینین لە جیهاد کردن پێش سەردانی**

**ماڵی خوا (الحج) لەگەڵ ئەوەشدا لە لای ئیمام ئەحمەد کە توانیت بچیت بۆ حەج یەکسەر دەبێ بڕۆی.** [واتە بەبوونی وڵاخ و پارە و نان واجبە لەسەرت حەج دوانەخەیت].[1]

**لەگەڵ ئەمەشدا کە ئەمە هەڵوێستێتی لەگەڵ سەردانی ماڵی خوادا، کەچی جیهاد پێش دەخرێت لە حەجی فەرز لە لای ئیمام ئەحمەد، ئەمە لە چ کاتێکدا؟ لە کاتی رۆژانێك کە جیهاد فەرزی کیفایە بوو. (ئیبن مختان) دەفەرموێ: پرسیارم کرد لە ئیمام ئەحمەد لە بارەی یەکێکەوە کە شەڕ دەکات پێش ئەوەی بچێت بۆ سەردانی ماڵی خوا؟ فەرمووی: قەیدی ناکات، بەڵام ئەگەر دوای سەردانی ماڵی خوا بێت ئەوە باشترە، پاشان رۆژێك دووبارە پرسیاریان لێ کردەوە لەبارەی یەکێکەوە کە دێت بۆ جیهاد کەچی سەردانی ماڵی خوایشی نەکردووە، پاشان دێتە لای کۆمەڵێك پەشیمانی دەکەنەوە لە جیهاد و دایدەنیشێنن و پێی دەڵێن کورە بڕۆ بۆ وڵاتەکەی خۆت تێبکۆشە، تۆ سەردانی ماڵی خوات نەکردووە و دەتەوێ جیهاد بکەی؟ ئەویش فەرمووی: با جیهاد بکات و گوێیان نەداتێ، ئەگەر خوا یارمەتی دا لە دواییدا با سەردانی ماڵی خوا بکات، ئێمە هیچ خراپەیەك نابینین لە جیهادکردن پێش سەردانی ماڵی خوا جل جلالە.**

[بەڵێ برای بەڕێزم ئەمە هەڵوێستی جوانی ئەم ئیمامە بەڕێز و تێگەیشتووانەیە، کێ خۆی لە ئیمام ئەحمەد بە زاناتر دەزانێت با هەڵوێست دەربڕێ، ئەمە ئەو ئیمامەیە کە پیر بوو بوو تیر ئەندازی دەکرد پێیان وت: تۆ پیر بوویت، تیرئەندازیت بۆ چییە؟ ئەویش لە وەڵامدا دەیوت: دەترسم بەر ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەوم کە دەفەرموێت: (من

---

[1] ئەم مەسەلەیە زانایان جیاوازن تێیدا واتە: چوون بۆ سەردانی ماڵی خوا کۆمەڵێ زانا دەڵێن: ئەگەرچی پارە و وڵاخ و نانی ڕێشت هەبێ ئەوە هەر دەتوانیت سەردانی ماڵی خوا دوا بخەیت ساڵێك یان دوو ساڵ نەڕۆیت، چونکە بە فەوری نییە، بەڵام ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێت هەر بە بوونی پارە و وڵاخ و نانی رێ یەکسەر دەبێ سەردانی ماڵی خوا بکەیت جائیز نییە دوای بخەیت لەگەڵ ئەمەشدا هەر دەفەرموێ: پێشخستنی جیهاد لەسەردانی ماڵی خوا چاکترە.

علم الرمي ثم ترکه فليس مني). رواه مسلم، واتە: هەرکەسێ فێری رەمی بوو پاشان وازی لێ هێنا ئەوە لە ئێمە نییە، بەڵام ئەمڕۆ مامۆستایەکی هەیە کە پێنج کتێبی تەفسیری نەخوێندووەتەوە دەڵێت والله مامۆستاکەم وتوویەتی: جارێ کاتی جیهاد کردن نەهاتووە].

**پاشان ئیبن تەیمیە دەفەرموێت: (وإذا دخل العدو بلاد الاسلام فلا ريب أنه يجب دفعه على الأقرب فالأقرب، إذ بلاد الإسلام كلها بمنزلة البلد الواحد). واتە: ئەگەر دوژمن هاتە ناو شاری موسڵمانانەوە ئەوە فەرز دەبێت دەرکردنی لەسەر ئەو کەسەی لەو شارەوە نزیکە پاشان نزیکتر، چونکە هەرچی شاری ئیسلام هەیە هەموویان وەك یەك شار وان.**

**هیچ جیاوازی نییە لە نێوان سعودیە و ئەفغانستان و** [کوردستان] **و فەلەسەتین و .... بەڵێ شارەکانی ئیسلام هەموویان وەك یەك شار وان یەك جێگە وان جیاوازییان نییە** [جا ئەگەر هێرش کرایە سەر یەکێکیان فەرزە لەسەر موسڵمانان هەموویان دەرچن رزگاری بکەن، فەرزە راپەڕین بۆ رزگارکردنی لەهەرکوێ هەبێت]. **بەبێ پرسیارکردن لە باوك و دایك و ژن، ئایا گوفتارەکەی ئیبن تەیمیەتان بیست؟ فەرزە بڕۆیت ئەو بێ ئابڕووانە دەرکەیت بەبێ ئیزنی خاوەن قەرزەکەت ئەگەر قەرزار بویت، بەبێ ئیزنی ژنەکەت ئەگەر ژنت هەبوو، بەبێ ئیزنی عەشیرەت... دایك، باوك، خوشك، بەڵام ئایا ئەگەر کۆمەڵێ دەرچوون بۆ دەرکردنی ئەوە ئیتر گوناهی نەچوونەکەی لەسەر هەمووان دەکەوێ یان دەبێ هەموان دەرچن؟ ئەمە لێرەدا ئەگەر (قتال دفع) بوو واتە کوفر هێرشی کردبوو، وە هێزی کوفریش ئەوەندە زۆرە لە توانای موسڵمانانی ئەو شوێنەدا نییە کە رووبەڕووی بوەستن، بەڵام ترس هەیە ئەگەر واز لە هێرشەکەی کوفر بهێنین ئەوە کوفر بە مانەوە ناوەستێ دەڕوا بۆ ئەو موسڵمانانەی تریش کە لە دواوەن بەجێماون لەم کاتەدا زانایان دەفەرموون: فەرزە لەسەریان تێبکۆشن و بەکاری بهێنن هەرچیەك دەتوانن بۆ بەربەرچدانەوەی ئەو دوژمنەی کە لێی دەترسن.**

**بەهەرحاڵ ئەگەرچی ئەو موسڵمانانە نیوە یان چارەکێکی هێزی بێ باوەڕیش بن هەر دەبێ بەرامبەریان بوەستن بە پشتیوانی خوای گەورە، چونکە ئەگەر بەری ئەو لافاوە نەگیرێ ئەوە بەردەوام هەردێ وازناهێنێ هەتا ئەوەی کە مەبەستێتی ئەنجامی نەدات، ئەمە پێی دەڵێن (قتال دفع)، بەڵام (قتال طلب) واتە داواکردن، ئەوە بریتییە لە چوونی موسڵمانان بۆ شاری کوفر بۆ ئەوەی بیانگرین إن شاء الله وەك ئەوەی ئێمە بچین بۆ مۆسکۆ و بیگرین ئەمە لێرەدا وەك جاری یەکەم نییە.**

**–شەڕی بەرپەرچدانەوە – ئەوە ئەو شەڕەیە کە لە چیچان یان لە فەلەستین و ئەفغانستان لە کاتێکدا کوفر هێرشی هێناوە بۆ شارەکەمان بەمە هەرچۆن بێت شەرعی نییە کە وازی لێ بێنێ و بەری ئەو لافاوە بەربدەیت.**

**جائیز نییە وازهێنان لەم جیهادە ئەگەر چواریەکێکیشیان بن یان دە یەکێکیشیان بین، بەڵکو ئەو شەڕە فەرزە هەروەك نوێژی بەیانی، کە ئەمەش هەڵوێستی کۆی زانایانە بە گشتی و کەسیان پێچەوانەی ئەم هەڵوێستە نین.**

[بەڵێ زانایانی سەلەف، چونکە هەموویان دڵیان بەسترابوو بە فەرموودەکانی پێغەمبەری خواوە ﷺ وە فەرموودەکانی خواو پێغەمبەری خواش ﷺ لە زۆر شوێندا هانی موسڵمانان دەدەن بۆ کوشتار، ئیتر جیاوازی و ناکۆکی نەدەکەوتە نێوانیانەوە لەبارەی جیهادەوە، بەڵام لەم کۆتاییەدا لە سەدەی بیستەمدا، چونکە هەواو ئارەزوو تێکەڵی دڵ و دەروونەکان بووە، چونکە فەرموودەکان پشتگوێ خراون، ئاوەها دەبینین ئەو هەموو ناکۆکییە دروست دەبێ لەبارەی جیهادەوە، دێ و دەڵێ کەی کاتی جیهاد هاتووە، دێ و سورەتەی (التوبة، الأنفال، الأحزاب، قتال)ی لە یادچووە و جیهاد بە سوننەتێکی غەیرە موئەکەدیش نازانێت، چونکە ئەگەر بە سوننەتیشی بزانێت ئەوە رۆژێك لە رۆژان هەر دەیکات، بە شەرتێك کۆی زانایانی (أصول الفقه) وایە ئەگەر سوننەت بە یەکجاری وازی لێ بهێنرێ ئەوە دەبێتە فەرز، ئەگەر گوناهی بچووك بەردەوام بیت لەسەری ئەوە دەبێتە گوناهی گەورە].

## ئایا کێ داوای (فتوای) جیهادی لێ دەکرێت؟

[بەڵێ لەبەرئەوەی مامۆستای بەڕێز ئیبن تەیمیە زۆر لە خواترساوە زۆر دڵ و دەروونی بە فەرموودەکانی رب العالمین پاشان فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ بەستراوە]، **بۆیە پەنجە رادەکێشێ بۆ مەسەلەیەکی زۆر گرنگ بۆ ئەو داخوازییەی کە ئەمڕۆ زۆربەی موسڵمانان گیرۆدە بوون بە دەستییەوە، ئەویش ئایا کێن ئەو کەسانەی کە داوای فەتوای جیهادیان لێ دەکرێت؟ ئیبن تەیمیە وادەبینێ کە داوای فتوای جیهاد ناکرێ مەگەر لەو زانایانەی کە لە ناو جیهاددا دەژین و لە مەیدانی زەوی جیهاددان... داوای فتوای جیهاد ناکرێت مەگەر لەو زانایانەی کە لە حاڵ و وەزعی جیهاد دەزانن و لەناو جیهاددان، بۆیە دەفەرموێت: (والواجب أن يعتبر في أمور الجهاد برأي أهل الدين الصحيح الذين لهم خبرة بما عليه أهل الدنيا، دون الذين يغلب عليهم النظر في ظاهر الدين، يحفظ بعض الأحاديث وتأتي تسئله.... لا... دون الذين يغلب عليه مالنظر في ظاهر الدين، فلا يؤخذ برأيهم ولا برأي أهل الدين الذين لا خبرة لهم في الدنيا). واتە: فەرزە لە ئیش و فەرمانی جیهاددا نرخ دابنرێت بۆ هەڵوێستی ئەو زانایانەی کە خەڵکی ئیمان و دینی راستن، ئەوانەی کە خیبرە و زانیاریشیان هەیە لەسەر ئەو شتانەی کە خەڵکی لەسەری دەڕۆن نەك ئەو زانایانەی کە سەیر کردن بۆ رواڵەتی دین سەرکەوتووە بەسەریاندا، ئەمانە کە سەیری رواڵەتی ئیسلام و "دەقەکانی فەرموودە" دەکەن ئەوە هەڵوێست و بۆچوونیان وەناگیرێت "با زۆر زاناش بێت" ئەوانەیش کە ئەهلی ئیمان و باوەڕی راستن واتە سەیری رواڵەتی فەرموودە ناکەن، بەڵام خیبرەیان بەو شتانە نییە کە خەڵکی لەسەری دەڕۆن بەهەمان شێوە هەڵوێست و بۆچوونیان لە فەرموودەکانی جیهاد وەرناگیرێت.**

[واتە: دەبێ دوو مەرجی تێدا بێت:

یەکەم: تەنها سەیری رواڵەتی فەرموودەکان نەکات.

دووەم: دەبێ لەگەڵ زانیارییە شەرعییەکەشدا زانیاریشی بە ئەو فەرمانانەی هەبێت کە خەڵکی دونیا لەسەری دەڕۆن.

الله أكبر، نازانم ئەو زانایە چۆن زمانی لاڵ نابێ کە فتوای کۆچ نەکردن و جیهاد نەکردن دەدات لەسەدەی بیستەمدا؟! چی وای لێ کردووی ئەی شێخ ناگەی بە زەوی جیهاد؟ چی نەخۆشی خستووی و چەکی جیهادت پێ هەڵناگرێ؟!] **ئەی چی وای لێ کردوویت فتوای کۆچ نەکردن و جیهاد نەکردن دەدەیت چۆن وەڵامی خوای گەورە دەدەیتەوە؟! ئایا سەیری مەیدانەکانی جیهادت کردووە؟ ئایا فەرماندەکانی موجاهیدینت بینیوە و دەیانناسیت، چۆن ئەم فتوا لارو گێڕە دەدەیت؟! ئەوەی پێشەوا و زانای دینە، بەڵام لەبەرئەوەی شارەزایی نییە لەو شتانەی کە خەڵکی دونیا لەسەری دەڕۆن داوای فتوای جیهادی لێ ناکرێت، پێش ئەوەی بچینە سەر مەسەلەی ئەمریکا من دەڵێم: داخوازی دەکەم و دەڵێم: یەك پیاو بێت بە شایەتەوە بڵێت ئەمریکا تا ئێستا پارچە سیلاحێکی داوە بە موجاهیدان بەبێ پارە. ئەمریکا بۆ هەموو ساروخێك حەفتا هەزار دۆلاری لە ماڵی موسڵمانان وەرگرتووە، حەفتا هەزار دۆلار کرێی یەك ساروخە وا ئەزانن ئەمریکا یارمەتی موجاهیدین دەدات؟ ئەمریکا هات بە (٦٠) ملیۆن دۆلارەوە بۆ فێرکردن وە سەد ملیۆن دۆلارەوە بۆ بواری تەندروستی و وزۆر هەوڵیان دا لەگەڵ فەرماندەی موجاهیدیندا بۆ ئەوەی بچنە ناو ئەفغانستان بۆ ئەوەی قوتابخانەیان بۆ بکاتەوە بۆ فێربوون و بە نیازی خۆی بۆ ئەوەی نەخۆشخانەیان بۆ بکاتەوە بۆ ئەوانەی کە بە هۆی شەڕەوە کۆچ دەکەن هەتا برینەکانیان سارێژبکرێت و خوێنەکەیان بوەستێنرێ، هەتا لە کۆتاییدا سەرۆکی لیژنەی فێرکاری ئەمریکی وتی: ئەی خەڵکی ئەوە ماڵێکی زۆرە کە ماوە دەبرێتەوە بۆ خەزێنەی ئەمریکا ئەگەر نەیەت بۆ ئەفغانستان، بەڵام ئەوەندەی من بزانم هەتا ئێستاش رەفزیان کردووە کە هیچ شتێك وەربگرن.**

**لە ئەمریکا لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەگەرییدا پرسیاریان کرد لە "حیکمەتیار" ئایا هیچ شتێکتان لە ئەمریکا وەرگرتووە؟ وتی: هیچ شتێکمان لە ئەمریکا**

وەرنەگرتووە، ئەوە کێن ئەو کەسانەی دەڵێن ئەمریکا یارمەتی جیهاد دەدات، ئەو کەسانە قوتابی و شاگردی دڵسۆزی یەهودن، ئەیانەوێ ڕووداوەکە بگۆڕن بەوەی ئەمە شەڕی ئەمریکا و رووسیایە، هەتاکو (عقيدة التوكل) کە جیهادی موجاهیدین بناغەی ناوە لە دڵی خەڵکیدا بڕوخێنن و ریشەکێشی بکەن، هەتاوەکو ئەو یەقینەی کە ئەم جبهادە بونیادی ناوە لاوازی بکەن، ئەو یەقینەی بونیادی ناوە بە یەك ملیۆن شەهید.... بە چەندین دەریای خوێن... ئەو یەقینەی دروست کرد کە شعوری هەموو موسڵمانانی جوڵاند کە هەر کۆمەڵە موسڵمانێك ئەگەر خۆیان بۆ خوای گەورە یەکلا بکەنەوە دەتوانن بەرامبەر گەورەترین هێزی بێ ئابڕوان بوەستن ئەگەرچی زۆر زلهێزیش بێت بە رواڵەت [وەك هێزە نەزۆکەکەی ئەبو جەهل] ئەو هێزە گەورەی رووس چی لێ هات؟! ئەوەتا زۆربەیان بەسەر شاخەکانی (هندۆکۆش)، دەریای هیلمند، هاری رود کوژراون، کوا رووسیا؟ زەلیل و زەبوون بوون، ئابڕوویان چوو، واللە لەوان زەلیلتر و سوکتر نابینم، ئاوا رادەکەن لە ترساندا، بە هۆی دڵەراوکێوە... لە ترسی کێ؟ لە ترسی موسڵمانە رووت و پێ خاوسەکان، لە ترسی ئەو موسڵمانانەی کە بە دوانیانەوە یەك جووت پێڵاویان هەبوو لە ناو تەرزە و زوقم و بەفردا!! ئەو بێ باوەڕانە ئەفغانیان ناوناوە (بزنی شاخی... بەڵی بزنی شاخی) دەڵێن: هەموو جیهانمان سەرشۆڕکرد بە رۆشنبیری خۆمان و سەری هەموو دونیامان دانەواند بۆ بیروبۆچوونی خۆمان تەنیا بزنە شاخییەکان نەبێت (واتە ئەفغانستان).

بەڵێ سوپاس بۆ خوای گەورە بزنی شاخی بە پشتیوانی خوای گەورە روخاندنی و سەرشۆڕ و سووکی کردن، بەڵێ ئێمە دەمانەوێت بزنی شاخیمان زۆرتر بێت لە وڵاتەکەماندا، خوایە گیان زۆرتریان کەی لە وڵاتی شام لە وڵاتی میسر و سعودیە و ئەردەن و .... هەتاکو ئیسرائیلی بێ ئابڕوو بڕوخێنن، ئەگەر بۆمان ڕۆشن بکەنەوە چ بزنێکی شاخی وەك نموونەی ئەفغانییەکان وایە؟ ئەو موجاهیدانە شعوری پیاوەتی و غیرەت دەجووڵێنن، شعوری ئیسلامەتی دەجوڵێنن، شعوری وەفاداری و

**دڵسۆزی دەجوڵێنن، بەڵێ ئەگەر ئەمانە بزنی شاخی بن بەراستی ئێمە پێویستمان بە بزنی شاخی وا زۆرە، خوایە ئەگەر موجاهیدین بزنی شاخی بن خوایە گیان بمانگێڕە بە بزنی شاخی... هەروەك ئیمام شافیعی ئەفەرموێت:**

**إن كان رفضا حب آل محمد فليشهد الثقلان أني رافضي**

**واتە: ئەگەر خۆشەویستی ئالی پێغەمبەر ﷺ (رافضي) بێت، با جنۆکە و ئینسان بە شایەت بن من رافضیم.**[1]

**ئەگەر جیهاد و توندوتیژی لە دینی خوادا بزنی شاخی بێت دە خوایەگیان بمانگێڕە لەو بزنە شاخییانە، نازانم ئەو زانایە چۆن جورئەتی ئەوە دەکات فتوای لار و گێڕ دەدات لەبارەی جیهادەوە کە هیچی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ پێی رازی نین؟** [ئەی زانایان بۆ خاتری خوا کە خۆتان نایەن بۆ جیهاد خەڵکیش پەشیمان مەکەنەوە، ئایا بۆچی نایەن ساڵێك دوو ساڵ لەناو مەیدانی جیهاددا بژین؟ پێمان بڵێن ئێوە لە سیرە شارەزان؟ پێغەمبەری خوا ﷺ لە غەزاکانیدا دوا دەکەوت؟ ئایا لەوە دەترسن بکوژرێن؟ بەڕاستی ئیسلام غەریب بووەتەوە، چۆن زانا دەبێ لە مردن بترسێت؟ ئایا ئەگەر موجاهید مردنی شەهیدی بێت، توخوا حەیف نییە لە مردن بترسێت؟] **کوا بیروباوەڕ بە قەدەر؟ کوا عەقیدە؟ چۆن لە مردن سڵ دەکەیت و ڕا دەکەیت؟ ئایا خوا نافەرموێت:** ﴿ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾ **آل عمران: ١٤٥ واتە: هیچ نەفسێك نییە بمرێت مەگەر بە ویستی خوای گەورە نەبێت.**

**بەڵێ کوا عەقیدە...** ﴿ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ﴾ **(الأنفال: ٢٤) واتە: ئەی بڕواداران وەڵامی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بدەنەوە ئەگەر بانگیان کردن بۆ ئەوەی کە دەتانژیەنێ.**[2]

---

[1] روافض: کۆمەڵێکن لە شیعە.

[2] لە تەفسیری ئایەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ﴾ الأنفال: ٢٤ (الواحيدي) دەفەرموێت: "زۆرینەی زانایان لەسەر ئەوەن کە مانای (لما يحييكم) جیهادە، ئەمەشیان وتەکەی (ابن

**بەڵێ بەراستی جیهاد ژیانە، چۆن؟ (عن ابن عمر قال: قال رسول الله ﷺ: وجعل رزقي تحت ظل رمحي)[١] واتە: رۆزیم دانراوە لە ژێر سێبەری رمەکەمدا. یان دەفەرموێت: (بعثت بالسیف بین یدي الساعة حتي یعبدالله) واتە من نێرراوم بە شمشێر لەبەردەستی قیامەتدا هەتاکو بەندایەتی بۆ خوا بکرێت.[٢] واتە خوا بپەرسترێت، لە ریوایەتێکی تردا:** [(بعثت بین یدي الساعة بالسیق حتی یعبدالله وحده لاشریك له).[٣] والله بەندایەتی بۆ خوا ناکرێت بەبێ شمشێر، بەڵێ بە شمشێر دەبێ ئایا یەکتاپەرستی بەبێ شمشێر دەمێنێ؟ نەخێر (چونکە زوڵم و شیرك زاڵ دەبێ ئەگەر جیهاد نەما، کە شیرکیش زاڵ بوو ئیتر تەوحید کز دەبێ لەبەرچاوی خەڵك. شیرك زۆر دەبێ، بەڵام بە شمشێر دەفەوتێت ﴿وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٌ﴾ (البقرة: ١٩٣) (فتنة) واتە شیرك وەك ئیبن عەباس دەفەرموێت، کەواتە: دەبێ شەڕ بکرێت هەتا شیرك نەمێنێ بەپێی ئەم ئایەتە]. **هەتاکو شیرك لە دڵی خەڵکیدا چەکەرە نەکات، هەتاکو بڵاوە نەکات و تەوحید غەریب ببێت.**

**بەڵێ یەکێکی تر لە زانا گەورەکان دەڵێ: "چۆن بەرامبەر دەبابەی رووس؟ چۆن دەتوانن بەرەنگاری بکەن؟ ئایا دەتانەوێ بەرامبەر دەبابەی رووس بوەستن بە چەقۆ و شمشێر؟ بەراستی جێگەی داخە کە زانا وا بڵێت، وا دەزانێ موجاهیدان بە چەقۆ بەرەنگاری دەکەن. بەڵێ بەراستی حەرامە پرسیار کردن لەم جۆرە زانایانە لەبارەی**

---

اسحاق)ە، کە زۆرێك لە زانایان ئەم رایەیان هەڵبژاردووە، (الفراء) دەفەرموێت: هەرکاتێك خوای گەورە بانگی کردن بۆ ژیان ئەوە فەرمانتان پێ دەکات بە جیهاد کە بجەنگن لە دژی دوژمنانتان، دەیەوێت بەم جیهادە بەهێزتان بکات، بەڵام ئەگەر وازیان لە جیهاد هێنا ئەوە بێ هێز دەبن و دوژمن بەسەریاندا زاڵ دەبێت و تێکیان دەشکێنێت.

(ابن قیم) دەفەرموێت: منیش دەڵێم: جیهاد پلەیەکی زۆر بەرزە ژیان بە مرۆڤ دەبەخشێت لە دونیاو بەرزەخ و دواڕۆژدا. (ئاوێتەی دڵ ـ الفوائد/ ابن قیم الجوزیه) (سەردار).

[١] صحیح الجامع ٢٨٣١ .

[٢] مەبەستی لەوەیە کە قیامەت نزیك بووەتەوە، چونکە لە فەرموودەی تردا هاتووە پێغەمبەری خوا ﷺ پەنجەکانی دەنووساند بەیەکەوە و دەیفەرموو من و قیامەت ئاواین، ئیشارەتی بۆ پەنجەکانی دەکرد.

[٣] سەیری صحیح جامع الصغیر رقم ٢٨٣١ بکە.

**جیهادەوە** [سوێند بە خوا حەرامە، چونکە ئەوان شێوەکەی نازانن چۆنە، حاڵ و ئەحواڵی ناو جیهادەکە نازانن، ئەو جۆرە زانایانە کە خۆیان لەناو مەیدانی **جیهاددا ناژین**، نابێ بڕۆی پرسیاریان لێ بکەی، ئایا تۆ دەڕۆیت پرسیاری نوێژ لە زانایەك بکەی کە خۆی نوێژ ناکات؟ چۆن دەتوانیت پرسیاری ڕۆژوو لە زانایەك بکەیت کە ئەو زانایە خۆی ڕۆژوو نەگرێت و عوزریشی نەبێت؟

هەزاران گەنج قەناعەتیان بە زانیاری زانایەك هەیە و چاوەڕوانن پێیان بڵێ بچن بۆ جیهاد، کەچی نەك هەر پێیان ناڵێت بەرهەڵستیشیان دەکات کە بچن بۆ جیهاد، (الله أکبر، سبحان الله)].

**بەڵێ جائیز نییە کە داوای فتوا بکرێت لەو کەسانەی کە زانیارییان نییە، جائیز نییە لەو کەسانەی کە زانیارییان هەیە، بەڵام خیبرەیان نییە و حاڵ و ئەحواڵی جیهاد نازانن، دەبا چاکیش ئاگادار بێت حاڵ و ئەحواڵی جیهادیش شارەزا نابێت هەتاکو لە جیهادەکەدا نەژی.**

## جیهاد فەرزی کیفایەیە لە بنچینەدا، بەڵام ئێستا فەرزی عەینە

**ئەی برای موسڵمانم ئێمە دەزانین موسڵمانان نابێ هەموویان بە یەکجاری دەرچن بۆ مەیدانی جیهاد، بەڵکو دەبێ کۆمەڵێك دەرنەچن و دانیشن فێری زانیارییە ئیسلامییەکان بن، بەڵام ئەمە لەکاتێکدا کە جیهاد فەرزی کیفایە بێت** [واتە: ئیسلام دەوڵەتی هەبێت ئەگەر لەوکاتەدا کۆمەڵێك ویستیان خیانەت لە موسڵمانان بکەن ئەوە کۆمەڵێ لە موسڵمانان رادەپەڕن بۆیان و فەرزەکە لەسەر هەموو موسڵمانان دەخەن هەروەکو زۆربەی شەڕەکانی سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ بەم جۆرە بوو]. **بەڵام جیهاد بوو بە فەرزی عەین ئەوە فەرزە لەسەر هەموو موسڵمانانی جیهانی چەك هەڵگرن بۆ دەرکردنی بێ باوەڕان لە خاکی ئیسلامی پیرۆز،** [فەرزە وەك نوێژ، پێتان خۆش بێ یان قورس بێ بێت، دەبێ ڕووبەڕووی بێ باوەڕان بوەستن، هەتاکو موسڵمانان لەژێر دەستی ژەهراوییان ئازاد بکرێت].

**ئەی برای موسڵمان با ئەمڕۆ وا دابنێین جیهاد فەرزی کیفایەیە... بەڵام ئایا فەرزی کیفایە چییە؟**

**ئایا ئەگەر موسڵمانان هێرشیان کرایە سەر توانای دەرکردنی دوژمنیان نەبوو ئەوە نابێتە فەرزی عەین؟**

[بەکۆی هەموو زانایانی سەلەف و خەلەف دەڵێن: لەو کاتەدا وەك نوێژی لێ دێت و دەبێتە فەرزی عەین، فەرزی کیفایە لە ڕۆژانێکدایە کە دەوڵەتان لە ژێر هێزی سەربازگەی ئیسلامدا بن، ئەگەر کۆمەڵێ خیانەتکاریش لە کەنارێکەوە ویستیان خیانەت بکەن، ئەوە کۆمەڵێك موجاهید دەنێررێت لەناویان دەبەن، بەڵام توخوا چ پارچە زەویەك یاسای خوای تێدا دەبرێت بەڕێوە، هەتاکو جیهاد فەرزی کیفایە بێت؟ توخوا بۆ شەرم لە خوا ناکەن بەبێ زانیاری، بەبێ تێگەیشتن، بە ئارەزووی خۆتان دەربارەی جیهاد قسە دەکەن؟ بەراستی ئەمە خوای گەورە پێی رازی نییە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ وای نەفەرمووە، "سلف" وا نافەرموون، یارەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچوونی وایان دەرنەبڕیوە، زانایانی وەك شافیعی، ئەحمەد، ئیبن تەیمیە – خوایان لێ رازی بێت – شتی وایان لە پەڕاوەکانیاندا نەنووسیوە !! ئەی نازانم ئەمە لە کوێوە پەیدا بوو؟ ئەم ئیجتیهادە کێ کردی؟!!].

**بەڵێ فەرزی کیفایە ئەگەر کۆمەڵێك ئەنجامیاندا لەسەر ئەوانی تر دەکەوێت، بەڵام ئەگەر کەس ئەنجامی نەدا ئەوا هەموو موسڵمانان گوناهبار دەبن....** [بەڵام ئەمڕۆ ئاگری کوفر بە کۆمەڵێ موسڵمانان دەکوژێتەوە؟ ئەمڕۆ لافاوی کوفر بە پردێکی بچووك بەری دەگیرێت؟ کۆی هەموو زانایانی ئیسلام دەفەرموون: ئەگەر بستێك لە زەوی موسڵمانان داگیر کرا شاخ بێت یان دەشت و دۆڵ ئەوە جیهاد دەبێتە فەرزی عەین لەو شوێنەدا]، **ژن دەبێ دەرچێ بەبێ ئیزنی مێردەکەی، بەڵام یەکێکی مەحرەمی (وەك باوك یان برا) لەگەڵ بێت، کوڕ دەبێ دەرچێ بەبێ ئیزنی باوکی، قەرزار بەبێ ئیزنی خاوەن قەرزەکەی، بەندە بەبێ ئیزنی گەورەکەی، ئەگەر ئەو کۆمەڵە موسڵمانە لەو شوێنەدا نەیانتوانی خۆڕاگرن یان کەمتەرخەمییان کرد، یان تەمبەڵییان کرد، یان دانیشتن، ئەوە فەرزە عەینەکە بەربڵاو دەبێ بۆ ئەو موسڵمانانەی کە لە نزیکی ئەو شوێنەن، ئینجا نزیکتر، نزیکتر... هەتاکو فەرزی عەین بە گشتی زەوی دەگرێتەوە، بە جۆرێك ناتوانن جورئەتی ئەوە بکەن وازی لێ بهێنن وەك نوێژ و ڕۆژوو.**

[توخوا ئەی موسڵمانان با هەموومان بیرێك لە گەرمای دۆزەخ بکەینەوە و وامان لێ بێت ئیتر بە ئارەزووی خۆمان قسە لە دینی خوا نەکەین].

## فێربوونی زانیاری و تێگەیشتن (العلم والفقه) لەناو جیهاددا

خەڵکی نازانی، خەڵکی بێ ئاگایە، ئەو کەسەی ئێستا دەڵێ بە موسڵمانێك مەڕۆ بۆ جیهاد، هەروەکو ئەوە وایە پێشی بڵێ نوێژ مەکە، بەڵی زۆر بە ئاسانی!! هەر دەڵێی گوناهی ناگات بە هیچ شێوەیەك... مەڕۆ بۆ جیهاد.. [چونکە کاتی نەهاتووە]، بەڵێ جاربەجاریش دەستی بۆ ملی بەرز دەکاتەوە و دەڵێ: مەڕۆ گوناهەکەی لە گەردنی من!! پەنجە بە گەردنی خۆی رادەکێشێ... گوناهەکە لە گەردنیەتی [ئای ئەمە چەند گەورەیە!! ئای ئەمە چەند پێچەوانەی خوای بیسەرە] واللە هەروەك ئەوە وایە کە پێشی بڵێ رۆژوو بشکێنە لە رەمەزاندا، ئەگەر تۆ لە سەفەریش نەبی و نەخۆشیش نەبیت گوناهەکەی لە گەردنی، هەروەکو ئەوە وایە کە خەڵکی هەڵنێ بۆ وازهێنان لە نوێژ، زەکات، رۆژوو، سەردانی ماڵی خوا، لە کاتێکدا بتوانن زەکاتیش بدەن و بشچن بۆ ماڵی خوا. [ئای ئەم وتەیە زەوی و ئاسمان و گیاندارەکان چەند پێیان ناخۆش بێت، چونکە ئەوان بە گشتی گەردن کەچن بۆ خوا جل جلالە، ئای قورسایی ئەم وشەیە چەند گەورە بێت؟ مەڕۆ بۆ جیهادت گوناهەکەت لە گەردنی من، ئەم ئینسانە یان ئەوەیە وا ئەزانێت ئەمە تاوان نییە، یان دەیەوێت گوناهی خەڵکیش بە قورگییەوە هەڵواسرێت] ﴿ لِيَحْمِلُوٓاْ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَمِنْ أَوْزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴾ (النحل: ٢٥) واتە: هەموو تاوانی خۆیان بە تەواوی هەڵگرن لەقیامەتدا و هەندێ لە تاوانی ئەوانیش کە ئەمان گومڕایان ئەکەن – بە ئەندازەی ئەوەی گومڕایان ئەکەن و دەبنە هۆی تێکدانی دڵیان بەبێ زانیاری – بێدار بنەوە! گەلێ ناپەسەند و نالەبارە ئەو تاوانەی کە ئەوان لە رۆژی قیامەتدا هەڵی ئەگرن.

دەبا هەموو کەس ئاگادار بێت ئەوە گوناهی خۆی هەڵدەگرێ و گوناهی ئەو کەسەش هەڵدەگرێ کە پەشیمانی دەکاتەوە لە جیهاد ﴿ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً ۚ فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓاْ

**﴿ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴾ (التوبة: ١٢٢) ئەمە لە ڕۆژێکدا بوو کە جیهاد فەرزی عەین نەبوو، کۆمەڵێك لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەردەچوو بۆ شەڕ، کۆمەڵێکیش لە شاری مەدینە دەمانەوە، بەڵێ کێن ئەو کەسانەی کە لەم ئایەتەدا ئیشارەتیان بۆ دەکات کە فێری زانیاری و تێگەیشتن دەبن، ئەوانەی کە فێری زانیاری و تێگەیشتن دەبن ئەو کۆمەڵانەن کە ڕادەپەڕن، نەك ئەو کۆمەڵەی کە دادەنیشن هەروەك چۆن (ئیبن عەباس و تەبەری و حەسەنی بەصری و ئیبن کەسیر) وا تەفسیریان کردووەتەوە و سەید قوتبیش ئەم تەفسیرەی بە چاکتر زانیوە – أرجح – ئەمە ئەوەیە کە ڕام لێیەتی،** [هەروەك چۆن مامۆستا عوسمان لە تەفسیرەکەیدا بۆ تەفسیری ئەم ئایەتە ئەفەرموێت: کۆمەڵێ لە زانایان دەفەرموون: مەبەستی ئەوەیە با هەموو بڕواداران بە جارێ دەرنەچن، بەڵکو لە هەموو کۆمەڵێکی گەورە هەرجارێ دەستەیەك دەربچێ بۆ ئەوەی ئەو دەستەیە بەهۆی ئەو دەرچوون و ڕاپەڕین و بینینی سەرکەوتن و زاڵ بوونی بڕواداران و ژێرکەوتن و ریسوابوونی دوژمنانی ئاینەکەیانەوە تێبگەن و زانا بن بە ئیسلام و زاڵ بوونی بەسەر هەموو ئایینەکاندا کە بە هۆیەوە ئەو گەل و کۆمەڵەی خۆیان کە دەرنەچوون ڕێنموونی بکەن و زانایان بکەن و بیانترسێنن لە سزاو تۆڵەی خوا دەربارەی بێ بڕوا و یاخیبووەکان].

**گوێم لێ بگرن ناکرێ و نابێت و ناتوانرێت لەم دینە کەسێ تێ بگات ئیلا لە جیهاددا نەبێت، – مەگەر لە ژێر سێبەری شمشێردا نەبێت ـ ناتوانێ لەم دینە تێ بگات تەنها موجاهید نەبێت، ئەو کەسانەی کە گومانیان وایە بە دوو قسەی زریق و بریق و بە خوێندنەوەی چوار کتێب لەم دینە حاڵی دەبن – پەروەردە دەبن بەسەریەوە لە ژێر پەڕەی کتێبدا ـ بەراستی ئەوانە سروشتی ئەم دینە جوانە نازانن و زۆر بێ ئاگان لێی، بەراستی ئەم دینە لێی تێ ناگات ئەو کەسانە نەبێت کە بزووتنەوە دەکەن بۆ ئەوەی دایمەزرێنن لە زەویدا بە واقیعی بۆ ئەوەی جیهانیان لە سایەیدا بحەسێتەوە، ئەو کەسانەی کە لە پێناویدا ماندوو دەبن ئەوانە لێی تێ دەگەن، ئەوانەن کە ماڵ و خوێن لە پێناویدا سەرف دەکەن، ئەوانەن کە بە جوانی**

دەبیبستن و لێی تێدەگەن و چاوڕۆشنن تێیدا، بەڵام زاناو تێگەیشتوویەکی دانیشتووی سارد بە هیچ شێوەیەك دینی لێ وەرناگیرێت، چونکە بە تەواوەتی لە دینی خوا تێنەگەیشتووە، ئەو دانیشتووە و ناشتوانێ تێ بکات لەم دینە — بەراستی ئەم دینە لە دانیشتوو وەرناگیرێت — لە زانایەکی دانیشتووی سارد وەرناگیرێت، بۆچی؟!! چونکە دەم و چاوی ناکاتەوە بۆ بینینی ئەو ناموسانەی کە دەتکێن، ئیهانە دەکرێن، چونکە سەرهەڵنابڕێ بۆ بینینی ئەو ئافرەتانەی کە خراپەیان لەگەڵ دەکرێت، کە بە زۆرەملێ لە ژێر چەپۆکی ژەهراوی گەنجە ئارەزووبازەکانی بێ باوەڕاندان؟! چونکە سەرهەڵنابڕێ بۆ بینینی خوێنەکان، خوێنی بێ تاوان لە منداڵی بێ گوناه و ژنان و پیاوانی پیر کە دەڕژێت و دەڕوات بە جۆرێ خەریکە لافاوێکی خوێن پێکبهێنێت. فەرماندەیەکی موجاهیدین لە (بکتیا) دەڵێ دە تەیارە دابەزین بۆ ناو لادێیەکی ئێمە، ئافرەتان و ژنانی ناو لادێکەیان گرت ئەو تەیارانە ژنەکانیان هەڵگرت، پاشان جلەکانیان لەبەر داڕنین بە تەواوی و هەڵیان دا بەسەر لادێکەدا، ئیشی ناشەرعیان لەگەڵ دە کردن و هەڵیان دەدان بۆ سەنگەری موجاهیدانی ئیسلام.

کیف القرار وکیف یهدأ المسلم | والمسلمات مع العدو المعتدي
القائلات إذا خشین فضیحة | جهد المقالة لیتنا لم نولد
أتسبي المسلمات بکل ثغر | و عیش المسلمین إذا یطیب
أما لله والاسلام حق | یدافع عنه شبان و شیب
فقل للذوي البصائر حیث کانوا | أجیبوا الله ویحکم أجیبوا

[بەڵێ چەندی جارەی دەکەینەوە و دەڵێین: ناتوانن لەم دینە تێ بگەن (ئیسلام) ئەو کەسانەی کە بزووتنەوەی پێ دەکەن بۆ ئەنجامدانی لەسەر زەویدا، ئەو کەسانە لێی تێ دەگەن کە سەرماو گەرما دەچێژن لە پێناویدا، یارەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لێی تێگەیشتبوون، چونکە خوا حافیزیان لە مەککە کرد و بەرەو مەدینە و بەرەو دوورگەی عەرەب بەرەو شام و رۆم کەوتنە ڕێ. ئەم دینە هەر ئەوەندە نییە کە بەسەر لاپەڕەوە

بخوێنرێتەوە، دەبێ لەسەر زەویدا ئەنجام بدرێت دەبا هەموو موسڵمانێك بزانێت ئەنجام نادرێت مەگەر لە ژێر گڕی گوللەدا نەبێت: ﴿تا نەبێ گوللەی گەرم، کەس لێمان ناکات شەرم﴾، چونکە حوکمی زیناکەر لە ئیسلامدا کوشتنە ئەگەر پیاو بوو ژنی هەبوو یاخود ئافرەت بوو شووی کردبوو، باشە پێم نالێی ئەم یاسایە چۆن ئەنجام دەدرێت، ئەگەر دەوڵەت لە ژێر هێزی سەربازگەی ئیسلامدا نەبێت؟!! حوکمی بکوژ کوشتنەوەیە چۆن دەتوانی ئەم یاسایە ئەنجام بدەی ئەگەر گوللە نەبێت؟ وەڵاممان بدەنەوە، زۆربەی یاساکانی ئیسلام ئەنجامدانەکەی بەستراوە بە بوونی هێزەوە. کەواتە ئەو کەسە لە دین تێ دەگات کە جیهاد دەکات، ئەو کەسە شارەزا و ئاشنای ئیسلامە کە موجاهیدە...].

## یەکتاپەرستی کردەوەیی (التوحید العملي)

**کوا بیروباوەڕی قەزاو قەدەر (عقیدة القدر) بەتایبەتی بیروباوەڕی ئەجەل، ترسان لەڕۆژی (ڕزق)، ترسان لە ژیان، بیروباوەڕێ کە مردن و ژیان و ڕۆزی و چاکە و ناڕەحەتی بە دەستی خوای گەورەیە، ئەمانە کەس نایپشکنێ و بە ڕاستی بیبینێ مەگەر موجاهید؟** [کەس لە مەیدانی کردەوەدا پەی پێ نابات مەگەر موجاهید]، **وە گەورەترین (عقدە) گرێ لە ژیانی موسڵمان بەتایبەتی بانگەوازان بریتیە لە ترس (الخوف)، ترسان لە مردن و (اجل)، ترسان لە ڕۆزی... بەڵام ئێمە بزانین کە خوای گەورە ڕۆزی دەرە (الرزاق)، وە بزانین خوای گەورە بەدیهێنەرو دروستکەرە (البدیع - الخالق)، ئەمە یەکتاپەرستی ڕواڵەتییە...**[ئەو یەکتاپەرستیەی کە زۆربەی پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) لەسەری دژایەتیان کراوە بریتیەلە (التوحید ألوهیة) واتە یەکتاپەرستی خوایەتی، باچاك **بۆت ڕوون** و ئاشکرا بێت پەی پێ نابەیت هەتاکو نەچیتە مەیدانی خوێنڕشتن و جیهادەوە، ئەو یەکتاپەرستیەی کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە پێناویدا نێردراون کەس پەی بەنهێنییەکەی نابات جگە لە مەجاهیدان] **بەڵام یەکتاپەرستی پەروەردگاری (توحید الربوبیه) ئەوە بێ باوەڕکانیش ئیمانیان پێی هەبوو** ﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ

وَٱلْأَبْصَٰرَ وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴾ یونس: ٣١ واته: ئەی پیغەمبەر ﷺ بڵێ به هاوبەش رەوادەران کێیه رۆزی ئێوه ئەدات له ئاسمانو زەوییەوە، له ئاسمانەوە بەهۆی بارانو له زەویشەوە بەهۆی رووەك و سەوزەوات و دانەوێڵەوە كه بەبەرچاوەوەیه، ئەی ئایا کێ خاوەن دەستەڵاته بەسەر دروست کردنی گوێو چاوەکانداو پێکهێنانی هێزی بیستن و بینین و خستنه کارو فرمانیانو له کارخستنیان؟ ئەی کێ زیندوو له مردوو دەردێنێ و مردوو له زیندوو دەردێنێ.[١] وه کێیه هەموو کارێکی به دەستەو ڕێکی ئەخات؟ ئەوا ئەڵێن خوا "الله".

بەڵێ هاوبەش رەوادەران بەمەیان دەزانیو باوەڕیان پێی هەبوو... خۆ ئەوان دەیانزانی خوای گەورە بەڕاستی رۆزی دەرو دروستکەرە" الرزاق، الخالق"، دەیانزانی بیستنو بینینی ئادەمیزادی به دەسته دەمرێنێو زیندووش دەکاتەوە، بەڵام وەستانی له مەیدانی جیهاددا دەری دەکات له یەکتاپەرستی ڕواڵەتی بۆ یەکتاپەرستی کردەوەیی، ئەمه یەکتاپەرستی خوایەتییه (توحید الألوهية) ئەمەی له ناو کتێبدا دەیخوێننەوه لەبەری دەکەین ئەمه ڕواڵەته، پێی ناوترێت یەکتاپەرستی تەواو [دەبێ ئەو خوێندنەوەیه بکەیته کردەوه بەخوێن، بەبیستنی، گرمه گرمی تۆپ و تەیاره و بریسکەی گولله هەتاکو ئاشکرای بکەیت که ڕاست دەکەی، ئەگەر هاوەڵانی پێغەمبەریش ﷺ دابنیشتنایه و به ڕواڵەت باسی یەکتاپەرستییان بکردایه ئەوه نەك به ماوەی (٣٠) ساڵ، بەڵکو به هەزار ساڵیش نەیاندەتوانی ئیسلام له ناو دورگەی عەرەبدا گەشەی پێبدەن] (توحيد الربوبية) یەکتاپەرستی ڕواڵەتییه، ڕواڵەته بۆ؟

---

[١] زانایانی تەفسیر دەفەرموون بەپێی ناسین و بۆچوونی خەڵکی لەو کاتەدا زیندوو بریتی بوو له هەر شتێ که گەشه بکات، یان بزووتنەوەی هەبێ و بجوڵێ، وه مردوو بریتی بوو له هەر شتێك كه هیچ کام لەو دوو نیشانەی نەبێت، کەواته واتا و مەبەست له پرسیارەکه دەردەکەوێت له دەرچوونی گیا و درەخت له ناوکه و دانەوێڵه، دەرچوونی بێچوو له هێلکه و هێلکه له بێچوو.

**چونکە ئێمە لێرەدا باوەڕمان بە کردەوەکانی خوا هەیە کە یەکتایە تیایانداو هابەشی نییە وەك باوەڕمان هەبێت کە خوا دروستکەرە، ڕۆزی دەرە، مرێنەرە، زیندووکەرەوەیە، هەموو شتێکی بە دەستە و هەموو ئیشێك بۆ ژێر فەرمانی ئەو دەگەڕێتەوە ـ جل جلاله ـ، بەڵام یەکتاپەرستی خوایەتی (الألوهية) ڕواڵەتی نییە، بەڵکو کردەوەیە، بۆچی؟ چونکە لێرەدا ئێمە دەبێ خوا بە تاك بگرین لە کردەوەی دروستکراوەکان وەك پشتبەستن بە خوای گەورە، بەس لە خوای گەورە بپاڕێینەوە، بەس لە خوای گەورە بترسین و ڕۆژوو بەس بۆ خوای گەورە بگرین و قوربانی هەر بۆ خوا بکەین، ئەمە لەم کاتەدا ڕواڵەت نییە، چونکە تۆ بە کردەوەی خۆت دەیسەلمێنی کە بیروباوەڕت وایە کە خوای گەورە یەکتایە و هاوەڵی نییە، ئەمەش ناتوانیت بە تەواوەتی لێی تێبگەیت، مەگەر لەناو جیهاددا، ئێمە چۆن پشت بە خوای گەورە ببەستین لە مەسەلەی ڕزقداو لە مەسەلەی ئەجەلداو هیچ هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەین؟ زۆر جوانە بەڵێ ئێمە خوێندوومانەتەوەو لەبەرمانە کە خوای گەورە ڕۆزی دەرە، بەڵام بەدرێژایی ساڵ کە من ڕۆیشتم پشتم دانەواندو غیرەتی پیاوەتی و ئیسلامەتی و خۆمم دانەواند و ڕوشاند، سەرم نزم کرد لەبەردەم فەرماندەیەکی ملهوڕی فاجیردا، وەلە ڕۆژی ڕەمەزاندا خواردەمەنیم بۆ پێشخست لە ترسی ئەوەی کە راتبەکەم کە بەدەستییەتی زیادی بکات یان کەمی نەکاتەوە، تو خوا ئەوە یەکتاپەرستییە؟...چ یەکتاپەرستییەك لەمەدا هەیە؟ کوا یەکتاپەرستی خوایەتی (الألوهية)** [ئەمە بەرهەڵستی یەکتاپەرستییە، ئەمە سەر شۆڕکردنە، ڕەگو ڕیشاڵی یەکتاپەرستی لە دەرونی هەڵدەکێشێت]... **یەکتاپەرستی، پیاوێکی هەواڵدەری دەوڵەت "المخابرات" بە یەك نامە کە دەینوسێتو هەواڵ دەدات بۆ سەر تەلەفون، ئیتر تەنگت پێهەڵدەچنێتو ژیانت لێ قوڵو پڕ لە ناسۆر دەکات "تاڵ و پیس دەکا" تەنانەت وات لێدەکات ماڵەکەی خۆشت لێ دەکات بەدوژمن، بەخەبەرت دێنێ لە خەوتنەکەت، کوا یەکتاپەرستی خوایەتی، یەکتاپەرستی خوایەتی بریتییە لە رزگاربوون لە گرێی ترسان لە رزق و ڕۆزی و ئەجەل. ئەمەش لێی تێناگەی مەگەر لە جیهاددا نەبێت.** [بەڵێ برۆ بۆ جیهادو خۆت تاقیبکەرەوە بیروباوەڕت تا چ ڕادەیەك لە

بارەی ئەجەلەوە دامەزراوە]، بۆیە (محمد حسن) کە یەکێك بوو لەو فەرماندانەی کە لە لای "جلال الدين حقانی" بوو لە کاتێکدا کە سواری ئەسپەکەی بوو بوو تا دوو سەد مەتر یان سێ سەد مەتر لە قەڵای ڕووسیەکانەوە دوور بوو لە بەردەمی قەڵاکەدا وەستابوو پێیان وت: ئەی برای بەڕێز خۆت دانەوێنە. ئەویش لە وەڵامدا ئەیوت ئەی برای بەرێزم ﴿ إِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَلَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴾ یونس: ٤٩ واتە: کاتێ کە کاتی دیاریی کراویان بێت و هاتبێ ئەوا لێی دوا نەکەوتوون و ناکەون ساتێك واتە "کەمترین" وەلێیشی پێش ناکەون. ئا بەو شێوەیە بوو... لەگەڵ ئەوەشدا واجبە ئینسان دەست بە هۆکارەکانییەوە بگرێت و حەزەری لێی هەبێت. چەندین موجاهیدی تر بەو شێوەیە بوون، بیروباوەڕیان بە مردن و ئەجەل دامەزرابوو [وە بە ڕاستی ئەم بەشە دەرونیە تەنها مەگەر "موجاهید" هەستی پێ بکات و پەی بە ڕاستیەکەی بەرێت] ئەوە "صفی الله افضلی" کە فەرماندەیەك بوو لە ناوچەی "هیرات" خوا لێی خۆش بێت شەهید بووە پێنج ساڵە بە هیچ شێوەیەك بەشداری و ئامادەیی بۆ شەر نەدەکرد ئەگەر لە ڕیزی یەکەمدا نەبووایە، هەمیشە لە شەڕو تێرژانەکاندا لە ڕیزی یەکەمدا بوو... پێیان دەوت و چەندین جار هاواریان دەکرد ئەی "صفی الله" تۆ فەرماندەیت و "جبهە" بە تۆیە بە کوژرانی تۆ "جبهە" دەڕوخێ و لاواز دەبێ، ئەویش لەوەڵامدا بە ئیمانێکی پاك و پڕ لە خواترسانەوە دەفەرموێت، بەدڵێکی ئەوینی پڕ لە کردەوەییەوە: ئایا خوای گەورە نا فەرموێت ﴿ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾ آل عمران: ١٤٥ واتە بۆ هیچ دەروونێك نییە کە بمرێت مەگەر بە ئیزن و فەرمانی خوا نەبێت؟... ئەمە بیرباوەڕی ئەم موجاهیدەیە لە مەسەلەی ئەجەلدا، ئایا بیروباوەڕی ئەم و بیروباوەڕی ئەو کەسەی کە لە شارەکەی خۆی دانیشتووە و ئەگەر ناوی "مخابرات"ێك ببیستێ دەست دەکات بە لەرزین وەك یەك وایە؟! پیاوێکی جاسوسی وڵاتەکە "تەقریرێك"ی لە بارەوە دەنوسێت ئیتر ژیانی لێ تەنگەڵان دەکات، خواردن و خوردنەوەی لێ تاڵ دەکات، دەروونی بێدار دەکات، تو خوا ئەمە دینە؟ ڕاستە؟ قەت تێ دەگات؟!! [ئایا ئەو موجاهیدەی کە سڵ لە گوللەی کوفر ناکاتەوە و ئەم موسڵمانە یەکێکن؟] ئەو

**یەکتاپەرستە و ئەمیش یەکتاپەرست!! ئەوە یەکتاپەرستییە و ئەمەش یەکتاپەرستییە؟!! بەڵێ موجاهیدە کە یەکتاپەرستی پەروەردگاری و یەکتاپەرستی خوایەتی تێدا ڕەنگ دەداتەوە (توحید الربوبیة) و (توحید الألوهیة)، بەڵام ئەو دانیشتوە سارد بووەتەوە تەنها یەکتاپەرستی پەروەردگاریی تێدایە (توحید الربوبیة)** [ئەم جۆرە یەکتاپەرستیەش بێ باوەڕەکانی قوڕەیش هەستیان پێدەکردو دانیان پێدا دەنا] **دراوسێیەکی ئەندازیارمان هەبوو ماوەیەك هات بۆ مزگەوتو پاشان لە مزگەوتدا نەم دەدیو دیار نەبوو بێتە مزگەوت، چووم بۆ لای و پێم ووت: ئەوە چییە ئەی بەرای بەرێز حاڵت چۆنە بۆچی لێمان وون بوویت؟! وتی: چونکە من دوو ووتارم لە تۆ بیست زۆر تووشی (حەماسەت)ی کردم. دوایی لە دەروونی خۆمدا وتم: بەڕاستی ئەم پیاوە دەیەوێت من تووشی حەماسەت بکات هەتاکو وشەیەك بڵێمو یەکسەر زنجیر بخەنە دەستمو فڕێم دەنە زیندانێك. کەواتە باشترین ڕێ ئەوەیە کە نەچم بۆ مزگەوت..!! ما شاء الله بەڕاستی ئەندازیارێکی زۆر گەورەیە!!کۆتای مانگە و گیرفانی پڕبێت، بەو شێوە، توخوا ئەمە یەکتاپەرستییە؟!! ئەمە یەکتاپەرستیە؟!! و "صفی الله"ش یەکتاپەرستە؟ یان ئەو موجاهیدانەی کە لە سەنگەرەکانیاندانو تەیارە گوللەبارانیان دەکات. چایی دروست دەکەن بەبێ شەکر!! ئەم ئەندازیارە یەکتاپەرستییەکەی یەکتاپەرستی پەروەردگارییە (توحید الربوبیة) لە مەسەلەی ئەجەلدا، بەڵام ئەو موجاهیدە سەربەرزە یەکتاپەرستە، یەکتاپەرستی خوایەتی (توحید الألوهیة) لە مەسەلەی ئەجەلدا. خۆ وەك زۆر جوان ڕوونو ئاشکرایەکە پێغەمبەران، بەڵێ پێغەمبەران سەلامی خوایان لەسەر بێت ڕەوانە کراون بە گشتی بۆ دامەزراندنی یەکتاپەرستی خوایەتی خوا لەناو گۆی زەویدا، بەڵام یەکتاپەرستی پەروەردگاریەتی خوا زۆر لە کاتەکانیان بەسەر نەبردوە لە بانگەوازەکەیاندا پێیەوە، چونکە شوێنی دان پیانانی هەموو لایەکیان بووە لە ناو خۆیاندا.** [دەباش بزانن چەند بارەی دەکەینەوە دەڵێین یەکتاپەرستی خوایەتی خوا جل جلالە لێی تێناگات مەگەر ڕێبواری ڕێگەی جیهاد نەبێت، مەگەر لە ناو جەرگەی تۆپو تۆزی جیهاددا]. **لەسەرەتاوە کە دێت بۆ جیهادی مەیدانی**

**"قتال" دەترسیت کە تامو بۆنی شەهیدەکانت کردئیتر تۆش تامەزرۆی دەبیو ترس لە دەرونتا نامێنێ، هەروەك چۆن هەندێ لە گەنجەکان بەمن دەڵێن: پێم دەڵێن ئێمە هاتووین بۆ لای ئەوەی کە فیشەك بەر تەوێڵمان بکەوێتو بچین بۆ بەهەشتی خوا پەنجە ڕادەکێشین بۆ ناوچاویان و بۆ ئاسمان، بۆ بەهەشت، دەست دەکەن بەگریان دەگرین و لە خۆشیدا کاتێك کە شەهیدێك دەبینن، وە دەشگرین لە داخ خەفەتو مەراقدا کاتێك کە ئەمیرەکانیان نایان بەن بۆ نا شەڕەکان** [(سبحان الله، الله اکبر)، ئایا ئەمە یەکتاپەرستی خوایەتی خوایە؟ ئایا ئەو کەسەی کە لەناو ماڵی خۆیدا دانیشتووە و مێشێ میوانی نییە؟] **ئەگەر دەتەوێ بزانیت مسوڵمانێك لە یەکتاپەرستی (الالوهیة) تێگەشتووە یان تێنەگەشتووە ئەوەی پێی بڵێ: پیاوێکی مخابرات ماڵەکە هێناوەتە لای ماڵەکەی ئێوە بووە بە دراوسێتان. وە بیستووشمە لە بارەی تۆوە شتی نووسیوە واتە "تقریر" لەو کاتەدا سەیری ناوچاوی بکە بزانە چۆن زەرد هەڵدەگەڕێت؟! سەیری بکە و بزانە دێت بۆ مزگەوت یەك حەفتە یان بەیەك جاری ڕێی مزگەوت تەرك بکات. کوا یەکتاپەرستی خوایەتی خوای گەورە. بەڕاستی نەفس پاك نابێتەوە نەرم نابێ، ڕوون نابێتەوە، دەروونو ڕۆحی ئینسان پاكو بێگەرد نابێت مەگەر لە ناو شەڕدا نەبێت، بۆچی؟ چونکە لەناو گوللەباران و ڕووبەڕووبوونەوەدا لە هەموو چرکەو ساتێك چاوەڕوانی مردن دەکات** [بۆیە دەروونی ئینسانی موسڵمان زۆر پاكو بێگەردە لە ناو جیهادا، چونکە دەروونی ئینسان هەتاکو زیاتر یادی مردن بکات زیاتر بە ترس تر لە خواو پاکتر دەبێت] **دەی لە ناو جیهاددا ئامادەیە لە هەموو چرکەیەکدا بۆ گەیشتن بە خوای گەورە، پوختو پاکە، نەرمە، ئاواتەخوازە بە گەیشتن بە خوای گەورەو خوای زاناو کارگێڕی ئاسمانەکانو هەر کەسێکیش پێی خۆش بێت بگات بە خوای گەورە خواش پێی خۆشە بگات بەو** [بەڕاستی دەروونی موسڵمان لە ناو "قتال"دا زۆر لە خوا ترس دەبێت، زۆر لە ئارەزووەکان گۆشەگیر دەبێت].

**ئەو دەروونە پڕە لە ترسی خوای زانا و کاربەجێ بەتایبەت زۆر لە تاوان دوور دەکەوێتەوە، یەکێك لە گەنجەکان ناوی "شاهد" بوو لە جیهاددا بوو، باوکی مرد،**

**ملیۆنێ درهەمی بەجێ هێڵا ـ جا نازانم ئەو ملیۆنە بەس بەشی شاهد بوو یان بەشی هەموویان بوو ـ نەهی و بەرهەڵستی کرد کە یەك درهەم هەڵبگرێت، وتی: ماڵ و پارەی باوکم گومان لیٚ کراوە، چونکە کاسپی و ئیشی بە سوو ـ ربا ـ کردووە، بەڵێ بەرهەڵستی کرد کە تەنانەت یەك درهەمیش هەڵبگریٚ ... بەڵێ پێمان بڵێن و بۆمان روون بکەنەوە.**

**دەروونی ئینسان چۆن لە ژەنگ و ژار پاك دەبیٚ، چۆن ئەوین دەبیٚ؟ چۆن رۆشن دەبیٚ وەك کانی جوان؟ وە چۆن دەگاتە ئەم ئەندازەیە کە یەك درهەمیش گومانی حەرامی تێدا بێت قووتی نەدا، چۆن ئەگاتە ئەو ئاستە بەبیٚ جیهاد؟ مەگەر نەفسی موجاهید وابیٚ، چونکە بە راستی جیهاد دەروونی ئینسان گەرم دەکات، گەرمی دەکات وەك ئاسنی گەرم، چونکە ئاسن گەرم ببێت ئەوە گوێڕایەڵ دەبێت هەموو شتێکی لیٚ دروست بکریٚ، پەنجەرەو دەرگاو شتی تر، چونکە ئاسنەکە گەرمە، بەڵام ئاسنی سارد ناتوانی هیچی لیٚ دروست بکەی، بەڵێ ئەمە جیاوازییە لە نێوان دەروونی موجاهیدی ڕێی خوا و دەروونێکی دانیشتوویەکی سارد بووەوە، موسڵمانی وا هەیە دانیشتووە لەناو پەڕاوو کتێبدا و دەڵیٚ فلان زانا وا دەڵیٚ و فلان زانا وای وتووە... با چاك بزانیٚ ناتوانیٚ لەم دینە تیٚ بگات** [بەڵیٚ زانا دەبیٚ، بەڵام تێگەیشتوو نابیٚ ، چونکە زۆر جیاوازی هەیە لە نێوان زانین و تێگەیشتندا... "العلم والفقه" وەك زانایانی "أصول الفقە" دەفەرموون].[1] **ئینجا مەسەلەی ڕۆزیش (الخوف علی الرزق) بەراستی کەسێکم نەبینیوە پشتی بە خوای گەورە بە شتیٚ قایم و بەهێز بێت وەك موجاهیدان بە هیچ شێوەیەك نەم بینیوە و ناشی بینم... بەڵیٚ پیاوی موجاهیدی وا هەیە کە کۆچی کردووە بووە بە موهاجیر و ماڵی نییە و ناشتوانیٚ ماڵ و حاڵ بکاتەوە لە ناو چادردان برۆ ژوورەوە دەیانبینی کە دەستەکانیان بەرزکردووەتەوە بۆ ئاسمان بۆ هاوار کردن لە پەروەردگار.** [بەراستی جیهاد وا لە ئینسان دەکات کە هەمیشە لەوپەڕی برسێتییدا پەنا بەس بۆ خوای گەورە بەرێت]...

---

[1] الوجیز في أصول الفقه، ص١١٨.

یەکێك لە برایانی خەڵکی سعودیە چادری دابەش دەکرد لەگەڵ خواردەمەنیدا بۆ کۆمەڵێ لە کۆچەران کە ئەوەندە هەژار بوون نزیك بوو لە برساندا بمرن، هیچ چادر و خواردەمەنییان نەبوو، جا ئەو برایە بۆ منی گێڕایەوە و پێی وتم: نزیك بوو خۆر ئاوا بێت لە نێوان چادرەکانیاندا هەڵسام و نوێژم کرد، بەڵام من پێڵاوم دانەکەندبوو لە پێدا، لە کاتی نوێژەکەدا سەیر دەکەم ئەو پیاوە پیرە هات بە خۆی و چادرەکەی و خواردەمەنییەکە و چادر و خواردەمەنییەکەی دا بە ناوچاومدا و وتی: هەڵگرە من یارمەتی تۆم ناوێ، دەست گرۆیی تۆم ناوێ، منیش وتم بۆ لەبەرچی؟ من چیم لەگەڵ تۆدا کردووە؟ وتی تۆ خوای گەورە، بە گەورە و جەلال ناگریت، منیش وتم چۆن؟ وتی بە پێڵاوەوە نوێژ دەکەی، تۆ رێزی خوای گەورە ناکریت، منیش دەست گرۆیی تۆ وەرناگرم و لە تۆوە هیچ شتێك وەرناگرم، جا منیش چووم بۆ لای ئەفغانییەك و هێنام و تێمەگەیاند ئەم نوێژکردنە سوننەتە، چونکە فەرموودە هەیە کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی بە پێڵاوەوە کردووە، کاتێ کە پیاوە پیرەکە تێگەیشت لە مەسەلەکە وتی: بەڵێ ئێستا یارمەتی و دەست گرۆیی وەردەگرم.

(نیکسۆن) سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هات بۆ پیشاوەر، نزیك بوویەوە بۆ ئەوەی سڵاو لە پیاوێکی پیری ئەفغانی بکات، بەڵام پیاوە پیرەکە دەستی بەردا و نەیگرت... پاکستانییەکان دەیانوت: ئەمە سەرۆکی وڵاتی ئەمریکایە، ئەویش وتی: ئەزانم سەرۆکی ئەمریکایە، بەڵام من تەوقەی لەگەڵدا ناکەم، چونکە کافرە!!! [بەڵێ ئەمە دەروونی موجاهیدە] کوا سەربەرزی و عیززەت؟ چی دەکەی بە عیززەت؟!! چۆن دەگونجێ و دەتوانی لەسەر عەقیدە و بیروباوەڕ پەروەردەی بکەیت؟!! چۆن دەگونجێ و بە چ شێوەیەك دەبێ پەروەردەکردنی یەکتاپەرستی خوایەتی خوا ـ توحید الألوهية ـ ؟ سوێند بە خوا ئەی موسڵمان بە عیززەت ترین کەس موجاهیدە لەسەر ئەم زەویەدا، هەستم کرد کە بە عیززەت ترین ئینسانم لەسەر ئەم زەویەدا و زانیم و دەستم کەوت کە ژیانی من تەنها حەوت ساڵە و بەس، ئەویش ئەو ساڵانەیە کە لەناو جیهادو بەرگری لە ئیسلامدا بەسەرمبردووە، ئەو ساڵانەی کە لەناو بەرگری لە شەرەف و نامووسی موسڵماناندا

**تێپەڕم کردووە ئەو حەوت ساڵەش ساڵێکی لە فەلەستین و شەش ساڵیش لە ئەفغانستان، بەراستی ئەوە هەموو ژیان و عومری من بوو، ساڵەکانی تری ژیانم بەراستی ژیان نەبوو، بۆچی؟ چونکە لەناو جیهاددا بەسەر نەبراوە، چونکە ژیان ئەو ژیانەیە کە لەناو (قتال)دا ببرێتە سەر، ئایا ئەمە ژیانی راست و تەواو و دروست نییە؟ سوێند بە خوا پێم دەڵێن فلان کەس و فیسارە کەس رقی لێتە، تووڕەش بووە لێت، هەڕەشەت لێ دەکات، فلان سەرۆکی فلان دەوڵەت کۆنگرەت لەسەر دەگرێ، ... وە چەند راز و نیازی تر، پێم دەڵێن هەواڵەرانی کوفر "المخابرات" لە لاتن و قسەکانت هەموو تۆمار دەکەن، بەراستی پێم دەڵێن: پیاوێك لە مخابەراتی فلان شار یان فلان وڵات لە لاتە، هەروەکو ئەوان وا دەزانم پێم دەڵێن: "متنبي"یە و شیعر بە سەر "سیف الدولة"دا هەڵدەدا و مەدحی دەکات...** [بەڵێ بە کورتی دەڵێین: مەیدانی جیهاد تاقیگەیە و هەرکەسێ بیەوێ ئیمانی خۆی تاقی بکاتەوە دەبێ بچێت بۆ ئەو مەیدانە، بەراستی نەك دە ساڵ و بیست ساڵ شەونوێژ بکەیت و قورئان بخوێنیت سەد ساڵیش شەونوێژ بکەیت و بەرۆژوو بیت هەتاکو نەچیتە ناو قتال پەی بە ئیمانی خۆت نابەی، وەرە بۆ قیتال کاتێ لە هەر چوار لاوە گوللەی ئاگرینت بۆ دێ و تۆش دڵەڕاوکێ دەکەی، ئەو کاتە تۆ بۆت دەردەکەوێ کە دڵت خۆشە و پێویستت بە چارەسەرکردن هەیە، ئەو کاتە دەزانیت ئایا بە تەواوی باوەڕت بە قیامەت هەیە یان باوەڕت نییە، داوا دەکەین لە خوای گەورە بۆ خاتری ناوە جوانەکانی خۆی کە وامان لێ بکات هەمیشە خۆشحاڵ بین ژیانی خۆمان لەناو جیهاددا بەسەربەرین، خوایە گیان ئێمەی بەندە دەپاڕێینەوە و دەڵێین قیتال لە پێناوی خوادا لە ناو دڵەکانماندا خۆشەویست بکە، لەشی ساغ و چالاکمان پێ ببەخشە بۆ ئەوەی بتوانین لە جیهاددا بیرزێنین، هەتاکو بە رووی بەرز و سپییەوە بەناو فیردەوس بگەین بە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ لەسەر حەوزی کەوسەر، ئەو حەوزەی کە ئاوەکەی لە هەنگوین شیرینترە و لە شیر سپی ترە و لە بەفر سارد ترە و هەروەك چۆن لە فەرموودەدا هاتووە، ئامین].....

## حوکمی جیهاد لە ڕێی خوادا

## بە مەرجگرتنی ( محرم )... بۆ ئافرەت لە ناو جیهاددا

بەراستی ئێمە ماوەیەك بەیانی و ئێوارە لەناو جیهاددایین لە پێناوی خوادا، چەند بارەیشی دەکەینەوە و دەڵێین: ئێستا جیهادکردنمان لە پێناوی خوادا فەرزی عەینە لەسەر هەموو موسڵمانێك، ئەمەش یاسا و ڕێیەکە کە شوێنی دان پیانانی هەموو ئەو زانایانەیە کە لە بارەی جیهادەوە نووسیویانە بە گشتی دەفەرموون: ئەگەر پارچە زەویەك "بستێك" لە خاکی ئیمانداران داگیر کراو یاسای کوفر بەسەریەوە بوو ئەوە جیهاد دەبێتە فەرزی عەین لەسەر هەموو موسڵمانێك وەك نوێژ بە جۆرێك ئافرەت دەردەچێت بەبێ ئیزنی مێردەکەی، بەڵام لەگەڵ (محرم)دا دەبێ دەرچێت، وە کۆمەڵێك لەو زانا بەڕێزانە، تەنانەت بە مەرجی ناگرن بوونی (محرم) لەگەڵ ئافرەتاندا بۆ جیهاد، یەکێك لەو زانا بەڕێزانە ئیبن تەیمیەیە کە بەڵگەی هێناوەتەوە بەوەی کە زۆر لە ئافرەتانی هاوڕێی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچیان کردووە لە شاری مەککە بۆ مەدینە بەبێ ئەوەی (محرم)یان لەگەڵدا بێت. تەنانەت کۆمەڵێ زانای بەڕێز بە مەرجی ناگرن بوونی کەرەسەی سواری و خواردەمەنی بۆ دەرچوون بۆ جیهاد، واتە وەك "حەج" سەردانی ماڵی خوا، بەڵام هەندێ لە زانایان دەفەرموون: مەرجە کە دەبێ وڵاخێکی سوارت "السیارة" لەگەڵدا بێت هەتا بتوانیت بگەی بە ماڵی خوا.... وە دەبێ ئەوەندە خواردەمەنیشت لەگەڵدا بێت کە ئەبێتە قووت لە ڕێگەدا واتە لەسەردانی ماڵی خوا، بەڵام شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە ئەفەرموێ: نەخێر لە سەردانی ماڵی خواشدا بەمەرج ناگیرێت وڵاخ و خواردەمەنی مادام جیهاد و کۆچ کردن تێیدا بە مەرج نەگیراوە، چونکە عوبادەی کوڕی صامیت (خوا لێی رازی بێت) دەفەرموێ: "بایعنا رسول الله ﷺ علی السمع والطاعة في العسر والیسر".[1] پەیمان و بەیعەتمان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر بیستن و

---

[1] البدایة والنهایة، ابن کثیر.

گوێڕایەڵی لە ناڕەحەتی و خۆشیدا. ئیبن تەیمیە ئەفەرموێ: (في العسر) واتە لە کاتی نەبوونی ولاَخ و خواردەمەنیدا، (وفي اليسر) واتە لە هەرچیدا کە ڕازی بین پێی و پێمانیش ناخۆش بێت، (وعلى آثرة علينا) واتە: لە کاتێکیشدا کە ئەگەر باوی خەڵکی بدرێت بەسەرماندا... بەڵێ بە ڕاستی ئافرەتانی هاوڕێی پێغەمبەری خوا ﷺ بە هەمان شێوە کۆچیان کردووە (أم أيمن) کۆچی کرد یان دایکی ئوسامەی کوڕی زەید[1] کۆچی کرد، (أم أيمن) ـ خوای لیٚ ڕازی بێت ـ کۆچی کرد لە ڕێی خوادا لە ڕێگەدا تووشی تینوویەتی بوو بە تینوویەتیەکی زۆر ناڕەحەت و توند، نزیك بوو لە تینوواندا بمرێت، ئا لەو کاتەدا دەمی وشك بوو، دۆڵکەیەك لە ئاسمانەوە بۆی ڕژا پڕ لە ئاو و ئاوی خواردەوە، ئیتر ئەم ئافرەتە بەڕێزە لەدوای ئەم ئاو خواردنەوە بە هیچ شێوەیەك تینووی نەدەبوو، تەنانەت جاری وا هەبوو لە ڕۆژانی هاویندا ڕۆژانی زۆر توند و گەرما، ڕۆژانی دوور و درێژی هاوین ڕۆژوی دەگرت، چونکە تینوویەتی کاری تێنەدەکرد بەهیچ شێوەیەك تینووی نەدەبوو.

بەڵێ ئوم ئەیمەن کۆچی کرد بێ محرم، عائیشە و دایکی کۆچیان کرد بەبێ محرم، زەینەبی کچی پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بەبێ محرم، هێوەرەکەی سەرپەرشتی دەکرد، واتە برای مێردەکەی، پیاوەکەی (أبو العاص بن الربيع)، زەینەب بەسەر حوشترێکەوە بوو، (هباری کوڕی ئەسوەد) لەعنەی خوای لیٚ بیٚ هەڵسا چوو بۆ لای حوشترەکەی زەینەب لێی دەدا، ئا لەو کاتەدا حوشترەکە خۆی نەگرت و لەقەی

---

[1] ئەم ئافرەتە ئافرەتێکی هەژار بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ مارەی بڕی لە زەید و کوڕێکی بوو ناوی نا (ئوسامە)، ئەم ئافرەتە خۆی زۆر ڕەش بوو، زەیدیش ڕەشتر بوو، بەلاَم (ئوسامە) سپی بوو، لەبەرئەوەی هەندێك خەڵك گومانیان هەبوو لە کوڕایەتی ئوسامەی کوڕی زەید. ئەم ئوسامەیە زۆر خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ بوو، وەك کوڕی خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ بوو ناویان نا (خۆشەویستی کوڕی خۆشەویست) ڕۆژێکیان ئوسامە لەگەڵ باوکیدا خەوتبوو لە ژێر لێفەکەیدا، لە ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ (مدلجی) هاتە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەم پیاوە عاقڵ بوو، واتە خەڵکی قیافە بوو، ئەو کەسانەن کە سەیری ئینسان ئەکەن ئەزانن کوڕی کێیە، بە بالاَو ڕەنگ و شێوەدا، ئوسامە و زەیدیش سەرو دەم و چاویان داپۆشرا بوو، بەلاَم قاچیان دەرکەوتبوو، ئەم پیاوە کە سەیری قاچیانی کرد وتی: ئەم قاچانە لەم پیاوەن، پێغەمبەری خواش ﷺ زۆر دڵخۆش بوو بەمە.

وەشاند و خۆی جولاند هەتاکو زەینەبی خستە خوار بە پشتا، حوشترەکە ئارامی نەما، زەینەب بەسەر پشتییەوە بێت، زەینەب سکی پڕ بوو لەو کاتەدا کە خستیە خوارەوە سکەکەی لەبارچوو، بەڵی کچی پێغەمبەر ﷺ لەناو سکیدا منداڵێکی لەبارچوو بۆی نەما. کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەمەی زانی فەرمووی: (إذا وجدتم هباراً و فلانا ـ الأثنين ـ فحرقوهما، ثم قال إنه لا يعذب بالنار إلا رب النار، وقال اقتلوهما) (رواه البخاري). واتە: ئەگەر هەبار و فلان کەستان دەستکەوت ئەوە بیانسوتێنن، پاشان فەرمووی: بەڕاستی کەس ناتوانێ سزا بدات بە ئاگر مەگەر خاوەنی ئاگر نەبێت، واتە خوای گەورە جل جلالە، فەرمووی: بیان کوژن. [چۆن تووڕە نەبێت پێغەمبەری خوا ﷺ ئافرەتی موسڵمان گاڵتەی پێ بکرێ؟!! پێغەمبەری خوا ﷺ زەلیلی و سەرکزی بە هیچ شێوەیەك قبوڵ نەدەکرد، لەو کاتەوە کە فەرمانی جیهادی کافرانی پێ درا، ئیتر لە هەر قوژبنێکدا دەستدرێژی بکرایەتە سەر ئیسلام یەکسەر هێرشی بۆ دەبرد و سەرکوتی دەکرد][1].

بەڵێ ئەوەی پێویستە لێرەدا بزانین ئەوەیە: کە ئافرەتان لە زەمانی پێغەمبەردا ﷺ کۆچیان کردووە بەبێ محرم، بەراستی کۆچ کردنیش بارنەیەکە لە بارنەکانی جیهاد، کەواتە ئەگەر کۆچ کردن فەرز بێت بەبێ محرم و بەبێ وڵاخ و خواردەمەنی وەك "ئیبن تەیمیە" فەرموی: ئەوە جیهاد ئەولاتر فەرزو واجبە. [وەك دەزانرێت ئەم یاسایە شوێنی دان پیانانی هەموو زانایانی ئیسلامە] کەواتە بۆیە ئیبن تەیمیە ـ خوای لێ رازی بێ ـ ئەفەرموێ: (فإذا أراد العدو الهجوم على بلاد المسلمين وجب الخروج إليه مع القلة والكثرة، مع المشي والركوب، ولو وجد عشرة خارجين أخرج معهم مع المشي والركوب). واتە: ئەگەر هاتوو دوژمن ویستی هێرش بکاتە سەر شاری موسڵمانان واجب ئەبێت دەرچوون بۆ لای ئەو شارە لەگەڵ کەمو زۆردا، لەگەڵ پیادە و سواردا، ئەگەر ببینیت دە کەسیش دەردەچن تۆش دەرچۆ لەگەڵیان، لەگەڵ

---

[1] لە شاری مەدینە لەسەر ئافرەتێکی موسڵمان سەری بە (٧٠٠) جولەکە شۆڕ کرد و دەری کردن (سەردار).

**پیادە و سواردا، واتە: سعودی، میصری، عێراقی.... ئیبن تەیمیە لە ژێر ڕۆشنایی قورئاندا واجبی دەکات لەسەر ئەو کەسەی کە پارەی کرێی نییە دەبێ بەپێی خۆی لە قاهیرەوە بۆ ئەفغانستان بەبێ ئیزنی خاوەن قەرز ئەگەر قەرزار بوو، بەبێ ئیزنی باوک و دایک، بەڵێ چەندین جار دووبارەی دەکەینەوە و دەڵێین: قاعیدەیەك کە هەموو زانایانی ئیسلام دانیان پێدا ناوە دەڵێن ئەگەر دوژمنی کافر بستێك لە زەوی موسڵمانانی داگیر کرد یەك بست!! (فقهاء) ئەندازەیان بۆ داناوە و دیارییان کردووە کە ئەو بستە با دۆڵ بێت یان شاخ بێت یان دەشت بێت، با بەرەوژوورکە و بەرەوخوارکە بێت، هەمووی یەکێکە، ئەوە جیهاد دەبێتە فەرزی عەین لەسەر هەموو موسڵمانێك، دەبێ ئافرەت دەرچێ بەبێ یارمەتی و ئیزنی مێردەکەی، تەنانەت کۆمەڵێ فقهاء محرمیش بەمەرج ناگرن لەگەڵیدا بێت، قەرزار دەرچێت بەبێ ئیزنی خاوەن قەرزەکەی، کوڕ دەرچێت بەبێ ئیزنی باوك، چونکە جیهاد بووە بە فەرزی عەین، ئەگەر موسڵمانی ئەو ناوچەیە کەمتەرخەمییان کرد یان تەمبەڵی و تەوەزەلییان کرد، یان لایاندا و وازیان هێنا لێی، یان دوژمنیان بۆ دەرنەکراو بەڵام وازیشیان نەدەهێنا، بەهەرجۆر بێت ئەو فەرزە عەینە بڵاوە دەکات بۆ ئەوانەی کە نزیکیانن، ئینجا نزیکتر... نزیکتر، هەتاکو ئەو فەرزە عەینە هەموو زەوی بە گشتی بگرێتەوە، فەرزێك وەك نوێژ و ڕۆژوو ناتوانن تەرکی بکەن و وازی لێ بهێنن، هەتاکو ئەو دوژمنە بەرەنگاری بکرێت و بخرێتە دواوە، هەتا دوژمن لەو شارە یان ئەو لادێیەی ئیسلامدا دەرچێت و دەرکرێت ئیزنی باوکیش بە هیچ شێوەیەك نەهاتووە ئەگەر جیهاد بوو بە فەرزی عەین، ئەمەش قسەی من نییە،** [بەڵکو گوفتاری هەموو فوقەهای ئیسلامن، چونکە ئەو زانا بەڕێزانە لە بنچینەی ئیسلام تێگەیشتوون و شارەزان، وەك ئێمە نین لە بارەی جیهادەوە بە ئارەزووبازی قسە بکەین..].

## پرس و ئیزن وەرگرتنی دایك و باوك بۆ جیهاد

**زانای پایەبەرز (بن باز) خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ژیانیەوە، فەرمووی: بەراستی ئێستا جیهاد کردن فەرزی عەینە، بەڵام ئیزن وەرگرتنی باوك و دایك فەرزە، واتە واجبە ئیزن وەربگرێت لە دایك و باوك پاشان بچێت بۆ جیهاد، منیش لە وەڵامدا پێم وت: ئەی مامۆستای بەڕێز لەمەدا هیچ کەسێك پێشت نەکەوتووە، لە (فقهاء)ەکان، واتە زانایانی (سلف) پێشین، لە پێشدا ئەم بۆچوونەیان نەبووە، کە ئیزن وەرگرتن لە دایك و باوك فەرز بێت، لەکاتێکدا کە جیهاد بوو بە فەرزی عەین، هەموو (فقهاء)کان دەفەرموون: لە فەرزە عەینەکاندا ئیزن وەرگرتن نییە و پێویست ناکات، ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: ئەی مامۆستا عەبدوڵڵا نازانی فەرموودەکە دەفەرموێت: (ففيهما فجاهد)، منیش وتم پێی: ئەی فەرموودەکەی تر کە دەفەرموێت: (والذي بعثك بالحق لأتركهما وأجاهد). ئەویش فەرمووی: بەراستی تۆ زاناتری ئەی عەبدوڵڵا عزام، پاشان فەرمووی: بەڵام فەرموودەی یەکەم بەهێزترە.**

[بەڵێ ئەم دوو فەرموودەن لەبارەی ئیزن وەرگرتن لە بارەی دایك و باوك بۆ جیهاد و لە رواڵەتی فەرموودەکاندا جیاوازیەك هەیە. بەڵام زانایانی ئیسلام خوایان لێ رازی بێت، ئەم دوو فەرموودەیەیان کۆکردووەتەوە بەشێوەیەك هیچ جیاوازییان تێدا نەماوە، جا ئەمە فەرموودەکانە و پاشان گوفتاری زانایانی ئیسلام دێنین لە چۆنیەتی کۆکردنەوەکەدا:

١ـ عن عبد الله بن عمرو رضى الله تعالى عنهما قال: جاء رجل إلى النبي ﷺ فاستأذنه في الجهاد، فقال: "أحي والداك؟" قال: نعم. قال: "ففيهما فجاهد". رواه البخاري.

واتە: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ داوای ئیزنی لێ کرد بۆ جیهاد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا دایك و باوکت زیندوون؟ ئەویش وتی: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: برۆ جیهادی ئەوان بکە، واتە: برۆ رازییان بکە و بەخێویان بکە.

٢ـ وفي رواية: أتى رجل فقال يا رسول الله ﷺ: إني جئت أريد الجهاد معك أبتغي وجه الله والدار الآخرة ولقد أتيت وإن والدي ليبكيان. قال: "فارجع إليهما فأضحكهما كما أبكيتهما".

رواه احمد.

واته: له گێڕانەوەیەکی تردا هاتووه: پیاوێك هات و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من هاتووم جیهادت لەگەڵدا بکەم، بەراستی من هاتووم، بەڵام دایك و باوکم دەگریان، واته: بە هۆی هاتنی من بۆ جیهاد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بگەڕێرەوه بۆ لایان پێیان بکەنێنه، بیانخه پێکەنینەوه چۆن گریاندنت.

٣ـ وعن أبي سعيد أن رجلا هاجر إلى النبي ﷺ من اليمن فقال: هل لك أحد باليمن؟ فقال أبواني، فقال: أذنا لك؟ قال: لا، قال: "ارجع إلى اليهما فاستأذنهما فإذا أذنا لك فجاهد، وإلا فبرهما". رواه أبوداود ـ و صححه الالباني.

واته: پیاوێك له یەمەنەوه کۆچی کرد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا کەست هەیه له یەمەندا؟ وتی: دایك و باوکم هەیه، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا مۆڵەتیان دای هاتی؟ وتی: نەخێر، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بگەڕێرەوه بۆ لایان و داوای ئیزنیان لێ بکە، ئەگەر ئیزنیان دای ئەوه وەرەوه جیهاد بکە. ئەگەر ئیزنیان نەدای ئەوه چاکەیان لەگەڵدا بکە.

٤ـ عن عبد الله بن عمرو قال: "جاء رجل إلى النبي ﷺ فسأله عن أفضل الأعمال. قال: "الصلاة"، قال: ثم من؟ قال: "الجهاد". قال: فإن لي والدين. قال: "آمرك بوالديك خيراً"، فقال: والذي بعثك فينا لأجاهدن ولأتركنهما، قال : "فأنت أعلم". أخرجه ابن حبان ـ قال شعيب الارناؤوط ـ إسناده حسن.

واته: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێ کرد له بارەی گەورەترین کردەوەوه، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نوێژ کردن، وتی: پاشان چی تر؟ فەرمووی: جیهاد کردن، ئەویش وتی: دەی بەراستی باوكو دایکم هەیه، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: فەرمانت پێدەکەم به دایك و باوکت به چاکە، ئەویش وتی: سوێند بەوەی که تۆی ناردووه بۆ ناومان جیهاد دەکەم و وازیان لێ دەهێنم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خۆت چاکتر دەزانی.

ئەمه فەرموودەکانه، بەراستی وەکو وتمان سێ فەرموودەکەی یەکەم لەگەڵ فەرموودەی چوارەمدا له رواڵەتدا جیاوازن، بەڵام زانایانی ئیسلام کۆیان کردوونەتەوه، به جۆرێك که هەموویان دانیان بەو کۆکردنەوەیەدا ناوه، ئەمەش هەندێ له گوفتاری زانایانه:

١ـ ئیمام شەوكانی لە كتێبی (نیل الأوطار)دا جوزئی (٧) لاپەڕە (٤٨) لە دوای هێنانی سێ فەرموودەكەی پێشوودا دەفەرموێت: (وهذا كله إن لم يتعين عليه الجهاد، فإذا تعين فتركه معصية، ولا طاعة لمخلوق في معصية الخالق)، واتە: ئەمە هەمووی ـ ئەم سێ فەرموودەیە ـ فەرمان دەكات بە ئیزن وەرگرتنی دایك و باوك ئەگەر جیهادی لە سەر نەبوو بوو بە فەرزی عەین، بەڵام ئەگەر بوو بە فەرزی عەین، ئەوا وازهێنان لە جیهاد تاوانە و پێویستی بە مۆڵەتی دایك و باوك نییە. چونكە گوێڕایەڵی نییە و ناكرێ بۆ دروست كراو ـ مرۆڤ ـ لەسەرپێچی خوای گەورەدا، یان دەفەرموێت: لەبارەی فەرموودەی چوارەمەوە (فإذا تعين الجهاد فلا إذن، ويشهد لهما. أخرجه ابن عمر). واتە: ئەگەر جیهاد بوو بە فەرزی عەین ئەوە یارمەتی و ئیزنی دایك و باوك نییە، واتە پێویست ناكات، وە گەواهی دەكات بۆ ئەم فەرموودەیەی كە ئیبن عومەر دەگێڕێتەوە، واتە: فەرموودەی چوارەم.

٢ـ (سیدسابق) لە كتێبی (فقه السنة)دا جزئی ٣ لاپەڕە ٣٢ لەگەڵ هێنانی ئەو سێ فەرموودەی یەكەمدا دەفەرموێ: (الجهاد الواجب لا يعتبر فيه إذن الوالدين أما جهاد التطوع فإنه لابد فيه من إذن الوالدين). واتە: ئەگەر جیهادی فەرزی عەین بوو مۆڵەتی دایك و باوك بە مەرجێك دانانرێ، بەڵام جیهادی سوننەت ئەوە لە ناویدا هەر دەبێت یارمەتی و ئیزنی دایك و باوك وەربگرێت.

٣ـ ئیمام (الصنعانی) لە كتێبی (سبل السلام) لە جزئی ٤ لاپەڕە ٤٢دا دەفەرموێ: (ذهب الجماهير من العلماء أنه يحرم الجهاد على الولد إذا منعه الأبوان أو إحداهما بشرط أن يكونا مسلمين لأن برهما فرض عين والجهاد فرض كيفاية، فإذا تعين الجهاد فلا). واتە: زۆربەی كۆی زانایان رۆیشتوون لەسەر ئەوەی كە جیهاد كردن حەرامە لەسەر كوڕ ئەگەر دایك و باوكی یان یەكێكیان بەرهەڵستیان كرد لە جیهاد، بە مەرجێ موسڵمان بن، چونكە چاكە كردن لەگەڵ دایك و باوكدا فەرزی عەینە، بەڵام جیهاد فەرزی كیفایەیە، ئەگەر جیهاد بوو بە فەرزی عەین ئەوە مۆڵەت لە دایك و باوك نییە، واتە پێویست ناكات. ئەم گوفتارەش لە كاتی هێنانی فەرموودەی یەكەمدا فەرمووە، واتە فەرموودەی (ففيهما فجاهد).

٤ـ ئیمام (ئیبن حەجەر عەسقەلانی) لە كتێبی (فتح الباری ـ شرح صحيح البخاری) جزئی ٢ لاپەڕە ١٤١دا ئەم فەرموودانەی كۆكردووەتەوە دەفەرموێت: (الحديث الأول في فرض الكيفاية

والحديث الثاني في فرض العين). واتە: فەرموودەی یەكەم لە كاتی فەرزی كیفایەیە، فەرموودەی دووەم لە كاتی فەرزی عەیندایە، واتە ئەو فەرموودانەی كە فەرمان دەكات بە وەرگرتنی ئیزن لە دایك و باوك لە كاتی فەرزی كیفایەدایە ئەو فەرموودەی كە گوێ نەدان بە ئیزنی دایك و باوكی تێدایە لە كاتی فەرزی عەیندایە. پاشان دێینەوە سەر گفتوگۆكەی عبدالله عزام و ئیبن باز كە دەفەرموێ:] **لەراستییدا من شەرم ئەكەم موناقەشەی لەگەڵدا بكەم، چونكە ئەو پیاوێكە وەك باوكم وایە، پاشان فەرمووی: ئەی مامۆستا عبدالله تۆ لەسەر فتواكەت جێگیر بەو منیش لەسەر فتواكەم جێگیر دەبم، بەڵێ ئەوە كە مامۆستا ئەلبانی، مامۆستا ئیبن عثیمین لایان داوە بۆ لای، ئەوەیە كە ئەمڕۆ جیهاد كردن فەرزی عەینە... ئێستا جیهاد فەرزی عەینە و دەفەرموون پێویست ناكات بە وەرگرتنی ئیزنی دایك و باوك... مەگەر لەكاتێكدا نەبێت كە یەك كوڕ بێت و دایك و باوكی پێویستیان پێی هەبێت... ئەگەر پێویستیان پێی هەبوو ئەوە ئیزن لە دایك و باوك وەردەگرێت، بەڵام ئەگەر پێویستیان پێی نەبوو ئیزن وەرناگرێت، ئەمە فتوای (مامۆستا البانی و ابن عثیمین)ە لە هەفتەی پێشوودا كە زۆر دوور نییە، تەنانەت یەكێك لەوانەی كە دانیشتبوون لەلای مامۆستا (البانی) پێی وت: ئەی مامۆستا ئەگەر جیهاد ئێستا راست بێت لە ئەفغانستان، كەواتە فەرزی عەینە. مامۆستا ئەلبانی وەلامی دایەوە و فەرمووی:(ئەگەر جیهاد كردن ئەمڕۆ لە ئەفغانستان حەق و راستی نەبێت، ئیتر كامەیە جیهادی راست و رەوا لەسەر زەویدا.)**

**پاشان ئەگەر تۆ داوای ئیزن دەكەی لە دایك و باوكت پێم ناڵێی چ دایك و باوكێك ئیزن دەدات بە كوڕەكەی بچێت بۆ مەیدانی شەڕ!! دەست ناكەوێ و نییە دایكێك چاوپۆشی بكات لە كوڕەكەی دەرچێت بۆ شەڕ ئەمەش شتێكی سروشتییە و گومانی تێدا نییە گریانی دایكو باوك، خەفەت خواردنی دایك، ئەمە هەر بووە و هەر هەیە، من دایكم تەمەنی ٨٥ ساڵە و ئێستا ماوە ئومێدەوارم كە خوای گەورە بەرەكەت بخاتە ژیانییەوە، هەرجارێ دێت بۆ لام دەست دەكات بە گریان، وە دەردەچێت بۆ لای دەرگای ماڵەكە و ماچم دەكات و دەمگوشێ بەخۆیەوە، زۆرجار**

**کە دەردەچم دوام دەکەوێت و قاچم دەگرێت بەردەوام، ئەمە دایکی منە، ئەی دایکی نموونەی وەکو ئێوە چۆن بێت؟!! لە کاتێکدا کە من چەند ساڵێکە لەناو جیهاددا دەژیم، بەڵێ شتێکی سروشتییە، دایکت بۆت دەگری، دایکت کە بەجێت هێڵا نەخۆش دەکەوێت، بەڵام ئێمە یاسا و بنچینەکانمان لایە کە بە ڕاستی بەرژەوەندی دین پێشکەوتووە لە بەرژەوەندی نەفس، مانەوە لە لای دایك و باوك خەفەتیان لادەچێت، فرمێسکیان وشك دەبێتەوە، نەفسیان دەپارێزێ، بەڵام بە دەیان موسڵمان خوێنیان دەڕێژرێ** [باوکی تۆ فرمێسکی سەر ریشی وشك دەبێتەوە، بەڵام بە هەزاران خوشکی موسڵمان سکیان پڕ دەبێت لە کۆرپەی زۆڵ بە وازهێنان لە جیهاد، کەواتە با دایکی تۆ لە گریاندا بێت، بەڵام جیهاد بەردەوام بێت]، **هەموو زانایان بە گشتی دانیان پێدا ناوە کە پاراستنی دینمان پێش کەوتووە لە پاراستنی نەفس، کەواتە بۆیە دەکوژێن و دەکوژرێین لەبەر خاتری پاراستنی دین،** [بۆیە ئێمە لاویەتی خۆمان لەناو تەپو تۆزی جیهاددا بەسەر دەبەین لەبەر پاراستنی ئیسلام، ئێمە لەباتی ئەوەی خۆمان بۆنخۆش بکەین بە گوڵاو، گوڵاومان بریتییە لە باروت، بریتیە لە ئاگری فیشەك، ئەمەش بەرەکەت و منەتێکە لە خوای گەورەوە بۆ ئێمە لە کاتێکدا کە ڕێنموونی کردووین بۆ ئەم جیهادە]، **بەڵام ئەوە نییە دەکوژرێی لەبەر خاتری بەرژەوەندی و پاراستنی ئیسلام، ئایا وا نییە؟ پێم بڵێ لەبەر خاتری چییە؟ بەڵێ لەبەر خاتری دینە و پاراستنی دینیش بێگومان پێشخراوە لە پاراستنی گیان، ئەی چییە چی دەڵێیت؟ لەکاتێکدا کە جیهاد کردن پاراستنی نەك هەر دین، بەڵکو پاراستنی نامووسیشی تێدایە، پاراستنی نەفسیشی تێدایە، پاراستنی وڵاتیشی تێدایە، پاراستنی ماڵی تێدایە، پاراستنی هەموو شتێکی تێدایە. ئەگەر جیهاد ڕۆیشت و نەما ئەوە دین فەوتاوە، ناموس فەوتاوە، ماڵ فەوتاوە، نەفس فەوتاوە، هۆش و بیر فەوتاوە. بەڵێ لە ناوچەی بوخارا جیهاد نەماو کەوت یەکسەر رووس قاچەکانیان تێدا جێگیر بوو.... دەستیان بەسەردا گرت... کوا دین؟ کوا ناموس؟ کوا سەروەت و ماڵ و سامان؟ کوا گیان و نەفسەکان؟ سوێند بە خوا ئەگەر موسڵمانان و خەڵکی ئەو کۆماریەتە ئیسلامیانەی کە رووسیا دەستی گرت بەسەریاندا جیهادیان بکردایە،**

**خوێنیان بڕشتایە، دە یەکی ئەوەیان نەئەفەوتا کە ستالین لێی کوشتن، لێیان نەدەکوژرا و خوای گەورە ـ واللە أعلم ـ سەریشی دەخستن، چونکە ستالین بە دەستی خۆی ٢٦ ملیۆن موسڵمانی کوشت، ئەو نەفرینلێکراوە موسڵمانانی بە تەیارە هەڵدەگرت و و فڕێی دەدان بۆ ناوچەی سیبیریا و دەمردن، چونکە پلەی گەرما لەوێ ٤٦ پلەی سەدی لە ژێر سفرەوەیە، مرۆڤ تیایدا دەبێتە قاڵبێك سەهۆڵ،** [ئای لەم کردەوە دڕندانەیە! ئەی ستالینی نەفرینلێکراو، ئومێدەوارم کە خوای گەورە سەرت و دەمو چاوت ببەستێت بە بەردێکی ئاگرینەوە بە قەد ئەندازەی یەك شاخ بێت، داواکارم خوا بتخاتە ناو مارو دووپشکەکانی دۆزەخەوە لە هەموو لایەکەوە بتگەزن، ئەی نەفرینلێکراو]، **بەڵێ شیشان و شەرکەس، ئەوانەی کۆچیان کردو ڕایان کرد، لە ئاگری شیوعیەت، ئەوانەی کە دەربەدەر کران بۆیان گێڕاوینەتەوە لە کاتی ڕۆژانی ناهەمواریدا، لەناو ڕۆژانی برسێتییدا، لە کاتی ڕۆژانی ستالیندا، دەڵێن: دەیان خستینە ناو ژوورێکەوە و زیندانیان دەکردین، دەرگایان لێ دادەخستین و ئینسانی وا هەبوو خۆی پێ نەدەگیرا و گیانی دەردەچوو، ستالینی نەفرینلێکراو ڕەنجەڕۆیی هەتا هەتایی موسڵمانانی برسی دەکرد، چاوەڕوانی دەکرد هەتاوەکو کشتوکاڵەکە وشك دەبوو و کاتی دروێنەی دەهات یەکسەر دەبابەی دەهێنا گەنمەکەی هەڵدەگرت و هیچی نەدەهێڵانەوە و ناچار خەڵکەکە دەمایەوە بەبرسێتی، دەمانەوە بەبێ نان، پاشان دەخرانە ناو زیندانەکانەوە بەبێ خواردەمەنی و ئاو لە ناو زیندانەکاندا دەمردن لە برساندا، لە ژانەسکدا.**

**بەڵێ برای بەڕێزم، دەڵێن: کوڕ چاوەڕوانی مردنی باوکی دەکرد، هەتاوەکو لە گۆشتەکەی بخوات، هەتاوەکو بەو گۆشتە چەند ڕۆژێك دوای مردنی باوکی بژی، تەنانەت جاری واش هەبوو دایك کوڕەکەی خۆی دەخوارد** [(سبحان الله، الله أکبر!!) بەڵی خۆزگە چ ڕۆژێك بوو بێت وا دایکی بەستەزمان گۆشتی جگەرگۆشەکەی خۆی بخوات!!] **سوێند بە خوا پیاوێکی پیریان بۆی گێڕامەوە و وتی: ئێمە گەچی دیوارمان دەخوارد، ئایا نەفسەکان ماوە؟ ئایا دین ماوە؟ ئایا ناموس ماوە؟ ئایا**

شەرەف ماوە؟ ئایا ماڵ و سەروەت و سامان ماوە؟ ئایا هۆش و بیر و عەقڵ ماوە؟ نەخێر نەماون و ئەمانە هەموویان رۆیشتوون.

گەنجێکی سعودی پێی وتم: ئیزن وەرگرتنی باوك و دایك... ئیزن وەرگرتنی دایك و باوك چۆنە؟ چ دایکێك رێگە دەدات بە کوڕەکەی دەرچێت؟ سوێند بە خوا من پوری خۆم کە کوڕەکەی چوو بوو بۆ جیهاد پێم وت: ئەگەر بێ باوەڕان بێنە ناو شاری مەککەی پیرۆزەوە، ئایا رێگە دەدەیت بە منداڵەکانت دەرچن بۆ جیهاد؟ وتی: نە قەسەم بە خوا، دەیانخەمە ناو ژوورێکەوە و دەرگایان لەسەر دادەخەم، واتە کلیلی دەدەم! کەواتە چۆن و کەی جیهاد دەبێتە فەرزی عەین؟! کێ لەبەردەم بێ ئابڕوو ویستانەوە ڕادەپەڕێت؟ کەواتە ئیتر کێ جیهاد بکات؟ کێ بەری لافاوی بێ باوەڕی بگرێت؟ ئیتر خەڵك چۆن جیهاد بکەن؟ چۆن مەشخەڵی جیهاد پەرە ئەسێنێ کە ئەو ژنە دەڵێ: ئەگەر گاور بگاتە ناو ماڵی خوا دەستی بەسەردا بگرێت من رێگە بە منداڵەکانم نادەم بچن بۆ جیهاد!! بەڵێ ئەمەش ئێستا رووی داوە، خۆوەنەبێت وانەبێت، سوپاس بۆ خوا ئێمە لە تواناماندا هەیە شەڕو کوشتار لە رووسیادا بکەین، بەڵام ئەگەر گاور هاتن دەستیان بەسەر (الضفة الغربية) کەناری رۆژئاوادا گرت، ئەوا هیچ کەسێك نییە رێگە بە کوڕەکەی بدات کە جیهاد بکات، پێی دەڵێ ماڵم کاول دەکەی؟

پیاوێك هات لە دورگەی عەرەبییەوە لە دوای کوڕەکەیدا کە هاتبوو بۆ جیهاد، پێم وت: چەند کوڕت هەیە؟ وتی: حەوتن منیش وتم: باشە خوای گەورە حەوت کوڕی داویتێ، تۆ یەکێکیان نابەخشی لە رێی خوادا و شەشت بۆ بمێنێتەوە؟ لە دوای گفتوگۆیەکی زۆر لەگەڵیدا وتی: سوێند بە خوا ئەگەر سەد کوڕم هەبێ رێگە نادەم یەکێکیان بێت بۆ جیهاد، کەواتە ئیتر بە هیوای چی بیت؟ بەهیوای مۆڵەتی دایك و باوك؟ کەواتە کە تۆ هەر بڵێی ئیزنی دایك و باوك... ئیزنی دایك و باوك... واتە دین بفەوتێت شارەکان وێران بکرێن و بفەوتێن، ناموسەکان بشکێنرێن، ئێمەش تازە چاوەڕوانی ئیزنی دایك و باوك بکەین، پاشان من نازانم چۆن ئیزن لە دایك و باوك وەردەگیرێت؟! باوك فەرزە لەسەری وەك موسڵمانێك ئەگەر بتوانێت لە پێشماندا

**بێت، سوێند به خوا یاسای ئیسلام وایه، باوکم دەبێت لەشەڕدا له بەردەمدا بێت، بەخۆشی خۆی نییه، فەرزە لەسەری وەك نوێژ، دەباشه ئیزن وەردەگیرێ له کەسێك که ئەو کەسه خۆی وازی لەو فەرزە هێنابیٚ؟!! خۆی وازی له فەرزی جیهاد هێنابێت، ئایا تۆ دەچیت داوای مۆڵەتی لیٚ دەکەیت بۆ جیهاد؟ بەڵێ سوێندتان دەدەم به خوا، بۆ نموونه باوکی من** [یان باوکی تۆ] **لەبەرئەوەی ئیشی دەوڵەتی هەیه هەتاکو سەعات دوو یان سێی شەو ناخەوێت له دەرەوەیه ئیش دەکات و شەو ناخەوێت، پاشان که دێتەوە خەوالّووە و زۆر خەوی دێت، پاشان دوو سەعاتی ماوە بۆ نوێژی بەیانی، سەعات پێنج من هەڵدەستم بۆ دەست نوێژگرتن، باوکیشم هەستایەوە و وتی: بەڕاستی دەست نوێژەکەی تۆ من ناڕەحەت دەکات، له خەوم دەکات، منیش سەعات هەشت ئیشم هەیه، دەمەوێ چوار سەعات بخەوم، ئایا جائیزە من به گوێی باوکم بکەم دەست نوێژ نەشۆرم هەتاوەکو ئەو بخەوێت؟!! لەکاتێکدا ئەو تا سەعات دوو یان سێی شەو له بیٚ ئەمری خوادا، یان هەر هیچ نەبێ له وتی و وتی و قسەی بەتاڵدا دەباتە سەر؟ ئایا جائیزە گوێڕایەڵی باوکی واو بیٚ ئەمری خوا؟** [کێ دەڵێت ڕەوایه؟ بەڵێ ڕەوا نییه بەهیچ شێوەیەك، جیهادیش وەك نوێژ وایه هیچ جیاوازییان نییه هەروەك چۆن ڕەوا نییه وازبهێنی له دەست نوێژ، چونکه باوکت خەوەکەی دەزڕێت، ئاواش ڕەوا نییه واز له جیهاد بهێنی، چونکه سەرپێچی خوای گەورەیه، ئەوەتا پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ دەفەرموێت:] (**لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق، إنما الطاعة في المعروف**) **واته: گوێڕایەڵی نییه بۆ دروست کراو له سەرپێچی دروستکەردا، تەنها گوێڕایەڵی له چاکەدایه. ئەمه له ڕۆژێکدا که پێغەمبەر ﷺ به هاوڕێیەکی خۆی فەرموو:** [بڕۆ جیهادی باوك و دایکت بکه]**، یان به هاوەڵێکی تری فەرموو:** [بڕۆ چاکه لەگەڵ دایك و باوکت بکه]**، ئەمه له کاتێکدا بوو که جیهاد فەرزی عەین نەبوو، وەك باسمان کرد، شاری مەدینه** [پایتەختی ئیسلام] **دوژمن نەچووبووە ناوی، پەلاماری نەدرابوو، بەڵام کاتێك بیستیان که ڕۆم خۆی ئامادەکردووە و خۆی سازکردووە بۆ شەڕی شاری مەدینه یەکسەر پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆیان به**

٣٠٠٠٠ جەنگاوەری گیان فیداوە، ئەوەبوو سێ کەس بەجێ مان، [ئەو سێ کەسە فەرمان کرا کە کەس گفتوگۆیان لەگەڵدا نەکات، تەنانەت خێزانەکانیشیان].

بەڵێ سی هەزار ئیماندار ڕاپەڕین، ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لە یەکێك لەو سی هەزارە کرد و بڵێت پێی: ئایا داوای ئیزنت لە دایك و باوکت کردووە؟ تەنانەت یەك جاریش... بەڵام لە کاتێکدا موسڵمانان بە هەزاران بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیویست کۆمەڵێکی دە کەسی یان سەد کەسی بنێرێ، کە تەنها پەنجا یان سەد کەسی دەویست، ئەو یارە بەڕێزەش پرسیاری لێ کرد بۆ دەرچوون بۆ جیهاد... پێغەمبەریش ﷺ پێی دەفەرموو: ئایا باوك و دایکت هەیە؟ وتی. بەڵێ، پێی فەرموو: بڕۆ جیهاد لەگەڵ ئەوان بکە. مەبەستی لەوەبوو کە ئێستا پێویستمان بە تۆ نییە، چونکە بە هەزاران موسڵمان بوون، بەڵام لە کاتێکدا کە شار و دێهاتەکان کاول کراون و دەکرێت.. ناموسەکان هەتك دەکرێن و دەشکێنرێن، ناموسی خوشکی بە ئیمان هەتك کرا!! وە ماڵ و سەروەتی موسڵمانەکان دەستی بەسەردا دەگیرێت، زۆربەی موسڵمانان چەوساونەتەوە، دونیا هەمووی پیس بووە بە دوژمنی کافر، ئالەم کاتەدا من بڕۆم و بڵێم ئایا دایکە مۆڵەتم ئەدەیت بڕۆم بکوژرێم، بکوژم و شەڕ بکەم! نەخێر مۆڵەتت نادات تەواو بوو.... کەواتە ئیتر زەوی بەجێبهێڵرێت و ناموسی خوشکی موسڵمان بە دەستی دوژمنەوە بێت؟! [بەڵێ ئەی موسڵمانانی جیهان هەتاکەی؟ بۆ غیرەتتان ناجوڵێت؟!! بۆ شەرمی بەرقاپی خوای کاربەجێ ناتان گرێ؟ کەی موسڵمان ئەوەندە لاواز بووە لە مێژوودا؟ ئایا ترسی مردنە وای لێ کردوون کە گۆشەگیر بن لە جیهاد؟ ئێمە ئەگەر مردنمان شەهیدی بێ توخوا شەرم نییە بترسین لە مردن؟ کێ لە تاجی شەهیدی دەترسێ؟ با خۆی بە موسڵمانی ڕاستەقینە نەزانێ، بۆچی نایەنە مەیدانەوە یارمەتی موسڵمانان بدەن؟ ئایا دایك و باوکتان ئیزنتان پێ نادەن؟ پێویست بە ئیزنی دایك و باوك ناکات ئەمە جیهادە جیهاد]، بۆ نموونە من لەوێدا لە ژوورێکدام و لە بەردەمیشمدا ژوورێکی تر هەیە ماڵ و منداڵی هاوسێکەمانی تێدایە، ئاگری گرت، لە پێشدا ئاگرەکەی گەیشت بەو ماڵە و دەیسووتاند، هەتا وای لێهات بۆنی گۆشتی برژاو لوتی ئینسانەکانی پڕ دەکرد، باشە ئەگەر من بتوانم

**ڕزگاریان بکەم لەو ئاگرە ئایا بڕۆم ئیزن وەربگرم لە دایكو باوكم بۆ ئەوەی ئەو ماڵە ڕزگار بکەم، دایکم دەترسێت کە کراسەکەم بسووتێت، لەبەرئەوە ئیزنم نادات بڕۆم، بەڵام ئەو منداڵە بێ تاوانانەش پاش ماوەیەکی کەم ئاگریان تێبەردەبێ و دەسووتێن و لەناو دەچن و دەخنکێن لەناو دووکەڵدا، تەواو دەبن، ئایا من چاوەڕوانی بکەم هەتا دایکم ئیزنم پێ دەدات!!** [بەڕاستی ئەگەر هەرکەسێك بە ئەندازەیەکی کەم لە ئیسلام ئاگادار بووبێت ئەم شتە بەرپەرچ دەداتەوە، کە موسڵمانان دەستدرێژییان لێ کرا ئیتر پێویست بە ئیزنی ئەمیری موسڵمانانیش ناکات، ئەمەش رەفتاری یارەکانی پێغەمبەر ﷺ و ڕازی بوونی پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شتە شایەتی بۆ دەدات. ئەوەبوو (عوینەی فزازی) کە خەڵکی یەکێك لەو لادێیانە بوو لە دەورووبەری شاری مەدینە، هات بە خۆی و چل سوارەوە بۆ ئەوەی دەستێ بوەشێنێ، لە دەوری شاری مەدینەدا ڕانە حوشترێك کە ژمارەیان بیست حوشتر بوو پیاوێك و ژنێك لە لای بوون، عوینە پەلاماری دان و پیاوەکەی کوشت و ژنەکەی فڕاند]، **ئەبو تەڵحە بەمەی زانی و لەگەڵ سەلەمەی کوڕی ئەکوەعدا دەرچوون و گەیشتن بە لادێییەکان (الاعراب)، حوشترەکانی مەدینەیان لێسەندنەوە و حەیوانەکانیان گەڕاندەوە بێ ئەوەی ئیزن لەکەس وەربگرن، تەنانەت لە پێغەمبەریش ﷺ، سەرۆك و قائیدیان ئیزنیان لێ وەرنەگرت، ئایا یەکێك لەوان وتی بە دایکی ئایا ئیزنم پێ دەدەیت؟ یان بە باوکی یان بە پێغەمبەری خوا ﷺ تەنانەت بەو بێ پرسییەش ڕۆیشتن بەبێ ئیزنی دایك و باوك؟!! ئیزن وەرگرتنی دایك و باوك لەکوێیە؟!! ئەگەر لەو جۆرە کاتانەدا ئیزنی پێغەمبەری خوا ﷺ پێویست نەکات ئیزنی دایك و باوك چۆن پێویست دەکات؟!! چۆن داوای ئیزن دەکەیت لە دایك و باوکی دانیشتوو؟!! دایك و باوکی دانیشتوو چۆن داوای ئیزنیان لێ دەکرێ، لە کاتێکدا جیهاد بووبێتە فەرزی عەین؟!! چۆن داوای ئیزنیان لێ دەکەیت لەکاتێکدا کە جیهاد بەسەر دڵ و دەروونیاندا ناڕوات و گوێی پێ نادەن؟!! بە هیچ شێوەیەك بیر ناکەنەوە لە جیهاد و لە شارەکان، بیر لە سەربەرزی و شەرەفی موسڵمانان ناکەنەوە، کەواتە تۆ بە چ شێوەیەك ئیزنیان لێ وەردەگری بۆ جیهاد؟ هەر ئەمە پارەی سەری مانگیان بدەنێ، ئیتر بیر لە هیچ شتێك ناکەنەوە،**

**پارەی سەری مانگەکەیان پێ باشترە و خێرترە لە هەموو nامووسی ئافرەتانی ئیسلام، پێیان باشترە و خێرترە لە هەموو خوێنی گەنجە موسڵمانەکان، تەنانەت پارەکەیان لەلایان خۆشەویستترە لە ئیسلامیش!! کەواتە ئەگەر ئیسلامیش بڕواو نەمێنێ بێ توانا بێت، ئەوان گوێی پێ نادەن، چونکە پارەی سەری مانگی خۆیان هەیە.** [دەڵێ هەر ئەوەندە بژیم ئیتر چی دەبێ با ببێ]، **ئەگەر معاشەکەی و ئیشەکەی لەگەڵ نەمان و توانەوەی ئیسلامدا بخرێتە بەردەم و پێی بوترێ بە ئارەزووی خۆت کامیانت دەوێ و کامیان هەڵدەبژێری؟ دەڵێت معاشەکەم هەڵدەبژێرم! بەڵێ پارەی کرێی مانگانەکەی هەڵدەبژێرێ؟ ئێستا زۆربەی باوکان بەو جۆرەن، پارە و ژیانی خۆیان خۆشتر دەوێ لە ئیسلام** [لە شەرەفی خوشکە زیندانیەکان لە سەرپۆش و ریش!! بەو چەشنە منداڵەکانیان فێر دەکەن و پەروەردەیان دەکەن...]، **بە پەندی پێشینان پەروەردەیان دەکەن و دەڵێن: "لە دەمی سەگ شت وەرگرە هەتاکو پێویستییەکەتی پێ ئەنجام دەدەیت"! بەم چەشنە منداڵەکانیان پەروەردە دەکەن و دەرسی زەلیلی و سەرشۆڕییان دادەدەن و تەنانەت شت وەرگرتن لە سەگی پیسەوە، لە لیکە پیسەکانی هەتاوەکو پێویستییەکانی پێ ئەنجام بدرێ، لە برساندا نەمرین، بەڵێ ئا بەو جۆرە منداڵەکانیان پەروەردە دەکەن،** [خۆ وەك ئیبراهیم پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ نین کوڕەکەیان لەسەر گیانبازی و فیداکاری پەروەردە بکەن، هەتا ئەو ڕادەیە ئامادە بێت بە دەستی باوکی سەرببڕێت بۆ ئەنجامدانی فەرمانی پەروەردگارو زانا، بەڵێ ئەوانە کۆمەڵێك بوون و ڕۆشتن و بەڕاستیی توانییان خوای گەورە لە خۆیان ڕازی بکەن، خوای گەورە بۆ خاتری ناوە جوان و شیرینەکانی خۆی ئێمەش وا لێبکات کە کردەوەکانمان لەوان بچێت، خوای گەورە بە پلەی شەهیدی کۆتایی بە ژیانمان بهێنێت، هەتاکو بتوانین بە ڕووی سپییەوە بچینە بەردەمی خۆی، ئەویش فەرمان بکات بە فریشتەکان بمانخەنە ناو باخە جوانەکانی بەهەشتەوە... ئامین].

## ئایا ئافرەتی موسڵمان دەستیان بەسەردا دەگیرێت و ئاوارە دەكرێن؟

[ئەی برای موسڵمان، خۆت چاك دەزانیت و ئاگاداریت كە سەربازگە بێ باوەڕەكان چی بە موسڵمانان دەكەن، چی دەكەن بە ئافرەتان و دایكان و خوشكانی ئیماندار، بەبێ تاوان، بەس تاوانیان ئەوەیە كە دەڵێن موسڵمانین، تاوانیان ئەوەیە كە دەڵێن حیجاب پۆشین، سەر و مل و قاچ و قۆڵ رووت ناكەین]، **ئایا نازانی و نەتزانیوە كە ئەگەر ئافرەتێكی گاور دراوسێت بوو داوای یارمەتی لێ كردیت و پەنای بۆ هێنای، لەكاتێكدا ئەگەر یەكێك سووكایەتی (تەعەدا)ی كردە سەر نامووسی، یان دزێك ویستی نامووسی هەتك بكات و شەرەفی بشكێنێت یان هەر دەستدرێژیكەرێكی تر بێت ئەگەر موسڵمانیش بێت نوێژكەر و شەونوێژكەر و رۆژووگر بێت، هەرچی بێت، ئەگەر ویستیان دەستدرێژیی بكەنە سەر نامووسی و ئەویش پەناو هاواری بۆ تۆ هێناوە، داڵدەی بەس بە تۆ كرد و تۆش كەمتەرخەمیت نواند و نەچوویت بەدەم هاواریەوە، ئەوە تۆ حەرامێكت خستۆتە گەردنی خۆتەوە و تووشی گوناهێكی گەورە بوویت، بۆچی؟ چونكە تۆ دواكەوتووی لە رزگاركردنی نامووسێكدا كە پاراستنی لەسەر تۆ فەرز بووە.... دواكەوتوویت لە ڕزگاركردنی ئافرەتێكی زوڵم لێ كراودا، تۆ گوناهێكی گەورەت كردووە، تووشی گوناهێكی گەورە لە گوناهە گەورەكان هاتوویت، ئەویش نەكردنی بەرپەرچدانەوە و تەمێ كردنی ستەمكارێك بووە كە زوڵمی لە ئافرەتێكی بێ تاوان كردووە.... ئەی برایان: زانایان و فوقەهای ئیسلام فتوایان داوە ئەگەر ئافرەتێك لە رۆژهەڵات گیرا و زیندان كرا، ئەوە فەرز دەبێت لەسەر موسڵمانانی خەڵكی رۆژئاوا كە رزگاری بكەن، بە گرتنی ئەو ئافرەتە جیهاد دەبێتە فەرزی عەین وەك نوێژ لەسەر موسڵمانان بە گشتی هەموو كۆی ئوممەتی ئیسلامی تەكلیف لێ كراوە كە ئەو ئافرەتە رزگار بكات، لەبەرئەوە كاتێك كە (المعتصم) خوا لێی رازی بێت خۆی ئامادەكرد و جوڵا بۆ ئافرەتێك لە شاری (عموریە) لە شارەكانی رۆم بە حەفتا هەزار سەربازەوە (معتصم) بۆ ئەوە نەچوو كە خەڵك بكوژێ بەبێ ئەوەی كەسیان لێ كوژرا بێت، فەرزی عەین بوو لەسەر خەلیفە**

**کە دەبێت بجوڵێت و بزووتنەوە بکات بۆ ڕزگارکردنی ئەو ئافرەتە موسڵمانە، لەو کاتەدا کە دەرچوو ڕاپەڕی پێیان وت: سەرناکەویت ئەگەر ئێستا دەربچیت، لە ڕۆژانی هاویندا بوو ڕۆژانی پێگەیشتنی هەنجیر و ترێ، بەڵێ دەرکەوت کە ئەوانەی کە ئەو قسانەیان کردووە نەیانویست دەرچن، بۆیە دەیانوت: ئێمە دەرناچین، چونکە لە کتێبی ئەستێرە گەڕۆکەکاندا وامان خوێندووەتەوە کە ئەگەر ئێستا دەرچین سەرناکەوین، واتە لەلای فاڵچی و کتێب گرەوە،** [مەبەستمان لێرەدا ئەوەیە کە ئەو خەلیفەیە لەبەر ئەوەی لە ئیسلامی پیرۆز تێگەیشتبوو قبوڵی نەکرد کە ئافرەتێکی موسڵمان لە زینداندا بێت ـ زیندانی بێ باوەڕان، بۆیە حەفتا هەزار جەنگاوەری موسڵمانی دەرکرد بۆ رزگارکردنی یەك ئافرەتی موسڵمان داوێن پاك هەتا لە زینداندا ڕزگاری کرد]، **کەواتە منیش لە ژێر سێبەری قورئان و فەرمووده شیرینەکانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێم جیهاد کردن، واتە ئەو جیهادکردنەی کە ئێستا لەسەر ئوممەتی ئیسلامی فەرزی عەینە ٥٠٠ پێنج سەد ساڵ لەمەوبەر دەکات فەرزی عەین بووە، واتە پێش پێنج سەد ساڵ جیهاد کردن لەسەر موسڵمانان فەرزی عەین بووە هەتاکو ئەمڕۆ لە ئەندازەی پێنج سەدە، واتە پێنج سەد ساڵ ئوممەتی ئیسلامی هەر هەمووی بە گشتی تاوانبارە، چونکە شاری (الأندلس) نەگەڕاوەتەوە دەست موسڵمانان، کەواتە جیهاد ئێستا لە سەدەی بیستەمدا فەرزی عەینە، بە گەڕاندنەوەی ئەفغانستان یان فەلەستین بۆ ژێر ئاڵای ئیسلام کۆتایی پێ نایەت، ئەم فەرزە کاتێك لەسەر موسڵمانان دەکەوێت و کۆتایی دێت هەر پارچە زەویەك ڕۆژێك لە ڕۆژان لە ژێر ئاڵای (لا إله الا الله محمد رسول الله)دا بووە بگەڕێتەوە ژێر دەستی موسڵمانان.**

## جیهاد هەتا مردن

بەڕاستی جیهاد فەرزی عەینە بەسەرتەوە هەتاکو مردن، هەروەکو چۆن نوێژکردن بەسەر ئینسانەوە ناکەوێت مەگەر لەکاتێکدا بمرێت، بەهەمان شێوە جیهادیش لەسەر ئینسان ناکەوێت مەگەر لە کاتێکدا بمرێت، ئەی برای تێکۆشەر (مجاهد) شمشێرەکەت هەڵگرە و بەناو زەویدا بڕۆ، هەتا دەتوانی بڕۆ، بەهیچ شێوەیەك فەرزی عەین کۆتایی پێ نایەت هەتاکو بگەی بە خوای گەورە، هەروەکو چۆن ڕەواو جائیز نییە بڵێی لە ساڵی ڕابردوو ڕۆژووم گرت و ئەمساڵ دەمەوێت رابکشێم و بحەسێمەوە، یان بڵێی نوێژی جومعەی رابردووم کردووە ئەمەوێت ئەم جومعەیە بحەسێمەوە، بەهەمان شێوە جائیز نییە بڵێی جیهادو کوشتارم کردووە لە ساڵی رابردوودا، ئەم ساڵ دەمەوێت بحەسێمەوە، نیازم وایە کە ئەمساڵ جیهاد نەکەم دابنیشم، بەڵێ ئەی برای موجاهید ئەم جیهادە بەردەوامە و ڕێ دەکات هەتا دەگەیت بە خوای زاناو کاربەجێ جل جلالە ئەگەر گەیشتیت بە خوای گەورە ئەوە تۆ فەرزەکەت لەسەر کەوتووە کە فەرزی جیهادە، ئەم جیهادە مەبەست پێی شەڕە (قتال) لە ئیسلامدا، سەربڕین و تۆقاندن و ڕاونانی بێ باوەڕانە. کوشتن و گرتنە، ئەمە جیهادە لە ئیسلامدا، بەڵام تۆ دابنیشی لە ماڵی خۆتاندا و لە ژووری گەرم و گوڕ لە زستاندا و لە ژووری فێنك و خۆش لە هاویندا و لەلای راستەوە پیاڵەیەك چاو لەو لاوە پەرداخێك قاوە و شەربەت لەم لاتەوە کاستەر و محەلەبی دانرابێت، سوێند بەخوا ئەمە جیهادی پێ ناڵێن لە ئیسلامدا، ئەم جۆرە موسڵمانانە پێیان ناوترێ (مجاهد)، ئەوە خۆی جەنابی بە زانا دەزانێت و دانیشتووە لە بارەی جیهادەوە شت دەنووسێتەوە، قەسەم بە خوا کۆمەڵێك دەست دەکەون و دەبینرێن لە بارەی جیهادەوە نووسراویان نووسیوە هەتاکو ئێستاش لە ژیانیاندا فیشەکێکیان لە پێناوی خوادا نەتەقاندووە.

چۆن ئەو موسڵمانە بەو جۆرە دەنووسێت؟!! لەبارەی چ شتێکەوە دەنووسێت؟ چۆن لە ژیانیدا تفەنگی بە شانی خۆیەوە نەبینیوە لەبارەی جیهادی ئیسلامییەوە

**نووسراو دەنووسێت؟ ئەوە دە ساڵ بەسەر جیهادی ئەفغانستاندا رابوردووە هەتا ئێستاش نەهاتوون بۆ پیشاوەر تەنانەت نزیکی سەربازگەیەکی سەربازانی ئیسلام نەبوونەتەوە، لەکاتێکدا ئێمە ئەگەر قسە بکەین لەبارەی جیهادەوە، یەکسەر زمانەکانیان بەسەرمانەوە دەبێتە چەند شمشێرێك، لە بارەی ئەو کەراماتانەوە قسە بکەین کە لە جیهاد و موجاهیدەوە بیستوومانە، یەکسەر گومانی تێدا دروست دەکەن، بەڵێ گومان دەخەنە ناو کەراماتەکانەوە لە جیهاددا بەرچاو کەوتوون، تەنانەت شك دەخەنە خودی جیهادەوە، نەك کەرامات** [نازانم شەرم لە خوای زانا ناکەن؟! نازانم ئەوە چۆن لە خوای گەورە ناترسن؟!!].

**بەڵێ ئەی برای خۆشەویست... ئەوە خۆی دانیشتووە و قاچێکی ناوە بە سەر قاچەکەی تریەوە، قاوە لەلایەکییەوە دانراوە، بسکیت لەلایەکی ترەوە، ساردی و شەربەت و خورما لەلایەکی تریەوە دانراوە، جار جار لە بارەی تۆپی پێوە لەگەڵ خەڵك قسە دەکات. سەیری تەلەفزیۆن و یاری تۆپی پێ دەکات و وادەزانێ قورئان دەخوێنێتەوە ئەوەندە پێی خۆشە... بەڵێ هەواڵی مارادۆنای یاریزان دەپرسێ گەیشت یان نەگەیشت بۆ وڵاتەکەمان، ئەو شارە هەر هەموو بە گشتی وەستاون بۆ بەرەوپیری مارادۆنا (لا حول ولا قوة الا بالله).**

**بەڵێ خۆی بە موسڵمان دەزانێ و بەرەو پیری مارادۆنا دەڕوات بە مەلایین ڕیاڵەوە، پیاوێکی وەك مارادۆنای کافر بەو چەشنەی بۆ دەکەن، دەڕۆن بەپیریەوە و پێی دەڵێن: دەمانەوێ میوانداریت بکەین بۆ ناو بازاڕی ئاڵتون، ئەویش وتی: بەیەك مەرج دێم لە شارەکەتاندا منارەی مزگەوت نەبینم** [بانگدەر نەبینم] **چووە ناو ئەو شارە (جدە)، پاشان چووە ئەو بازاڕەوە، چەندین بەخششی لە هەموو لایەکەوە بۆ دانرا، بۆی هەڵدەدرا!! فرێیان دەدایە چۆکی!! باشە ئایا مارادۆنا چی بەخششی بۆ ئەو شارە بەجێهێشت؟!! ئەو فانیلەی پێدان کە یاری پێوە دەکرد بە ئارەقەوە، کە ئارەقەکەشی لەلای (ئیبن حەزم) پیسە وەك لیکی دەمی سەگ وایە و لەسەگ پیس تریشە** ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُشۡرِكُونَ نَجَسٞ﴾ **(التوبة: ٢٨)، بەڵی ئارەقەکەی پیسە و بۆگەنە،**

وە ئاوی دەم و لیکی پیسە، ئەو کەسەی کە ئاوی ئارەقی لاشەی مارادۆنای بەرکەوتووە پێویستە سێ جار بیشوات، یان لای کەمی جارێك، بەڵی دەردەچێت بە زیاتر لە (٨) ملیۆن ریاڵەوە، لەسەر تەلەفزیۆن دەریانخستوو و (بێژەری) تەلەفزیۆنەکە پێی وت: بەڕاستی تۆ خوا و پەرستراوی جەماوەری، بۆیە زاناکان ویستیان (دەعوە)یەکی لەسەر بەرز بکەنەوە لەبەرئەوەی لە ئیسلام دەرچووە (دەعوە لەسەر بێژەرەکە)، لەسەر ئەو قسەی کە بە مارادۆنای وت. ئەوەی کە پێویستە لێرەدا ئەوەیە کە یەکێکی خۆی سەرقاڵ کردووە بە سەیرکردنی تۆپی پێوە [خۆشی بە زانا دەزانێت] تۆپی پێ بەرەو هەر شوێنێك بڕوات ئەمیش خۆی پێ دەگەیەنێ بۆ سەیرکردنی، شوێنی دەکەوێت بۆ هەرکوێ ڕێی کردبێت، ئەوە حاڵیەتی بەو جۆرە، ئەگەر رۆژێك پێی بڵێی جیهاد، پێت دەڵێت: ئەی کوڕم جیهادی چی؟ پێی بڵێی جیهاد بکە و کۆچ بکە، ئەویش پێت دەڵێت: لە شارەکەی خۆتدا جیهاد بکە، براکانی خۆت چاکترن بۆت... ئەم جۆرە زانایانە ئیزنی لێ وەرناگیرێت.

بەڵێ ئەمە ئیزنی پێ ناوێت، ئەی بە چ شێوەیەك کە باوك ئیزنی پێ دەوێت، لەکاتێکدا ئەگەر باوکی دوژمنی خوا بێ؟! چۆن ئیزنی لێ وەردەگرێت ئەگەر رقی لە موسڵمان بێت ئیزنی لێ وەردەگرێت؟! بەڵێ ئەوەی کە لێرەدا پێویستە بزانرێت ئەوەیە کە: یارمەتی و ئیزن وەرگرتن لە فەرزی عەینەکاندا پێویست ناکات، بەڕاستی خەڵکی ئەمڕۆ بەرژەوەندی خۆیان دەوێت، سەربەرزی و شکۆمەندی ئیسلامی ئازیزیان لەبیرچۆتەوە، هەر سەرۆك و یاسایەك بێتە سەر حوکم بەشەرتێك بیانژێنێ یەکسەر سەری بۆ کەچ دەکەن و دەبن بە سەربازی، ئیتر بیرێك لە بیروباوەڕی ئەو فەرماندەیە ناکەنەوە ئایا موسڵمانە یان بێ باوەڕە؟ کەواتە خەڵکی ئەمڕۆ لە زۆربەی زۆری شارەکاندا بەس باسی نان دەکەن!! هەموو دانیشتن و باسکردنێکیان بووە بە نان، جارجاریش قسەی پێشینان دەهێننەوە دەڵێن: هەرکەسێك دایکم مارە بکرێت ئەوە مامیەتی. واتە حاکمە بەسەرمەوە، سەرف کەو

من پێی ڕازیم! بەڵێ، دەڵێن هەر نانم بداتێ و تێرم بکات دەبم بە سەربازی... ئیتر هەر کەس بێت، گاور بێت... بن غوریون بێت... ڕێگان بێت... هەرکەسێ بێت، هەموو لەلای من یەکێکە و هیچ جیاوازییان نییە (سبحان الله)، ئەوەی کە پێویستە ئەوەیە بخواو بخواتەوە ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأۡكُلُونَ كَمَا تَأۡكُلُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثۡوًى لَّهُمۡ ﴾ (محمد: ١٢) واتە بێ باوەڕان ئەوانەی کە بێ باوەڕبوون خۆشی دەبینن لە دنیا واتە لە ژیاندا و لە دونیا و خۆشیەکانی دەخۆن وەك چۆن ئاژەڵان دەخۆن، لە ڕۆژی دواییشدا ئاگری دۆزەخ جێگاو شوێنیانە. واتە لە ڕۆژی پاداشتدا ئاگری تیژ مەنزڵگاو پاداشتی ئەوانە، هەرکەسێ و حوکمی وڵاتی بەدەست بێت لە لای ئەوان هیچ جیاوازییەکی نییە گوێی نادەنێ زاڵم و لادەر و تاغوت هەموویان لەلای ئەوان یەکێکن، بەهیچ شێوەیەك بیر ناکەنەوە لە ئیسلام و موسڵمانان، چونکە هەر لە بنچینەدا وا گۆش کراون [بیر لە حاکمیەتی ئیسلامی ئازیز ناکەنەوە، خەم و خەفەت و بیرکردنەوەیان هەر ئەوەیە بخۆن و بخۆنەوە و بخەون]، ئەوەی کە زۆر پێویستە بزانرێت و لەناو دڵ و مێشکی هەموو گەنجێکی موسڵماندا ریشە دابکوتێ ئەوەیە کە ئیزن وەرگرتن نییە لە دایك و باوك لە فەرزە عەینەکاندا، یارمەتی و ئیزنی پێ ناوێ، تەنانەت لە ئەمیری موسڵمانانیش.

خەلیفەیەك لە لە خەلیفەکانی عەباسییەکان یان ئەمەویەکان پێی ناخۆش بوو و بە قەدەغەی دەزانی چوون بۆ شەڕکردن بەبێ ئیزنی خۆی، مەگەر لە سێ کاتدا نەبێت واتە [بە قەدەغەی دەزانی بەبێ پرسی خۆی موسڵمان بچن بۆ شەڕ مەگەر لە سێ کاتدا نەبێت کە بە ڕەوای دەزانی پرسیشی پێ نەکرێت بۆ شەڕ].

١- ئەگەر ئیمامەکە جیهادی تەرك کرد، نەیدەویست جیهاد بکات ئەوە ئیزنی لێ وەرناگیرێت [واتە ئیمامێك خۆی نایەوێت جیهاد بکات، تۆش ئیزنی چی لێ وەردەگریت؟].

٢- ئەگەر ئیزن وەرگرتنەکە ئەوەی مەبەست بوو فەوتاندی، واتە ڕووداوێك ڕوودەدات هەتاکو تۆ دەڕۆی پرس دەکەیت ئەو مەبەستە دەفەوتێ و لەدەست دەردەچێ، وەك چۆن لەو نموونەیەدا باسمان کرد، واتە: ئەو مەسەلەی کە هاتن بۆ

**مەدینە پیاوەکەیان کوشت و خوشترەکانیان برد، چونکە ئەو ئەبو تەڵحە و سەلەمە ئەگەر ئیزنیان وەربگرتایە لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە ماڵ و حوشترەکانی مەدینە دەڕۆیشتن و لە دەست دەردەچوون.**

**٣ـ ئەگەر زانیمان ئیمامەکە قبوڵی ناکات و ئیزن نادات ئەوە دەتوانێت بەبێ ئیزنی ئیمامەکە بچێت بۆ شەڕ، بەڵێ نەك دایك و باوك نە خەلیفە نە هیچ کەسێك لە دونیادا مافی ئەوەی نییە کە خۆی هەڵقورتێنێت لەو فەرزانەی کە فەرزکراوە بەسەرماندا. ناتوانێت و مافی ئەوەی نییە کە بیوەستێنێت و ناتوانێت کە بەرهەڵستی بکات** [جا کەواتە با ئێمەش دەست نوێژێکی پاك بگرین و بەرەو مەیدانی جیهاد و گیانفیدایی بەڕێ بکەوین، هەتاوەکو إن شاء الله بە رووی سوور و سپییەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ شاد بین].

## ئیزن وەرگرتنی پەروەردەکار (مامۆستا)

(یەکێکی تر لەو هۆکارە سەرەکییانەی کە بوونەتە هۆی دانیشتنی هەزاران گەنج لە جیهاد، بووە بە هۆی بێبەش بوونی چەندین لاوی بەڕێز لەو پاداشتە گەورەیە بریتیە لە مۆڵەت نەدانی مامۆستا بە قوتابییەکەی بۆ جیهاد) **لە دوای ئەوەی کە بیانوی مۆڵەتی دایك و باوك نەما، پاشان دەچیت بۆ لای و پێی دەڵێت: ئەوە بۆچی نایەیت بۆ جیهاد؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: بە خوا لەبەر ئەوەی مامۆستای ئەو مزگەوتە کە منی پێگەیاندووە و پەروەردەی کردووم ئیزنم نادات... واتە مامۆستاکەم ڕێگەم نادات کۆچ بکەم بۆ جیهاد** [ئەی برای بەڕێزم ئیمامی مزگەوت مافی نییە بەسەرتەوە کە بتوانێ بەرهەڵستیت بکات بۆ جیهاد، ناتوانێت بە هیچ شێوەیەك بتگەڕێنێتەوە لە جیهاد، ئایا مامۆستایەك تۆ پەروەردە بکات و فێری ئیسلامت بکات کەچی لە گەورەترین پلەی ئیسلام بەرهەڵستیت بکات توخوا ئەوە مامۆستایە؟ ئەوە دڵسۆزە؟ ئەوە راستگۆیە؟] **بەڵێ مافی نییە، چونکە ئەمیری موسڵمانان مافی بەسەرتەوە نییە کە بەرگریت بکات لە جیهاد**

**ئەوە خەڵکی تر ئەولاتر کە هیچ مافێکیان نییە بەسەرتەوە، ئەمیری موسڵمانان ماف نەبێ ئەی بە چ شێوەیەك ئەمیری بزووتنەوەکەت یان حیزبەکەت یان ڕێکخراوەکەت ماف هەیە؟ مامۆستای قوتابخانەکەت یان مزگەوتەکەت یان هی هەر شوێنێ؟ ئەمانە مافیان نییە،** [بە هیچ شێوەیەك نابێ بە گوێیان بکەیت لەم کاتەدا] **ئایا مامۆستاکەت ئەولاترە لە خەلیفە؟ بەڵێ خەلیفە ئیزنی لێ وەرناگیرێت لە چەند حاڵەتێکدا یەکێك لەو حاڵەتانەش ئەوەیە کە ئێستا ئێمەی تیادا دەژین، بەڵی من لە ڕۆژێکدا ئیزنی لێ دەخوازم کە لە مەیدانی جیهاددا لە بەردەممدا بێت، پێشم کەوتبێت بۆ شەڕ، بەڵام ئەگەر جەنابی دانیشتووە و قاچی ناوە بەسەر قاچییەوە و جارجاریش بەملاولادا دەجوڵێت و منیش دەمەوێت جیهاد بکەم،** [ئەمە بە هیچ شێوەیەك داوای ئیزنی لێ ناکەم، چونکە من داوای ئیزنی نوێژکردن لە یەکێك دەکەم کە لە ژیانیدا کڕنوشی نەبردبێت، ئایا ئەمە ڕەوایە؟ ئایا ئەمە خوای گەورە پێی ڕەوایە؟ بێگومان نەخێر، لە مەرجێکیشدا کە پرسیاری لێ دەکرێت خۆی لە بنچینەدا حەز لە جیهاد ناکات، کەمتەرخەمەو لاوازە، بەڵام بۆ وەڵامی پرسیارەکە چەندین قسەی زرقو برق دروست دەکات، تا تەمبەڵیەکەی خۆی داپۆشێت]**، چونکە دەروونی کەمتەرخەم و لاواز دان نانێت بە لاوازی و کەمتەرخەمی خۆیدا... بەڵکو هەر دەبێ چەندین هۆکار بهێنێتەوە تاکو کەمتەرخەمییەکەی پاك بکاتەوە** [وای بپۆشێت هەتاکو هەستی پێ نەکەن] **لەبەرئەوە لە دواییدا دێت و دەڵێت: کورە ئەفغانستان ناگونجێ بۆ دامەزراندن و بەڕێوەبردنی دەوڵەتی ئیسلامی ئیتر جیهادی چی بکەم، بەیەکێکی تر دەڵێت: ئەفغانستان پێویستی بە پیاوان نییە، بە یەکێکی تر دەڵێت: کورە خەڵکی هەموو کۆمەڵ کۆمەڵ و جیا جیان، واتە تەفرەقە و بەرامبەرکێیان تێدایە، بەیەکێکی تر دەڵێت: حەشیش دەکێشن، بەڵێ هەرچی عەیب هەیە لەناو زەویدا بۆت دەردەهێنێت** [یەك لە دوای یەك بۆت ڕیز دەکات هەتاکو ئەگەر بە یەکێکیان باوەڕ نەکەیت بەوی تریان باوەڕ دەکەیت بۆچی؟] **هەتاکو تۆ تاوانباری نەکەیت کەمتەرخەمە،** [بەڵام ئایا خوای گەورە ئاگادار نییە لە دەروونەکان؟!! ئایا خوای گەورە هیچی لێ ون دەبێت لە زەوی و ئاسمانەکاندا؟!]

بێگومان نەخێر، کەواتە ئەو دڵە ترسی خەڵکی تێدایە، ترسی پەروەردگاری تێدا نییە ئەی تیاچوون و ماڵوێرانی بۆ دەروونی بەو چەشنە نازانم چۆن دەوێرێ بە قوتابیەکەی بڵێ مەڕۆ بۆ جیهاد، ئای لەم ڕێگرتنە، لەم جۆرە بێبەش کردنە، ئەمە چ جۆرە دڵێکە، دڵی موسڵمانی لەخواترسە یان موونافیقی بێ ئاگایە؟!! بەڕاستی ئەم خەڵك پەشیمان کردنەوەیە لەم جیهادە بەڕاشکاوی و سەرپێچی کردنی خوای گەورەیە ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَى ٱلْقِتَالِ ۚ ﴾ (الأنفال: ٦٥) واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ موسڵمانان هان بدە لەسەر شەڕ کردن، خوای گەورە داوامان لێدەکات کە خەڵك هان بدەین بۆ شەڕ، بەڵام ئێمە بە ڕاشکاوی پێچەوانەی دەکەین و خەڵکی پەشیمان دەکەینەوە]. **سوێند بە خوا ئەو واجبە شەرعییەی کە من لە نێوان خۆم و پەروەردگاری جیهانیاندا باوەڕم پێی هەیە ئەوەیە کە هەرچی زانایان هەن لە ناو ئەم زەویەدا فەرزە لەسەریان کە ڕاپەڕن بۆ جیهاد واتە وەك ڕۆژوو کە هەموو زانایان لە زەوی جیهاد و شەڕدا بن، فەرزە لەسەریان کە کۆچ بکەن بۆ ئەو شوێنانەی کە جیهادی تێدایە، کە پێی دەڵێیت بۆ لە وڵاتو مەنزڵگای خۆت کۆچ ناکەیت؟ لەوەڵامدا دەڵێت: ئایا وڵاتەکە بەجێ بهێڵین بۆ بەعسییەکان، ماسۆنیەکان، قەومیەکان و عەلمانیەکان؟! چۆن دەبێت وڵات بەجێ بهێڵین و واز لە بانگەواز بهێنین؟ ئەی برا تۆ کۆچ بکە بۆ زەوی جیهاد، دەوڵەتی ئیسلامی لێرە پێکبهێنە، خۆت ئامادە و چالاك بکە، پاشان بگەڕێرەوە بۆ وڵاتەکەی خۆت بۆ جەنگ و جیهاد لەگەڵیاندا، پاکی بکەرەوە لە دڕندەکان، بەڵێ کە تۆ دەڵێیت من بانگەواز دەکەم تۆ کوا بانگەوازەکەت؟! ئەو مزگەوتەی کە تۆ نوێژی تێدا دەکەیت دایدەخات بە ڕووتدا، مینبەریان لێ حەرام کردووی کە بچیتە سەری** [پێت خۆش بێت و پێت ناخۆش بێت نایەڵن بە ئازادی گوفتاری خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ بڵاو بکەیتەوە] **ئەو قوتابخانەکەتە بەرهەڵستیت دەکەن کە هەناسەی تێدا بدەیت، زانکۆ و پەیمانگاکان دوژمنانی خوایان بەسەردا زاڵ کردوون و دەستیان گرتووە بەسەریاندا، بەهیچ شێوەیەك مافی ئەوەت پێ نادەین کە بە ئازادی بانگەواز بکەیت،**

**لە دوای نوێژ بە چارەکە سەعاتێك دادەخرێت ئیتر لە کوێ بانگەواز دەکەیت، ئیتر تۆ چۆن بانگەواز دەکەیت بۆ لای خوای گەورە و میهرەبان؟** [شوێنێك کردنەوەی ماڵی خوای تێدا ئازاد نەبێت ئیتر چۆن بانگەوازی تێدا دەکەیت؟!] **ئێستا کۆبوونەوەی چوار یان پێنج گەنج بە گوناهو جەریمە دادەنێن، یان خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بە هەمان شێوە لەسەری دەبێت بگیرێن و بە قاچ و تەوێڵدا هەڵواسرێن لەسەری، کەواتە شوێنێ بێ باوەڕان ئەوەندە بەهێزبن تێیدا ئیتر چی بۆ تۆ ماوەتەوە؟ کەواتە تۆ بە جێ هێڵەری شارەکەیت بۆ بێ باوەڕان و عەلمانیەکان، بەڵام خۆت وا گومان دەبەیت کە بەجێت نەهێلاوە، خۆت بێ ئاگا دەکەیت، بەڕاستی خۆت دەخەڵەتێنی!! کوا بانگەواز و قسەکانت؟! کێیە کە قسەی کردووە دژی تاغوتەکان بەرامبەر زوڵم و زۆریان** [کێ دەنوانێت لەسەر مینبەرەوە زوڵم و زۆری زاڵمان ئاشکرا بکات بۆ خەڵکی؟] **ریشەکەت تۆمەتە تاشیت؟! بەرگی خێزانەکەت تۆمەتە کورتت کردەوە؟! کۆبوونەوەت لەگەڵ برایانی موسڵماندا تۆمەتە وازت لێ هێنا؟! نووسینەکانت لەناو گۆڤار و رۆژنامەکاندا تۆمەتە دەستت لێ هەڵگرت؟! وتارەکانی سەر مینبەرت تۆمەتە دەستت لێ کێشایەوە؟!** [کەواتە ئیتر خۆت مەخەڵێتێنە لە ژێر خەوی بێ ئاگاییدا، دەرچۆ ئیتر با دەست نەگریت بە کڵاوی بابردووەوە بۆ ئەوەی رەشەبا نەیبات، با دەست بدەینە چەکی جیهاد و دژی زوڵمی زاڵمان راوەستین، با وەك جێنشینی یەکەمی پێغەمبەری خوا ﷺ بڵێین: "أينقص الدين وأنا حي"].

## دڵەڕاوكێ و ترس لە هەواڵدەرانی دوژمنی كافر (المخابرات)

**قەسەم بە خوا جارێك لە جاران من لە یەكێك لە شارەكاندا بووم، لە مزگەوتێكدا كە گەنجێك لە گەنجەكانی تێدا بوو، ئەو گەنجە دەیناسیم و خۆشی دەویستم، یەكێكی نارد بۆ لام و وتی: ئەی مامۆستا عبدالله، وتم: بەڵێ، وتی: بەڕاستی من ناتوانم لەناو ئەو مزگەوتەدا سەلامت لێ بكەم، وەرە بۆ ماڵی خۆمان، بەڵكو بتوانم لە ماڵی خۆمان سەلامت لێ بكەم،** [واتە بەڵكو لە ماڵی خۆمدا بوێرم سەلامت لێ بكەم]، **لەوەڵامدا وتم: من نامەوێت بێم بۆ ماڵی تۆ، مزگەوتێكە بە هەزاران یان سەدان كەسی تێدایە، ناتوانی سەلامم لێ بكەی؟ جەنابت دەوڵەتی ئیسلامی دابمەزرێنی و بەڕێوەی بەری بەم نەفسیەتەوە؟ بەم دەروونە ترساوەوە؟ سوێند بە خوا نەك دەوڵەتی ئیسلامی بەڵكو ناتوانی شارێكی ئیسلامی دابمەزرێنی و بەڕێوەی بەری، دەروونێكی رووخاو و لەرزۆك لە ترسی سیخوڕ و جاسوسەكانی بێ باوەڕان** [كەی لە مێژووی ئیسلامیدا موسڵمانان واز ەلیل و دەست شكاو بوون؟ دەروونێك ئەگەر لەگەڵ خوای زانادا پەیوەندی هەبێت چۆن دەبێ بەو شێوەیە لە دوژمنەكانی خوا بترسێت؟ دەروونێك ئەگەر ترسی خوای گەورەی تێدا بێت بۆ دەبێ لە بێ باوەڕان بترسێت؟ ﴿ أَتَخْشَوْنَهُمْ ۚ فَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَوْهُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾ (التوبة: ١٣). واتە: ئایا ئێوە لە كافران ئەترسن؟ خۆ بەڕاستی خوای گەورە شیاوترە لێی بترسن ئەگەر ئێوە باوەڕدار بن. بەڕاستی ئەم ئایەتە دەبێت ئینسانی ئیماندار زۆر شەرمی لێ بكات، چونكە خوای گەورە بە شێوەی پرسیار ڕوومان تێ دەكات و مەبەستیشی لە پرسیارەكە ئەوەیە كە ئەی موسڵمانان سزا و تۆڵەی خوای گەورە شیاوترە لەوەی كە لێی بترسن تا هاشو زەنگی بێ باوەڕان، بەراستی هەتاكو شەرمو ترسی خوای گەورە لەدڵدا زیاتر بێت، ئەوە زیاتر ترسی كافران كەم دەبێتەوە]، **دێت پێت دەڵێت من خەڵك پەروەردە دەكەم لەسەر یەكتاپەرستی و بیروباوەڕ (العقیدة) نازانم ئەوە چ بیروباوەڕێكە خەڵكی لەسەر پەروەردە دەكەیت؟!! دەڵێت پەروەردەیان دەكەم بە پەروەردەیەكی ئیمانی، ئەوە چ ئیمانێكە تۆ پەروەردەی خەڵكی دەكەیت لەسەری؟ یەكەم پلە لە پلەی باوەڕ ئەوەیە كە تۆ باوەڕ**

**بهێنی بەڕاستی خوای گەورە کە دروستکەرە، ڕۆزی دەرە، یەکتاپەرستی پەروەردگاریەتی خوا دەبێت هەبێت (توحيد الربوبية)، بەڵام ئایا لە ژیانتدا لە چ کاتێکدا کەوتوویتە وەزعێکەوە و ڕووداوێکەوە بۆ خوای گەورە و لەو ڕووداوەدا ترسابیت لە رزق یان لە کۆتایی ژیانت (أجل)، کەی تێی کەوتوویت؟** [کەواتە ئەو بیروباوەڕەی کە بەنیازی خۆت و خەڵکی لەسەر پەروەردە دەکەیت بانگەوازی بۆ دەکەیت هەتا ئێستاش لە کردەوەی خۆتدا ڕەنگی نەداوەتەوە، هەتاکو کۆڵ نەپێچیتەوە بەرەو مەیدانی جیهاد هەر بەردەوام ڕەنگ ناداتەوە].

**پیاوێك دەڵێت: پیاوێکی سیخور هاتووە و لە گەڕەکی ئێوەدا نیشتەجێ بووە، لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵەدا یەکسەر بیر لە گوێزانەوە دەکاتەوە لە گەڕەکەکەدا، ئەگەر بوترێ ئەو سیخوڕە ڕاپۆرتێکی لەسەر نووسیوی ئەوە گەورەترە بەسەر دەروونتەوە لە فەوتانی نوێژی بەیانی، ئایا وانییە؟ ئایا دەتوانیت بڵێی نەخێر ناترسم؟ بێگومان نەخێر ناتوانی بڵێی، چونکە دەبێت بە درۆ، سوێند بە خوا دەبێت بە درۆ، سوێند بە خوا دەترسیت و خەفەت دەخۆیت زیاتر لە فەوتانی نوێژی بەیانی، کەواتە مانای ئەوەیە تۆ لە سیخوڕەکان زیاتر دەترسیت تا خوای گەورە و پەروەردگاری جیهانیان، بێگومان وایە و هیچ گومانی تێدا نییە، کەواتە پێویستە و هەردەبێ ئەم جیهادە پیرۆز بکەیت** [دەبێ زیندووی بکەینەوە لە دەروون و مێشکی ڕۆڵە خوێنگەرمەکانی ئیسلامدا ]، **ئەم جیهادە ئەمڕۆ فەرزی عەینە،** [لە سەدەی بیستەمدا وەکو نوێژ و ڕۆژوو] **ئیزنیش لە کەس وەرناگیرێت بەهیچ شێوەیەك، باوك، دایك، هەرکەسێك.**

**من جارێکیان لەناوچەی (جاجی) بووم و دکتۆرێك کە لە ناوچەی (طائف) هاتبوو وتی: من دکتۆرم فلان کەسم، منیش وتم: یاخوا بەخێربێیت، هەواڵی حاڵ و ماڵ و منداڵم لێ پرسی و ڕێزمان لێگرت وتم چیت دەوێت؟ وتی: برایەکم لای ئێوەیە، منیش پێم وت: بۆچییتە و چیت دەوێت؟ وتی: دەمەوێ کە قسەی لەگەڵ بکەم، بەڵکو بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆمان، لەوکاتەدا کە خۆم و خۆی بووین، گوللە ڕاجیمە و ساروخ بەرەو ڕوومان هات بەشێوەیەکی زۆر، بەڵێ هاتبوو بۆ ئەوەی براکەی**

بگێڕێتەوە، پێم وت: ئەگەر خوای گەورە بیەوێت ئەوە پاش ماوەیەکی تر ویست و ئارەزووەکانی خۆتت دەست دەکەوێت، برا موجاهیدەکەی هات، ئەویش پێی وت: بگەڕێرەوە لەگەڵمدا، وتی: لەبەرچی بگەڕێمەوە؟ وتی: دایکت نەخۆشە، ئەویش وتی: باشە ئوممەتێك بەجێ بهێڵم و بگەڕێمەوە بۆ تەنها دایکێك؟ ئوممەتێك دەفەوتێت، دووبارە وتییەوە بە پرسیارەوە: ئایا من ئوممەتێك بفەوتێنم و بگەڕێمەوە بۆ لای دایکم؟ پاشان پێی وت: بگەڕێرەوە هەردەبێ بێیتەوە لەگەڵم، ئەویش وەڵامی دایەوە و وتی: بەڵێ تەواو دەرچووم و کۆچم کردووە بۆ لای خوا، لەدوای ئەو کۆچکردنە گەڕانەوە نییە، پاشان هەروەك تەشەرێك پێی وت: بەخێر بێی ئەی برای خۆم، هاتیت یارمەتیم بدەیت لەناو جیهاددا، خوا جەزای خێرت بداتەوە... بەڵێ، بەڕاستی ئەی برام وا گومانم نەدەبرد تۆ ئەگەر بگەیت پێم یارمەتیم نادەیت لەم شەڕو جیهادەدا، بەڵێ ئوممەتێك دەفەوتێت [جا با هەر بفەوتێت ئەو چ ئیشی بە ئوممەتی ئیسلامی هەیە، ئیشی ئەو بر یتییە لە خەوو خواردن و خواردنەوە].

بەڵی ئوممەتێك بڕزێت، یەك وشەش ناتوانی بڵێی کە باسی ئیسلام بکات بە ئاشکرا، کەواتە کوا ئەو دینەی کە تۆ پارێزگاری لێ دەکەیت؟ کوا ئەو بیروباوەڕەی کە تۆ دەیپارێزیت؟ماڵەکەت لە نێوان شوێنی رەقس و هەڵپەڕکێ و ئارقە خواردنەوەدایە، ئەم دوو خراپە گەورەیە لە نێوانیاندا دەژیت، ناتوانیت بەرهەڵستی لێ بکەیت؟ کە بەشەو و بەڕۆژ بەردەوامە، هەموو سەعاتەکانی شەو دەرگای کراوەتەوە و ئامادەیە، وە ناتوانیت بەرهەڵستی لە ماڵی دانراو بۆ گۆرانی بکەیت، ناتوانی بەرهەڵستی بکەیت و بیوەستێنی، ئەو ئافرەتە گۆرانی بێژە کە زەلیل و ناچار کراوە هەتاکو دەمێ گۆرانی بڵێ و رەقس و هەڵپەڕکێ بکات.... ئایا دەتوانیت؟ ئایا تۆ دەتوانیت بەرهەڵستی بکەیت لە کاتێکدا کە ئەو ئافرەتە دەبینی و تەماشایان دەکەیت لەبەردەم هەموو خەڵکدا شانۆگەری و تەمسیل دەکەن لەسەر شانۆکان کە جلەکانیان بە تەواوی لەبەر خۆیان دادەکەنن؟!! ئایا دەتوانیت کراسێکی تەنك لەبەر کچێکدا لابەیت کە هەموو گیانی دیارە و بەزووترین کات

بەرهەڵستی لێ بکەیت؟ نەخێر ناتوانیت بەهیچ شێوەیەك، خۆ شارەکەت عەلمانیەکان و فاسقەکان و فاجرەکان بە تەواوی دەستیان بەسەردا گرتووە کەچی تۆش ناتوانی هیچ ئەنجام بدەیت، کەواتە تۆ شارەکەی خۆت نەپاراستووە... تەنانەت پارچە کونێکی دیوارشت نەپاراستووە، کوا ئەو کونەی کە جەنابت پارێزگاری لێ دەکات و پارێزگاری لێکردووە؟ چەند لێدان و هەڵواسینت لە پێناوی دینی خوادا چەشتووە؟ چەند رۆژ لە پێناوی دینی خوادا زیندان کراویت؟ چەند جار وشەیەکت وتووە کە دژایەتی زاڵمانی تێدا بێت؟ وتووتە لە رێگای خوادا؟ خۆ دەشگونجێت قسەیەك بکەیت، بەڵام بۆ خوا نەبێت، قسەیەکیش لە قورئان و لە ئیسلامیش بێت بەڵام بۆ خوا نەبێت، کەواتە حاکمەکە رازی بووە، کە تۆ ئەو قسەیە بکەیت، بەڵام ئەگەر جەنابی حاکمەکە رازی نەبێت تۆش ناتوانیت قسەیەك بکەیت و دەری ببڕی، ئەگەر ئەو دەوڵەتەی کە جەنابت تێیدا دەژی بێتو تووڕە بێت لە (نصیری)یەکان ئەوا هێرش کردنە سەریان دەبێتە شتێکی ڕەوا و جائیزە، یان ئەگەر تووڕە بوو لە شیعە هێرش دەست پێدەکرێت بۆ سەریان، بەڵام ئەگەر هاتو دەوڵەت و شیعە رێك بوون ئایا کەس ئەتوانێ قسەیەك بکات؟ نەخێر ناتوانێ...

ئەگەر دەوڵەتەکە لەگەڵ رووسیادا کەوتە ناکۆکی و جیاوازییەوە یەکسەر بەناوی ئیسلامییەکانەوە دەردەچێ بۆ هێرشکردنە سەر شیوعیەت و سۆشیالیستی و دەڵێن کوفرە و دەرچوونە لە دینی خوا، بەڵام ئەگەر هاتو دەوڵەت لەگەڵ رووسیادا رێککەوت و چەك و تەقەمەنی نارد، ئەوا سۆسیالیستی دەبێتە دینی خوا!!

شێخی ئەزهەر رۆژانە دەردەچێت و باسی سۆسیالیستی و ژیان دەکات، کەواتە ئێمە قسە بۆ خوا ناکەین، قسە هەمووی بۆ رژێم و دەسەڵاتدارەکانە. هەرشتێك ئارەزووی ئەوان بێت ئێمە ئەوە باس دەکەین، هەر باس و شتێکیش کە پێچەوانەی هەواو ئارەزووی ئەوان بێت ئێمە یەکسەر دەیشارینەوە و ونی دەکەین و باسی ناکەین [هەروەك ئەو شتە لە ئیسلامدا نەبێت]، بەڵام خۆ خوای پەروەردگاریش پەیمانی وەرگرتووە و دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ

﴿لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ وَٱشْتَرَوْاْ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ﴾ **(آل عمران: ١٨٧)**.

**[ابن كثير لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ئەمە ڕەخنە و هەڕەشەی خوای گەورەیە بۆ (أهل كتاب) ئەوانەی کە خوای گەورە لە سەر زمانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة السلام) پەیمانی لێ وەرگرتوون، کە باوەڕ بهێنن بە موحەممەد ﷺ و خەڵکیش ئاگادار بکەنەوە بە باس کردن و ئەگەر خوای گەورە ناردی شوێنی بکەون، بەڵام ئەوان ئەمەیان بۆ نەکردو شاردیانەوە. ئەو هەموو پەیمانە کە پێیان درابوو کە خۆشی و خێر بوو لە دونیاو دوارۆژدا گۆڕییانەوە بە بەشێکی کەمی هیچی دونیایی، لەمەشدا ئینزار و ترسی تێدایە بۆ زانایانی ئەم ئوممەتەش کە ڕێگەکەی ئەوان بگرنەوە بەرو ئەوەی هات بەسەر ئەواندا بەسەر ئەمانیشدا بێت، کەواتە فەرزە لەسەر زانایان ئەوەی کە لەبەر دەستیاندایە لە زانیاری چاك و سوودبەخش بیبەخشن و هیچ شتێکی لێنەشارنەوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: هەرکەسێك پرسیاری لێ بکرێت لە بارەی زانیارییەکەوە ئەویش شاردیەوە ئەوە لە ڕۆژی دواییدا لغاو دەکرێت بە لغاوی ئاگر...**

**بەڵێ نابێ زانایانی ئیسلام یاساکانی ئیسلامی پیرۆز بشارنەوە لەبەر بەرژەوەندی خۆیان، لە خواردن و بەشی دونیایی، لەبەر پارە و پلە، لەبەر ترس و هەڕەشە، برای بەڕێزم، ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر ئەم شتە دونیاییانە وازی لە بانگەوازەکەی بهێنایە ئەوە هەر لە سەرەتاوە دینەکەی خوا بە تەواوەتی بڵاو نەدەبوویەوە، ئایا چەند جار لەلایەن قورەیشیەکانەوە خواردن و خواردنەوە و پارە و ژن و ماڵ و پاشایەتی نەدرایە بۆ ئەوەی دەست لە دینەکەی هەڵبگرێ و وازی لێ بێنێ!! بۆ ئەوەی ئەگەر خۆشی وازنەهێنێ، بەڵام خەڵکی بۆ بانگ نەکات؟ بەڵام کردەوەکانی قورەیش باس نەکات، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەبێباکانە وەڵامی دایەوە و دەیتەزاندن، پێی دەسەلماندن تازە هیچ شتێك کار لەو ناکات کە واز لە بڵاوکردنەوەی یەکتاپەرستی بهێنێت].**

## پاداشتی سەنگەرنشینی (الرباط)

**ئێستا ئەی برای موجاهیدم تۆ دەستت پیٚ کردووە بە ڕێگەی (الرباط) سەنگەرنشینی، ئەوەتا پێغەمبەری ئیسلام ﷺ دەفەرموێت: (رباط يوم في سبيل الله خير من الدنيا وما فيها).[1] واتە: سەنگەرنشینی ڕۆژێك لە ڕێگەی خوادا چاکترە و خێرترە لە دونیا و ئەوەیش لە دونیادایە (سبحان الله). لە شوێنێکی تردا دەفەرمویٚ: (خير مما طلعت عليه الشمس وما غربت). واتە: خێرترە لەوەی کە خۆری لەسەر هەڵدێت و خۆری لەسەر ئاوا دەبێت.** [واتە هەرچی پارچە زەویەك هەیە لەم جیهانەدا، چونکە چ پارچە زەویەك هەیە تیشکی خۆری بەرنەکەوێت، هەرکەسێك ئەگەر سەنگەرنشین بێت (المرابط) بمرێت ئەوە مۆری کۆتایی نانرێت بەسەر کردەوەکانیەوە، بەڵکو کتێبەکەی بە کراوەیی دەمێنێتەوە هەتاکو ڕۆژی دوایی، بەردەوام هەتاکو ڕۆژی دوایی فریشتەکان کردەوەی چاکی بۆ دەنووسن، دوایین لاپەڕە لە لاپەڕەکانی کردەوەی ژیانت چەندێك ماندووبوویت ئەوە دەمێنێتەوە و هەموو ڕۆژێك پارچەیەکی لێوەردەگیرێت و دەخرێتە لای پەڕاوی کردەوەکانت بۆ ئەوەی کردەوەی چاکت بەردەوام بۆ تۆمار بکرێت وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (ما من ميت إلا يختم على عمله إلا الذي يموت مرابطا فإنه ينمو عمله له إلى يوم القيامة ويغذي برزقه).[2] واتە: هیچ مردوویەك نییە مەگەر مۆر ئەنرێت بەسەر کردەوەکانیدا کاتیٚ دەمرێت، جگە لە سەنگەرنشین، چونکە ئەو کردەوەکانی بۆ زیاد دەکرێت و گەشە دەکات هەتاکو ڕۆژی دوایی، خۆراکێشی دەدرێتیٚ بە رزقو ڕۆزی خۆی. بەڵیٚ بەیانی و ئێوارە خواردەمەنی بۆ دێت لە بەهەشتی بەرینەوە و لە سزای ناو گۆڕو گیانکێشان ڕزگاری دەبێت، وە لە پرسیارەکانی (نەکیر و مونکیر)یش ڕزگاری دەبێت، لەبەرئەوەی سەنگەرنشینە].

---

[1] رواه البخاري.

[2] رواه البخاري.

بەڵی ئەی برای موسڵمانم تۆ کە لە شارەکەت دەمێنیتەوە ناڕەحەتیت و تەنگەلانی، تۆ هاتوویت ئێستا دینی خوا دەپارێزی بە کردەوە، سوێند بە خوا ئێستا دینی خوا دەپارێزی بە کردەوە، سوێند بە خوا ئێستا ڕۆژێکی تۆ خێرترە لە دونیاو هەرچی وا بەسەر دونیاوە، ئایا وانییە؟ ئایا ئەوە نییە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەی ئیمام بوخاریدا ئەفەرموێت: سنگەرنشینی ڕۆژێك لە ڕێی خوادا چاکترە و خێرترە لە دونیاو لەوەش کە بەسەر دونیاوەیە. سوێند بەخوا سەنگەرنشینی گەورەترە لە قوتابخانەکەت، لە پەیمانگاکەت، لە زانکۆکەت، خێرترە لە شارەکەت، گەورەتر و خێری زۆرترە لە هەموو شوێنێك کە تۆی تێدایە، بەڵکو بەرزتر و پایەبڵندترە لەم دونیایە بە هەموو لەزەتەکانیەوە، فەرموودەیەك کە نزیك بووتەوە لە (المتواتر)[1] کە دەفەرموێت: (رباط يوم في سبيل الله خير مما طلعت عليه الشمس وغربت)[2]. واتە: سەنگەرنشینی ڕۆژێك لە ڕێگای خوادا چاکترە لەوەی کە خۆری لەسەر هەڵدێت و ئاوا دەبێت. واتە هەموو دونیا. کەواتە ئیتر من و ماڵ و منداڵ چی؟ من و ژن چی؟ من و دنیا چی؟ عەممان و دیمەشق و قاهیرە و هەموو شارەکانی تر، هەموو ئەم شارانە بە گشتی، ماڵ و سەروەت و بازرگانی بازاڕەکەت و قوتابخانەکانی، پەیمانگاکانی، زانکۆکەی، ئەمانە هەمووی نابێ بە ڕۆژێك سەنگەرنشینی لە مەیدانی سەنگەرنیشینیدا (الرباط) [چونکە بەراستی سەنگەرنشینی قوتابخانەیەکە دەروونی موسڵمانان پەروەردە دەکات].

بەڵێ تۆ لێرەدا تەنها سەنگەرنشین نیت و بەس، تۆ خۆت ئامادە دەکەیت، خۆئامادەکردن فەرزە، تۆ سەنگەرنشینی دەکەیت، سەنگەرنشینی فەرزە، ئێمە لە سەنگەرنشینی ڕاستی ناچین، سەنگەرنشینی تەواو نین، بەڵێ بەراستی خۆئامادەکردن فەرزەو لە پێشترە، تۆ لە مەیدانی فێربوونی چەك و تەقەمەنی

---

[1] ئەم جۆرە فەرموودەیە کە لە سەنەدەکەیدا کۆمەڵێك دەیگێڕنەوە لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکی تر هەروا بە کۆکەڵ، کۆمەڵ، وە زانیاری بەتینتریش دەبەخشێت، واتە بێگومان.

[2] رواه مسلم.

**پاداشتت زۆرترە، پاداشتت زۆرترە لە مەیدانی پێشەوە، هەتاکو بە باشی خۆت ئامادە بکەیت مانەوەت لە دواوە خێرترە وەك لە پێشەوەت، هەتاکو خۆت ئامادە دەکەیت**، [چونکە خۆ ئامادەکردن بۆ جیهاد وەك دەست نوێژ وایە بۆ نوێژ کردن، وەك چۆن ئەو کەسەی کە نوێژ دەکات هەر دەبێت دەست نوێژی هەبێت، بە هەمان شێوەش موجاهید دەبێ پێش جیهاد خۆی ئامادە بکات]، **بەڕاستی تۆ گوناهباری ئەگەر خۆئامادەکردنت بەجێهێشت و پەلەت کرد بۆ ئەوەی سەنگەرنشینی بکەیت لە ڕێی خوادا** [واتە نابێت پێش خۆ ئامادەکردنو تەقەمەنی بچیت بۆ جیهاد، هەروەك چۆن نابێت پێش دەست نوێژ گرتن نوێژ بکەیت]، **کەواتە شایانی دووبارەکردنەوەیە باس بکرێ، ڕۆژێکت لە مەیدانی ڕووبەڕووبوونەوە و سەنگەرنشینی خێرترە لە دونیاو ئەوەی بەسەر دونیاوەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (رباط يوم في سبيل الله خير من ألف يوم فيما سواه من المنازل يقام ليلها ويصام نهارها).**[1] **واتە: سەنگەرنشینی ڕۆژێك لە ڕێگەی خوادا خێرترە لە هەزار ڕۆژ لە مەنزڵگاکانی تر کە ئەو هەزار ڕۆژە بەشەوەکەیدا شەو نوێژ بکات و بە ڕۆژەکەیدا ڕۆژوو بگرێت.** [الله اكبر، خێرترە لە هەزار ڕۆژ، یەك ڕۆژ خێرترە لە هەزار ڕۆژ! ئەو هەزار ڕۆژە نەك لە گۆرانیدا نەك لە یاریدا نەك لە دانیشتندا... ئەمانە نەبێت، بەڵکو شەوەکەی شەونوێژ بکات و ڕۆژەکەشی ڕۆژوو بگرێت]، **دەی توخوا چ نیعمەتێك گەورەترە لەم بەخشش و ڕێزە؟!** [قاسە و کوپە زێڕ و پارە و ماڵ و ژن و قەسر و منداڵێك گەورەتر و خۆشتر و بەکەڵکترە لەم بەخشش و ڕێزە؟! بێگومان هیچ شتێك لەمە گەورەتر نییە، جا خوایە بۆ خاتری قورئان بە نسیبمان بکەیت، بەو هۆیەوە لە ئاگری دۆزەخ ڕزگارمان بکەیت، چونکە سوێند بە خوا ساتێك لە ئاگری دۆزەخدا ئیدارە ناکەیت، زۆر بەتینە، ئامین].

---

[1] رواه النسائي والترمذي وحسنه.

## ترس و زەلیلی و لاوازی بەلگە نییە بۆت لای خوا

**زانایان و فوقەها (خوایان لیٚ ڕازی بێت) یەکەم جار دەفەرموون: جیهاد کردن دەبێت بە فەرزی عەین لەسەر ناوچە و شوێنێك پاشان دەبێت بە فەرزی عەین لە سەر ئەو شوێنەی لێیەوە نزیکە، پاشان ئەوەی لەوەوە نزیکە، ئەمە لەکاتێکدایە ئەگەر شەڕەکان کۆتاییان پیٚ بێت بە ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ یان سیٚ ڕۆژ، بەلاٚم ئێستا لە سەدەی بیستەمدا ئەوە دە سالٚی تەواوە شەڕ بەردەوامە** [زۆرانبازی نێوان کوفر و ئیمان گەرم بووە ململانێیەکی زۆر خوێناوی و بەتین و تەوژمە] **باشە چ عوزرێك هەیە بۆ یەکێك لە زەویدا، کە دوا بکەوێت، بەلٚیٚ ئەو زانا و فوقەها بەڕێزانەی کە دەفەرموون جیهاد کردن لە پێشدا لە ناوچەیەك فەرزی عەینە لەسەر ناوچەیەك، پارچە زەویەك، بلاٚو دەبێتەوە بە شوێنەکانی تردا لە پاشان، ئەمە لە ڕۆژێکیشدا کە گەیشتن بەو ناوچەیە بە سواری ئەسپ و هێستر و گوێدرێژ بوو، بەلاٚم ئەمڕۆ بە تەیارە لە دوورترین شوێنەوە دێیت بۆ زەمینی جیهاد لە ڕۆژێکدا یان دوو ڕۆژ هەتا زیادەڕەوی نەکەین، ئایا وانییە؟ دەتوانیت بلێی ئەمە وانییە؟ کەواتە جیهاد کردن فەرزی عەینە، وەك نوێژ لەسەر میصری و** [عێراقی] **و سعودی و سوری و ئەردەنی و ....هتد، هەروەك ئەفغانی و ئەو شوێنەی کە شەڕەکەی تێدایە، چونکە هەروەك ئیبن تەیمیە (خوای لیٚ ڕازی بێت) ئەفەرموێت: (ارض الاسلام کالبلد الواحد، إذا أن بلدان الاسلام کلها کالبلد الواحد) واتە زەوی ئیسلام وەك یەك ولاٚت وایە، هەموو ولاٚتانی ئیسلام وەك یەك ولاٚت وان، بەلاٚم تۆ لە دیمەشق لە دایك بووی، پێویستە هەر لە دیمەشق بژیت و بمری؟** [واتە وا دەزانی فەرزە] **وە هەموو ڕۆژێك شتێك لە بیرو باوەڕەکەت ون دەکەیت دوای ئەوە تۆ دەمریت بە زەلیلی و لاوازکراوی، بەوەوە دەڕۆیت بۆ دۆزەخ کە ناخۆشترین و نالەبارترین جێگا و مەنزلٚگایە، بەم شێوەیەش قورئانی پیرۆز بەیانی دەکات و دەفەرمویٚ:** ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ قَالُوا۟ فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ قَالُوٓا۟ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُوا۟ فِيهَا ۚ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴾ **(النساء: ٩٧) واتە: بەڕاستی ئەو کەسانەی کە فریشتەکانی خوا گیانیان کێشان زولٚمیان لە دەروونی خۆیان کردبوو، واتە کاتێك کە فریشتەکان گیانیان دەکێشن حالٚی ئەوانیش ئەوەیە کە زولٚمیان لە خۆیان و**

دەروونی خۆیان کردووە بە مانەوەیان لەگەڵ کافرەکاندا لە ماڵی هاوەڵ بڕیاردەراندا و وازهێنان بۆ حاڵی باوەڕدار. فریشتەکانی خوا پێیان وتن: ئەوە ئێوە لە چیدا بوون، واتە فریشتەکانی خوا پێیان دەڵێن: ئێوە لە کاروباری ئیسلامیدا لە چ شتێکدا بوون، ئەوانیش وتیان: ئێمە زەلیل و لاواز کراو بووین و چەوساوە بووین - مەبەست ئەو موسڵمانانە بوو کە لە مەککەدا مابوونەوە و کۆچیان نەکردبوو - بێ توانا بوون لە بەڕێوەبردنی ئیسلامدا - فریشتەکان پێیان وتن: ئایا زەوی خوا بۆ ئێوە پان و فراوان نەبوو کە کۆچی تێدا بکەن؟ بەڕاستی ئەوانە مەنزڵیان دۆزەخ و ئاگرە، کە ناخۆشترین مەنزڵگایە،[1]

بەڵێ موخابەرات، نوصەیریەکان، حافظ الأسد، [صدام]، ناتوانین قسە بکەین، هەرکەسێ قسە بکات بەشێوەیەك ئەوان پێیان ناخۆش بێت سەری ئەبڕن، (قَالُواْ فِيمَ كُنتُمۡ) ئێوە چیتان ئەنجام دەدا؟ وتیان: (كُنَّا مُسۡتَضۡعَفِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ). ئەم ئایەتانە دابەزی بۆ ئەوانەی کە لە شاری مەککەدا بوون، ئەوانە کە کۆچیان نەکرد، ئەوانەی کە لەگەڵ ئەبوجەهلدا دەرچوون لە شەڕی بەدردا لە شەرم و ترسدا، کۆمەڵێك لەو ئیماندارانە کوژران کە لای ئەبوجەهل بوون، یارەکانی پێغەمبەر ﷺ خەفەتیان خوارد لە کاتێکدا کە ئەم ئیماندارانەیان بینی بەم شێوەیە و وتیان برا چەوساوە و لاوازکراوەکانمان کوشت، ئەوانەی کە لە ڕیزی موشریکەکاندا بوون، خوای گەورەش ئەم ئایەتە پیرۆزەی دابەزاند بۆ دڵ ئارامکردنەوەی موسڵمانەکان لە یارەکانی پێغەمبەر ﷺ (فَأُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا).

[(ابن كثیر) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: ئەم ئایەتە پیرۆزە دابەزی بە گشتی بۆ هەموو کەسێك کە توانای کۆچ کردنی هەبێت و کەچی لەناو موشریکەکاندا دابنیشێت، نەشتوانێت ئیسلام بەڕێوەبەرێت، ئەوە بە ڕاستی زوڵمە و بۆ دەروونی خۆی تووشی حەرامێك بووە، گوناهبار بووە بە کۆی هەموو زانایان.[2] بەڵێ ئەم هەڕەشەیە دەربارەی ئەو جۆرە موسڵمانانە هاتە خوارەوە].

---

[1] صفوة التفاسير، م١، ص٣٠٠.

[2] مختصر تفسير ابن كثير، م١، ص٤٢٧.

**ئەی خۆزگە چۆن بێت ئەو کەسەی کە لە ماڵدا دادەنیشێت بەس لەبەرئەوەی کە بازرگانەو کاسبە؟ یان لەبەر خاتری دەرامەتێك و وەزیفەیەك؟ یان لەبەر خاتری کشتوکاڵەکەی؟ یان لەبەر خاتری کچە بچکۆلەکەی کە لە پۆلی یەکەمدایە و قوتابخانەکەی دەفەوتێ، برایانی بەڕێز موژدەتان دەدەمێ قوتابخانەی تێدایە و دەست دەکەوێت (بۆ عەرەب) هەتاکو پلەی دواناوەندیش، ئەو کەسەی کە دەیەوێت کۆچ بکات لە ڕێی خوادا لەگەڵ منداڵەکانی وەیان لەگەڵ خێزانەکەیدا، دەتوانێت منداڵەکەی بخاتە بەر خوێندن لە هەموو پلەکانی (سەرەتایی، دواناوەندی، ئامادەیی)**[ذ]**، وە سوپاس بۆ خوا دانیشی پێدانراوە،** [بەڵێ دنیایان خۆشتر دەوێ لە جیهاد!! نازانم بۆچی؟ ئایا ڕقتانە لە بەهەشتی بەرین] **یەکێك لەوانە ئەفغانییەك لە ئەمریکا دەژی پێم وت: دەمانەوێت کە بێیتەوە بۆ ئیش کردن لە شارەکەی خۆتدا، چونکە دکتۆرێکی تایبەتی بوو، خۆی ئیشی لە ناوچەیەك دەکرد ناوی (کندن) بوو، پێم وت: دەمەوێت کە تۆ بگەڕێیتەوە بۆ ئەو ناوچەیە کە تۆی تێدا بوویت، وە پارەی مانگانەت دەدەمێ (١٥٠٠) دۆلار، لە کاتێکدا ئێمە چاکترین دکتۆر (١٢٠٠) دۆلاری دەدەینێ، وە لە شارەکەی خۆتدا مەشغوڵ ببە، وتی: (its few) واتە پارەکە کەمە، وتم بۆ نایەیتەوە، وتی: بەراستی کچێکم لە پۆلی سێیەمی ناوەندیدایە و کوڕێکیشم لە پۆلی یەکی ناوەندیی یان دووی ناوەندیە، ئەمەوێ لە ئەمریکا خوێندنەکەیان تەواو بکەن، ئەگەربێتو لێرە بیانگوێزمەوە ئەوا خوێندنەکەیان دەفەوتێت، کەواتە هەر دەبێت لە ئەمریکا مەسرەفیان بۆ بکەم تاکو سەرکەوتوو بن، بەراستی ئەمە هیچ غیرەتێکی تیا نییە** [ئەمە کەی موسڵمانە؟ چۆن خوای گەورە لێی ڕازی دەبێت؟ نازانم چۆن وەڵامی پەروەردگار دەداتەوە! ئەی قوڕی سوور و ڕەش بەسەری هەتاکو بگاتە ناو دۆڵەکانی دۆزەخ ئەو کاتە بیر دەکاتەوە لە ئیشەکانی خۆی کە چی کردووە، بیر دەکاتەوە کە خۆزگە زانیارییەکانی بۆ جیهاد بەکاربهێنایە، بەڵام خۆ لە بەردەم دادگای خوای گەورەدا خۆزگە و خۆزگەکاری ناخوات].

## جیهاد فەرزی عەینە

## هۆکارەکانی بوونی جیهاد بە فەرزی عەین

ئەی ئەو کەسانەی کە کۆچتان کردووە لە ڕێگای خوادا بۆ خوا، ئەی پشتبەستووەکانی بە خوای گەورە، ئەی ئەو کەسانەی ڕاپەڕیون لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە، ئەی ئەو کەسانەی کە هاتوون بۆ یارمەتیدانی براکانتان لە بیروباوەڕدا (العقیدة) وە بۆ بەندایەتی و پەرستنی خوای گەورەو میهرەبان هاتوون و کۆچتان کردووە، لەبەر خاتری بەندایەتی جیهاد یان بەندایەتی شەڕ، ئەی ئەو کەسانەی کە وازتان لێ هێناو پشتتان هەڵکرد لە لەزەتەکانتان، لە ئارەزووەکانتان، لە ژنەکانتان، لە دراوسێکانتان، لەبەر تەماعی بەهەشتی نەبڕاوە، بۆ فیردەوس بۆ لای ئافرەتەکانی بەهەشتی بەرین، ئەی ئەو کەسانەی کە ژنەکانتان و ماڵەکانتان و منداڵەکانتان تەرك کردووە، بزانن و ئاگادار بن کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێ: ﴿ ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٌ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾ (التوبة: ٤١) واتە ئەی موسڵمانەکان دەربچن بۆ جیهاد بە گشتی، لەش سوکتان و لەش قورستان (خفاف، ثقال) خێزان زۆر و منداڵدارتان، فەقیرو دەوڵەمەندتان، وە جیهاد بکەن لە ڕێگەی خوادا بە ماڵ و گیانتان، ئەم جیهادە چاکتر و خێرترە بۆ ئێوە ئەگەر ئێوە زانا بن.

[ئیمامی قورتوبی لە تەفسیرەکەیدا بەرگی (٨) لاپەڕە (١٠٥)دا بۆ (خفافا، ثقالا) دە ڕای زانایانی باس کردووە لەبارەیەوە:

١ـ ئیبن عەباس بە واتای گەنج و پیر لێکی داوەتەوە.

٢ـ هەروەها ئیبن عەباس و قەتادە بە واتای چالاك و سست لێکیان داوەتەوە.

٣ـ موجاهید دەڵێ: (الخفیف) دەوڵەمەند (الثقیل) هەژار و دەستکورت.

٤ـ حەسەن دەفەرموێت: (الخفیف) گەنج و (الثقیل) پیر.

٥ـ زەیدی کوڕی عەلی دەفەرموێت: مەبەست ئیشکەر و بێ ئیش.

٦ـ زەیدی کوڕی عەلی دەفەرموێت: (الثقیل) بەو کەسە دەوترێت کە خێزان دارە (الخفیف) واتە بێ خێزان.

٧ـ ئیبن زەید دەفەرموێ: (الثقیل) بەو کەسە دەوترێت کە کارو پیشەیەکی هەبێت پێی ناخۆش بێت دەستی لێ هەڵگرێ (الخفیف) بێ کار و پیشە.

٨ـ (نقاش) دەفەرموێت: (الخفیف) ئازاو نەترس (الثقیل) ترسنۆك.

١٠ـ (الخفاف) ئەوانەن کە پێشبڕکێ دەکەن لە شەڕدا و پێشەوایانی شەڕ، (الثقال) بە هەموو لەشکرەکە دەوترێت.

ئەی برای خۆشەویست مانای گشتی ئایەتەکە ئەوەیە کە کۆمەڵی موسڵمانان فەرمانیان پێ کراوە کە ڕاپەڕن بۆ جیهاد، ئیتر ئەگەر جیهاد فەرزی عەینە بیانوو بۆ هیچ موسڵمانێك نەماوە خۆگێل کردن و خۆ بێ ئاگاکردن و خۆشاردنەوە تازە باوی نەماوە. ئەو بیروبۆچوونە گشتییەی کە وتراوە کاتی جیهاد نەهاتووە. ئەوەش ناڕاستییەکەی بۆ هەموو موسڵمانانی ژیر و چاوڕۆشن دەرکەوتووە، سوێند بە خوا ئەمڕۆ هەرکەسێ بە هەرکەسێ بڵێ مەڕۆ بۆ جیهاد هەروەك ئەوە وایە پێی بڵێ نوێژ مەکە، ڕۆژوو مەگرە، زەکات مەدە، هیچ جیاوازییەکی نییە، ئەوەتا زانای بەڕێز و شیکەرەوەی قورئان قورتوبی لە تەفسیرەکەیدا لاپەڕە (١٥١) بەرگی (٨) فەرموویەتی: هەرکاتێ جیهاد کردن فەرز بوو وەك ئەمڕۆ، بەهۆی هێرشی دوژمنەوە بۆ سەر وڵاتێك لە وڵاتەکان دەبێ دانیشتوانی ئەو وڵاتە هەڵسن بۆ بەجێهێنانی فەرزی جیهاد، بەپێی توانا لەگەڵ دوژمندا بجەنگێن و پێویست بە ئیزنی دایك و باوك ناکات، هیچ کەسێك نابێت دوابکەوێت لە جیهاد چ گەنج بێت یان پیر. کاتێ کە ئەبو تەڵحە (خوای لێ ڕازی بێت) ئەم ئایەتەی خوێندەوە (ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا) گوتی: مەبەستی ئەم ئایەتە گەنج و پیرە و خوای گەورە بیانوو لە کەس وەرناگرێت. پاشان بە کوڕەکانی فەرموو: کوڕەکانم! هەموو پێویستییەکی ڕێگەی جیهادم بۆ ساز بکەن. کوڕەکانی گوتیان: بابە گیان خوا بەزەیی پێتا دێتەوە تۆ جیهادت لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ کردووە هەتا کۆچی دوایی کردووە. هەروەها لەگەڵ ئەبوبەکردا (خوای لێ ڕازی بێت) جیهادت کرد هەتا کۆچی دوایی کرد، لەگەڵ عومەریشدا (خوای لێ ڕازی بێت) کردووتە هەتاکو شەهید

بوو، ئێمە لە جیاتی تۆ جیهاد دەکەین، گوتی: نەخێر پێویستیەکانم بۆ ئامادە بکەن هەموو شتێکیان بۆ ئامادە کردو رێگەی جیهادی گرتە بەر ئەوەبوو لە نێو دەریادا کۆچی دوایی کرد، وشکاییەك نەبوو تێیدا بنێژرێت، هەتاکو دوای حەوت رۆژ ئینجا ناشتیان، هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتبوو]، بەڵێ ریوایەت کراوە کە سەعیدی کوڕی موسەیب (خوای لیٚ ڕازی بێت) دەرچوو بۆ شەڕ و لە کاتێکدا چووبوو بە ساڵدا و پیر بوو بوو، وە چاوێکی کوێر بوو بوو، وە نەخۆش بوو [الله اکبر]، پێی وترا خۆ تۆ نەخۆشیت؟ فەرمووی: خوای گەورە داوای ڕاپەڕینی (خفیف و ثقیل)ی کردووە، خۆئەگەر نەتوانم شەڕیش بکەم ژمارەی موسڵمانان زۆر دەبن و دوژمن دەترسێ و پارێزگاری لە کەرەسە و شتومەکەکان دەکەم.

جارێکیان یەکێك لە تابیعینەکان، میقدادی کوڕی ئەسوەدی بینی (خوای لیٚ ڕازی بێت) کە زۆر زۆر قەڵەو بوو (واتە هاتوچۆکردنی ناڕەحەت بوو) دانیشتبوو لەسەر تابووتێك کە خۆی بۆ جیهاد ئامادە کردبوو، ئەویش کە بینی بەو جۆرە، پێی وت: ئایا ئەوە بۆچی ئەمساڵ دانانیشی لەشەڕ کردن؟ ئەویش وتی: (بحوث) ناهێڵێ، (بحوث) ناهێڵێ، ئەوان ئەو کاتە بە سورەتی (التوبة)یان دەگووت (سورەتی البحوث)، چونکە سیفەتی دووڕووەکانی باس کردووە، بەڵێ ئەم صحابیە بەڕێزە دەیفەرموو وە تابیعی بەڕێزیش دەیفەرموو، بەڵکو گەورەی هەموو تابیعین لە زەویدا، لە رۆژێکدا ئەمەیان دەفەرموو: لە رۆژانێکیشدا کە جیهاد فەرزی کیفایە بووە، لەبەرئەوە شەڕەکان لەو کاتەدا گرتن و ئازادکردنی تازە بووە، ئەو کاتە نامووسی ئافرەتانی موسڵمان نەدەتەکێنران، وە بە هیچ شێوەیەك خوێنی منداڵیان نەدەڕژاند، وە بە هیچ شێوەیەك نامووسی ئافرەتی باوەڕداریان لە نیوەی شەودا نەدەتکان، رێزو حورمەتی موسڵمان ئەو کاتە پێشێل نەدەکرا، زەوی ئیسلام هەر هەمووی بە گشتی بەڵکو دین بە گشتی لەناو گێژاوی رەشەبادا نەبوو، رووبەڕووی هەڵکێشان نەبووبوویەوە لە رەگ و ریشاڵەکانیدا، زەوی و دورگەی عەرەبی بێ غەم و ئارام بوو، لە رۆژانی تابیعیندا سەربازگەی ئیسلامی، جەیشە ئیسلامییەکان

ڕۆیشتبوون و ڕژابوونە عەرشی کیسراوە و پارچە پارچەیان دەکرد، زەوی فەتح دەکراو هەموو شەڕەکان و هێرشەکان فەتحەکان فەرزی کیفایە بوون، بەڵام ڕۆژێك کە زەوی ئیسلام ڕووبەڕووی هێرش بووەتەوە ئەگەرچی بستێکیش بێت، لە مێژوودا دوو زانا جیاوازییان نەبوو کە ئەگەر دەستدرێژیی کرابوویە سەر بەشێك لە زەوی موسڵمانان، ئەوە ئەو ڕووداوە کەی پێویستی بە موناقەشە دەبێت، کە ئایا فەرزی کیفایەیە یان فەرزی عەینە؟! [واتە پێویستی بە موناقەشە کردن نەکردووە، بەڵکو هەموو دانیان پێدا ناوە کە جیهاد لەو کاتەدا فەرزی عەینە]، بەڵکو بە هیچ شێوەیەك نەمبینیوە لەناو کتێبی (فقه)دا و نە لە ناو کتێبی تەفسیردا و نە لەناو (أصول)دا و لە نەلە فەرموودەدا و نە لە کتێبی (فەتوا)دا لەسەر ئەوەی کە ئەگەر شارێك لە شارەکانی ئیسلام ڕووبەڕووی داگیرکردن بوویەوە جیهاد لەو کاتەدا فەرزی کیفایەیە، بەڵکو هەموو ئەوانەی دەیانناسین لە موفەسیر و فوقەها و موحەدیسین و ئوصولیین کۆن لەسەر ئەوەی کە ئەگەر دەستدرێژی کرایە سەر بستێك لە زەوی موسڵمانان ئەوە جیهاد دەبێتە فەرزی عەین لەسەر هەموو موسڵمانێك لەو ناوچەیەدا کە دەستدرێژی لێ کراوە، ئەگەر موسڵمانانی ئەو ناوچەیە کەمتەرخەمییان کرد یان تەمبەڵییان کردو وازیان لێ هێنا یان بە تەنها خۆیان بەشی ئەوەیان نەدەکرد ئەوا جیهادەکە دەبێتە فەرزی عەین لەو جیگایەو نزیك تر هەتا هەموو زەوی دەگرێتەوە بەگشتی، ئافرەت دەبێ دەربچێ بۆ جیهاد لەگەڵ یەکێکی مەحرەمدا، وە ئیزنی مێردەکەی پێویست ناکات، وە کوڕ دەبێ ڕاپەڕێ بەبێ ئیزنی باوکی، وە قەرزار بێ ئیزنی خاوەن قەرزەکە، بەڵێ فەرزە لەسەریان پێیان خۆش بێ یان ناخۆش بێت، فەرزێك ناتوانین بە هیچ شێوەیەك وازی لێ بهێنین وەك نوێژ و ڕۆژوو ئەمەش زاراوەی هەموو (فقهاء)ە لە هەموو پەڕاوێکدا لەبارەی جیهادەوە نووسرا بێت لەو کاتەوەی کە سورەتی (التوبة) دابەزیوە هەتاکو ئەمڕۆ، هیچ پەڕاوێکی شەرعیم نەبینیوە مەگەر دانی بەم یاسایەدا ناوە و کۆ بووە

**لەسەری.** [واتە هەموویان باسی ئەم قاعیدەیەیان کردووە بە گشتی و هیچ جیاوازییەکی تێدا نییە].

**بەڕاستی زەوی ئیسلام ئێستا لە هەموو شوێنێکدا سەگەکان دەمیان بۆ کردووەتەوە، وە گورگەکان لە هەموو لایەکەوە پەلاماری دەدەن، ئەمڕۆ ناموسی ئافرەتانی موسڵمان پارێزراو نییە، ماڵی موسڵمانان پارێزراو نییە، خوێنیان بەیانی و ئێوارە دەڕژێنرێت، کێ هەیە ئەم یاسایە بگۆڕێ، بەتایبەتی لەم زەمانەدا کە باری وا ناڕەحەت بەسەر ئوممەتی ئیسلامدا تێپەڕنەبووە. هیچ کاتێك باری وا بەسەر موسڵماناندا تێنەپەڕیوە کە نەیانتوانیبێ خوای خۆیان بپەرستن لەناو خاك و وڵاتی خۆیاندا، هیچ کات زروفی وا بەسەر موسڵمانان تێنەپەڕیوە کە کەسێك بەناوی ئیسلامەوە دابەزێتە سەر سنگی موسڵمانان و رایگەیەنێ کە هەرکەس ریش بهێڵێتەوە زیندانی دەکرێت. کاتی وا هیچ بەسەر موسڵماناندا تێپەڕی نەکردووە، ـ مەگەر کاتی شەڕەکانی سەلیبیی ـ کە مزگەوتی ئەقصا کەوتە دەست کوفر**

[بەڕاستی مێژووی ئیسلامی پیرۆز ڕۆژانی بەم چەشنەی بەخۆیەوە نەبینیوە لەناڵەبارێدا، بەڕاستی لە ڕۆژانی صحابی و تابیعیندا ئەگەر موسڵمانێك بۆ نوێژکردن شمشێر و تیری پێنەبوایە ئەو موسڵمانە زۆر غەریب بوو، بەڵام ئەمڕۆ بەپێچەوانەوە هەر موسڵمانێك لە ناو مزگەوتدا چەکی پێ بێت بە گێلی دەزانن، بە سووك و بێ هۆشی دەزانن، یارەکانی پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەیە نەبوون، گەورەترین شکۆمەندی ئەوەیە کەسانێك بە جێنشینی پێغەمبەری خوا ﷺ لەم ڕێگەدا کوژراون، کێ خۆی لە ئیمام عومەر بە دادپەروەرتر دەزانێت با جیهاد نەکات؟ کێ هەیە خۆی لە ئیمام عەلی بە زاناتر دەزانێ با جیهاد نەکات؟ کێ هەیە خۆی لە حەمزەی مامی پێغەمبەر ﷺ بە ئازاتر دەزانێ با جیهاد نەکات، مەبەست ئەوەیە ئەم یارە بەڕێزانە ئەم سیفەتە جوان جوانانەیان تیا بووە، بەڵام ڕۆژێك لە ڕۆژان شمشێریان دانەناوە]،

**بەڵێ تێپەڕی نەکردووە بەسەر موسڵماناندا زروفێك کە بێئابڕوویی و بێ شەرمی فەرز بێت بەسەر منداڵانی موسڵماناندا و ببرێن بۆ شارەکانی شیوعیەت فێری بێ باوەڕی و بێ ئابڕوویی بە خوای گەورە بکرێن بە چەندین هۆکاری عیلمی و**

**ناچاریش بکرێن کە تیایدا دەبێ سەرکەوتوو بن!** [کەواتە ئەوە بیرێکی زۆر تەسک و بێ بەڵگەیە لە دینی خوادا کە بڵێی جارێ کاتی جیهاد نەهاتووە، پێویستە ئەو موسڵمانەی هۆشیار بێ بە وردی سەیری قورئان و فەرموودە بکات هەتاکو ئەو بۆچوونەی کە لە دەروون و مێشکی دایە نەمێنێ].

## دەقی نووسراوی (فقهاء)ەکان لە فەرزی عەیندا

**بەڵێ لە نموونەی ئەم کات و زروفانەدا ئەگەر ئێمە شێوەیەکی گشتی وەرنەگرین لەم یاسایەدا، ئەوا لە نووسراوی زانایاندا چاکترین و پاکترین و خێرترین، وە باشترین دەرمان و گەورەترین تیمارکەر** [ڕووناکتر لە خۆری چێشتەنگاو، ئیتر مەگەر هەر خۆمان لە هەواو ئارەزووی خۆمان بەردەوام بین، سوێند بە خوا هەموو (فقهاء) لەسەر ئەم (فتوا)یە نووسیویانە و ئیشیان پێ کردووە].

**بەڵێ من کتێبێکم نووسی و ناوم نا (بەرگری لە زەوی موسڵمانان گەورەترینی فەرزە عەینەکانە) لەناویدا زۆر تێبینیم کردووەتە سەر نووسراوێك لە نووسراوەکانی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە کە دەفەرموێ: (دوژمنی بێ باوەڕی هێرشکەر ئەوەی کە بە هێز هێرش دەکاتە سەر موسڵمانان ئەوەی کە دین و دنیای موسڵمانان تێك دەدا، دەیەوێت ژیان و عیبادەتیان لێ تێك بدات، هیچ شتێك لە دوای باوەڕهێنان فەرزتر نییە لە دەرکردن و بەرپەرچدانەوەی .. (لا اله إلا الله محمد رسول الله) لە پاش ئەمە دەرکردنی ئەو بێ باوەڕەی کە دەستدرێژی دەکاتە سەر موسڵمانان، ئەم گوفتارە شیرینە لە کتێبی (الفتاوی الکبری) دا هەیە بەرگی چوارەم** [ئەمڕۆ ئایا موسڵمانان هێرشیان نەکراوەتە سەر؟ دەتوانیت بڵێیت نەخێر؟ ئایا لە ڕۆژی قیامەتدا چی وەڵامی خوشکە موسڵمانەکان دەدەیتەوە؟ کێ خۆی لە ئیبن تەیمیە بە زاناتر دەزانێ با بێتە مەیدانەوە و وەڵامی بداتەوە].

لە شوێنێکی تردا شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەفەرموێت: ئەگەر دوژمنی کافر هاتە ناو شارەکانی ئیسلام ئەوە هیچ گومانی تێدا نییە کە ئەو دوژمنە فەرزە دەرکردن و رووبەڕووی وەستانی لەسەر ئەوەی کە نزیکترە لەو شارەوە و پاشان نزیك تر، چونکە بەڕاستی شارەکانی ئیسلام هەموو وەك یەك شار وان [واتە هیچ جیاوازییان نییە] گوێ بگرە و ئامادەبە ئەی حیجازی و ئەردەنی و میصری و سووری. پاشان دەفەرموێت: فەرزە ڕاپەڕی بۆ ئەو رووبەڕووبوونەوە بەبێ ئیزنی باوك و دایك و ئیزنی خاوەن قەرز. ئەمە گوفتاری شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیەیە و نووسراوەکانی ئیمام ئەحمەدیش زۆر ئاشکرا و روونن لەم بارەیەوە. بگەڕێرەوە بۆ (الفتاوى الكبرى) لاپەڕە (٦٠٨)، بەرگی چوارەم.

[بەڕاستی لەبەرئەوەی ئیبن تەیمیە (خوای لێ ڕازی بێت) زۆر لەسەر قورئان و فەرموودە ڕێی کردووە، زۆر زۆر موجاهید بووە، زۆر مەسەلەی جیهادی بە گەورە داناوە، ئەمەش لەبەرئەوەی کە زۆر شوێنکەوتەی قورئان و فەرموودەکانی بووە]، ئەوەتا لە هەمان شێوە لە (مجموع الفتاوى) دا لە بەرگی (٢٨) لاپەڕە (٣٥٨) دەفەرموێت: بەڵام ئەگەر دوژمن ویستی هێرش بکاتە سەر موسڵمانان ئەوە ڕووبەڕووبوونەوە و بەرپەرچدانەوەی دەبێتە فەرز لەسەر هەموو ئەو موسڵمانانە هێرش بۆ کراوانە، وە غەیری هێرش بۆکراوەکانیش. مامۆستای بەڕێزمان دەفەرموێت: ئەگەر دوژمن ویستی هێرش بکات، ویستی هێرش ئیتر هێرشی نەکردووە، ئەی حاڵ چۆنە ئەگەر دوژمن هاتە ناو ماڵەکانەوە، شارەکانەوە، (مسجد الأقصى) داگیر کرا؟! حاڵ چۆنە ئەگەر شارەکانی ئیسلام داگیر کرا، زەوی ئیمام (بوخاری) داگیرکرا، زەوی (بلخ) داگیرکرا؟! [ئەگەر موسڵمانان داوایان لێ کردی و هاواریان بۆ بەرزکردیتەوە تۆ چۆن شەرمی خوا ناکەی و ناچیت بە پیریانەوە ئەگەر خۆت بە موسڵمان دەزانیت]، هەروەك چۆن خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِنِ ٱسْتَنصَرُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ فَعَلَيْكُمُ ٱلنَّصْرُ ﴾ (الأنفال: ٧٢) واتە: ئەگەر موسڵمانان داوای سەرکەوتن و یارمەتیدانیان لێ کردن بۆ سەربەرزی دین ئەوە لەسەر ئێوەیە یارمەتیدانیان بۆ سەربەرزی دین، لەسەر

ئێوەیە یارمەتیدانیان و سەرخشتنیان هەروەك چۆن پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بەو یارمەتیدانە، ئیتر ئەو پیاوە ئەگەر لە حکومەتی ئیسلامیدا سەرباز بێت یان سەرباز نەبێت هەر فەرزە لەسەری وەك موسڵمان، بە ماڵ و گیانی بە گوێرەی توانای خۆی، دەبێ دەرچێ بۆ جیهاد لەگەڵ کەمو زۆردا... ئەگەر تەنانەت (١٠) موجاهیدیش لە ئەفغانستان و [عێراق] کوشتار بکەن و بانگی جیهادیان بەرزکردبێ فەرزە کە تۆ دەرچی بۆ لایان... لەگەڵ کەمو زۆردا، وە لەگەڵ پیادە و سواردا، بەڵی ئیبن تەیمیەی بەڕێز لە ژێر سێبەری قورئاندا فەرزی دەکات لەسەر فەلەستینی، عێراقی، دیمەشقی، سووری، حیجازی، کە دەبێ بەپێ ڕێ بکەن بۆ زەوی جیهاد و مەیدانی شەڕ، تەنانەت ئەو کەسەی کە پارەی کرێی پێ نییە فەرزە لەسەری کە بەپێی خۆی بێت ئەگەر چی لە ئەمریکاشەوە بێت، لەگەڵ کەم و زۆردا، دەبێ ڕاپەڕێ، لەگەڵ سوار و پیادەدا، هیچ بیانوویەك ناتوانێ بۆ خۆی بدۆزێتەوە، هەروەك چۆن موسڵمانەکان لەکاتێکدا کە دوژمن نیازی بۆ کردن لە ساڵی خەندەقدا، خوای گەورە ئیزنی نەدا بۆ تەرك کردنی ئەو شەڕە بۆ هیچ کەسێك، [بەڵکو سەرجەم یارەکانی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ دەچوونە مەیدانەکانی ڕووبەڕووبوونەوەی بێ باوەڕان].

ئیمام قورتووبی (خوای لێ ڕازی بێت) بەهەمان چەشن دەفەرموێت: "هەرکەسێك هەستی بە لاوازی موسڵمانان کردبێ لەلایەن دوژمنانەوە، وە بزانێت کە توانای پێگەیشتنیانی هەیە، دەتوانێت بچێت بە داڵدەو هاواریانەوە ئەو کاتە دەرچوونی بۆ لایان فەرز دەبێ لەسەر شانی".

بەڵام چوار ئیمامە بەڕێزەکان و زانایانی چوار (مذهب)ەکە، ئەوە گوێ بگرن لە گوتاری ئەبو حەنیفە (خوای لێ رازی بێت) کە لەو بارەیەوە چی دەفەرموێت: "جیهاد فەرزی عەینە ئەگەر دوژمن هێرشی کردە سەر شارێ لە شارەکانی ئیسلام"، ئەو کاتە دەبێتە فەرزی عەین لەسەر ئەو موسڵمانانەی کە لە نزیکیانەوەن، وە ئەو موسڵمانانەی کە دوورن لە دوژمنەوە ئەوە بۆ ئەوان فەرزی

**کیفایەیە ئەمەش لەکاتێکدا کە پێویستیان پێی نەبوو، ئەگەر هاتوو لە حاڵەتێکدا ئەو موسڵمانانەی هێرشیان بۆ سەر دەکرێ پێویستیان بەمان هەبوو، بۆ نموونە: "ئەگەر ئەوەی لە دوژمنەوە نزیکە ناتوانا و و بێ هێز بوو لە بەردەوام بوونی شەڕ و مقاوەمە کردن لەگەڵ دوژمناندا، یان بێ هێز و ناتوانا بوون و جیهادیان نەکرد، ئەوە جیهاد فەرز دەبێت لەسەر ئەو موسڵمانانە کە لێیانە و نزیکن بە فەرزی عەین وەك نوێژ و رۆژوو بە هیچ شێوەیەك ناتوانن وازی لێ بهێنن، پاشان دەبێتە فەرزی عەین لەسەر ئەوانەی کە نزیکترن .... پاشان نزیکتر... هەتاوەکو فەرز دەبێت لەسەر هەموو خەڵکی سەر زەوی لە رۆژهەلات و رۆژئاوا"، لەسەر ئەم پلەیە دەڕوات.. وە بە نموونەی ئەم گوفتارە فتوای داوە ئیمامی (الكاسانی) لە پەڕاوی (بدائع الصنائع) وە (ابن لجين) لە پەڕوای (البحر الرائق) وە (ابن الهمام) لە پەڕاوی (فتح القدير) کە هەموویان زانایانی (مذهب)ی ئەبو حەنیفەن، بەڵام مالیکییەکان ئەوە ئیمامی (الدسوقی) کە یەکێکە لە زانایانی مەزهەبی ئیمام مالیك (خوایان لێ رازی بێت) لە حاشیەکەیدا دەفەرموێت: "جیهاد دەبێتە فەرزی عەین بە هێرش هێنانی دوژمن، بەرگری کردن و بەرپەرچدانەوەش بە هەمان چەشن دەبێتە فەرزی عەین لەسەر هەموو کەس ئەگەر ژنیش بێت یان بەندە بێت، یان منداڵ بێت، وە دەردەچن ئەگەرچی منداڵەکە سەرپەرشتی کارەکەی بەرهەڵستی بکات، وە ژنەکە مێردەکەی بەرهەڵستی بکات، وە قەرزار خاوەن قەرزەکەی بەرگری بکات".**

**بەڵام شافیعیەکان (خوایان لێ رازی بێت) ئەوە ئیمام (رملی) کە یەکێکە لە زاناکانیان دەفەرموێت: "ئەگەر دوژمنان هاتنە شارێکی ئێمەوە - واتە هێرشیان هێنا - تا وەك ئەو مەسافەی نێوان ئێمە و ئەوان کەمتر بوو لە مەسافەی نوێژ کورتکردنەوە (القصر) ئەو کاتە رووبەڕووبوونەوەیان و بەرپەرچدانەوەیان دەبێتە فەرزێك بەسەر ئەو خەڵکەوە تەنانەت ئەوانەشیان کە جیهادیان لەسەر نییە لە هەژار، منداڵ، ژن، بەندە، قەرزار، بەڵام لەلای حەنبەلیەکان، ئەوە (ابن قدامە) لە (المغني)دا دەفەرموێت: "جیهاد دەبێتە فەرزی عەین لە سێ جێگادا:**

**١. ئەگەر هێزی کوفر و هێزی باوەڕ بەیەکگەیشتن و هەردوو ریزەکە رووبەڕووی یەکتری بوونەوە، واتە لە شەڕدا.**

**٢. گەر بێ باوەڕان دابەزینە ناو شارەکە (شاری ئیسلام) ئەوە شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوەیان دەبێتە فەرزی عەین لەسەر ئەهلەکەی، واتە ئەهلی ئەو شارە.**

**٣. ئەگەر ئیمامی موسڵمانان داوای دەرچوون و ڕاپەڕینی کرد لە گەلێك ئەوە دەرچوون دەبێتە فەرز بەسەریانەوە.**

**ئەی برای خۆشەویستم ئەمە گوفتاری هەر چوار ئیمامە بەڕێزەکانە. ئەمە گوفتاری قورتوبی و شێخ الاسلام ئیبن تەیمیەیە** [ئایا کێ لەم زانا بەڕێزانە رۆشنبیرتر و زاناترە؟! ئەم زانا بەڕێزانە کە خواردن و گشت خۆشییەکی ئەم دونیایەیان لە خۆیان تێك دابوو لەبەر خاتری فێربوونی زانیاری و فێرکردنی زانیاری، ئەو کات و حاڵەتانەی کە ئەمان دەفەرموون جیهاد و تێکۆشان تێیاندا دەبێتە فەرزی عەین ئایا نەهاتووەتە دی؟!! ئایا ئێستا دوژمنی بێ باوەڕ هێرشی نەکردووەتە سەر خاکو گیانی موسڵمانان؟!! ئایا تۆ کە گوێ نادەیتە گوفتاری ئیمام ئەحمەد و ئیبن تەیمیە، ئەی بۆ لاقرتی چ مامۆستایەك گوێ دەگری؟ ئەگەر هەر گوێش بەمان نادەی] **ئەوەتا ئیمامی بەڕێز (حسن البنا) بەر ڕەحمەتی خوا بکەوێ لە رسالەکەیدا کە لە بارەی جیهادەوە نووسویەتی لە دوای ئەوەی کە لە (فقهاء)ەوە چەندین گوفتاری نەقڵ ئەکات، لە ئیمام (شەوکانی) و (محلی)ی ئیبن حەزمەوە بەهەمان شێوە لە زۆربەی زاناکانەوە، لە هەر چوار ئیمامەکەوە (خوایان لێ ڕازی بێ) نەقڵ دەکات، دوابەدوای هێنانی ئەو ڕاوبۆچوونانە لەو زانا پێشینانەی خۆیەوە خۆشی دەفەرموێت: ئەوەتا تۆ لەمەدا دەبینیت کە چۆن ئەهلی زانیاری کۆبوونەتەوە لە موجتەهیدەکان و موقەلیدەکان، سەلەفییەکانِ و خەلەفییەکان، لەسەر ئەوەی کە جیهاد کردن فەرزی کیفایەیە لەسەر ئەهلی ئیسلام کە بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی بێت، بەڵام دەبێت بە فەرزی عەین بۆ دەرکردن و بەرپەرچدانەوەی هێرشی بێ باوەڕان لەسەری** [ئیتر ئەی برای خۆشەویستم، ئەگەر جەنابت دان بەمەدا نەنێیت، ئەوە ئیتر کەواتە شوێن هەوا و ئارەزوو و بۆچوونی تەسکی خۆت کەوتوویت، وە شەیتان جار جارە کردەوەکانت بەلاوە جوان دەکات و وا گومان دەبەیت کە بەس تۆ لەسەر راستیت، بەڵام وا نییە و زۆر بە هەڵەدا

چوویت و پێچەوانەی رێبازی "حسن البنا" و "سیدقطب" و زۆر لە زانایانی تریش دەکەیت]، **وە موسڵمان هەروەك دەزانێت ئێستا زەلیل کراون بۆ غەیری خۆیان، لە ژێر حوکم و دەسەڵاتی بێ باوەڕاندان، بێ باوەڕان بە هەرلایەکدا بیانەوێت دەیانفرێنن، زەویان سووتێنراو خاپوور کرا و نامووسیان تکێنرا، رەوشتیان فرۆشرا، لە کاروبارییاندا بێ باوەڕان حوکمی بەسەردا دەکەن، وە "شعائر"ی باوەڕەکەیان لە شارەکەیاندا تەرك کراو نەما و لەبیر کرا، سەرباری ئەوە ناتوانن بانگەوازەکەیان بڵاوبکەنەوە،** [واتە لەبری ئەوەی بانگی خەڵکی بکەن بۆ ئیسلام و جێبەجێ کردنی یاساکانی ئیسلام وازیشیان لە خۆیان هێنا بۆ بێ باوەڕان... بە هەزاران خوشکی موسڵمان لە بەردەم براو باوکیاندا ئابڕوو بران! ! چەند ئافرەتی داوێن پاك لە بەردەم مێردەکانیاندا زینایان لەگەڵ کرا! ! ئەی هاوار ئەی موسڵمانان بۆ چاوێ هەڵنابڕن؟ بۆچی پەردەی زەلیلی و ترسنۆکی لەبەری خۆتاندا نادڕن؟] **سوێند بە خوا فەرزە بە فەرزی عەین کە هیچ گومانی تێدا نییە کە پێویستە هەموو موسڵمانێك خۆی ئامادە بکات، وە خۆی بپێچێتەوەبە نیازی جیهاد کردن، دەبێت ئامادەیی لە رووی تەقەمەنیشەوە بۆ بکات هەتاوەکو خوای گەورە بۆمان دەگونجێنێت، خوای گەورە ئەو ئیشەی کە خۆی دەزانێت ئەنجامی بدات** [کە إن شاء الله هەرواش دەبێت].

**بە دڵنیاییشەوە زانایانی (جامعة الأزهر) دانیان بەم مەسەلەیەدا ناوە و (فتوا)یان لەسەر داوە، لە کۆنگرەی حەوتەمدا لە باسێکدا ئەوەیان راگەیاند کە ئێستا جیهاد کردن فەرزی عەینە بە ماڵ و بە گیان، وە بەخشینی ماڵ بە تەنها بەس نییە.**

**ئەی برایان: ئەمە چەندین گوفتار لەلایەن خوای پەروەردگارمانەوە، ئەمە چەند گوفتار لە لایەن (أهل الذکر) لە زانا بەرێزەکانمانەوە ئەو زانایەی کە خوای پەروەردگار بە واجبی داناوە بەسەرمانەوە پرسیارلێکردنیان، هەروەك دەفەرموێت:** ﴿ فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْـلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾ **(النحل: ٤٣) واتە: پرسیار لە ئەهلی عیلم و زانیاری بکەن لە کاتێکدا کە ئێوە نایزانن**[1].

---

[1] ئیبن عەباس لەبارەی ئەم ئایەتەوە ئەفەرموێ: کاتێك کە خوای گەورە پێغەمبەری ﷺ هەڵبژاردو رەوانەی کرد عەرەبەکان سەرپێچی و ئینکاری ئەمەیان کرد دەیان وت: خوای گەورەترە لەوەی کە نێرراوەکەی ئینسان بێت، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ رَجُلٍ مِّنْهُمْ أَنْ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ ﴾

## ئەوانەی داوای (فتوا )یان لێ دەکرێت لە جیهاددا[1]

**سەبارەت بە پرسیارکردن لە بارەی حوکمی جیهادەوە هەروەك شیخ الاسلام ئیبن تەیمیە لە (الفتاوی الکبری) دەفەرموێت لەسەر ئەوەی کە: "لە کاروباری جیهاددا تەنها پرسیار لەو کەسانە دەکرێت کە ئەهلی دینی راستن و ئاگایان لە کاروباری خەڵکی هەیە، وە پرسیار لەو کەسانە ناکرێت کە تەنها لە ڕواڵەتی دەقەکان دەڕوانن، هەروەها پرسیار لەو کەسانە ناکرێت کە ئاگایان لە کاروباری دنیایی خەڵکی نییە یان خاوەن دینێکی راستیش بن، بۆیە ئیبن تەیمیە دوو مەرجی داناوە بۆ ئەوەی کە فەتوای جیهادی لێ وەردەگیرێ و دەبێ دوو سیفەتی تێدا بێ:**

**١. دەبێت زانایەك بێت لەناو شەڕدا ژیابێت و پێویستییەکانی شەڕ شارەزا بێت و بیناسێ، وە زانیاری بەوە هەبێ کە ئەهلی دونیا ی لەسەرە.**

**٢. دەبێت ئەو زانایە لە زانا چاکەکانە . بۆ خوا سوڵحاو . بێت کەوا لای خەڵك خاوەنی متمانە بێت و بە دینی پاك و راست بناسرێ [خاوەنی بیدعە و فجور و** ئارەزووبازی نەبێت، بە کورتی زانایەکی موجاهید و تێکۆشەر بێت].

**ئەگەرهاتوو یەکێك لەم دوو مەرجەی تێدا نەبوو ئەوا فەتوای لێ وەرناگیرێ لەبارەی جیهادەوە.**

**زۆر لە زاناکانمان و پیاوە بەڕێزەکانمان داوای فتوایان لێ کراوە لەبارەی جیهادی ئەفغانییەوە، پاشان ئەوانیش لە وەڵامدا فتوایان داوە کەوا خەڵکی نەڕۆن بۆ جیهادی ئەفغانی، بەڵام لە دوای ئەوەی کە حەقیقەتی مەسەلەکەیان بۆ دەرکەوت و**

---

(یونس: ٢) وە فەرمووی: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِىٓ إِلَيْهِمْ ۚ فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾﴾ (النحل: ٤٣) واتە: پرسیار بکەن لە زانایانی کتێبە کۆنە رابردووەکان کە ئایا ئەوانەی نێرراون ئینسان بوون یان فریشتە. مختصر تفسیر ابن کثیر، م٢، ص٣٣٢.

[1] ئەم مەسەلەیە لە پێشەوە باس کرا، بەڵام شێخ عبدالله عزام خوای لێ ڕازی بێ بۆیە باسی دەکاتەوە بۆ زیاتر دڵنیا بوون، وە بەڕاستیش مەسەلەکە زۆر گرنگە.

راستی جیهادەکەیان بینی بۆیان روون بوویەوە یەکسەر گەڕانەوە لەو فتوایەی کە دەریان کردبوو.[١]

بۆ وێنە ئەمە مامۆستای بەڕێز شێخ ئەلبانییە خوای گەورە بەرەکەت بخاتە تەمەنییە، ئەم بەڕێزە لە مانگی شەوالی ١٤٠٥ کۆچیدا فتوای دەرکرد کە جیهاد فەرزی عەینە لە ئەفغانستان، بەڵام پێشتر دەیفەرموو: چۆن و بە چ شێوەیەك بۆتان دەکرێت بچن بۆ ئەفغانستان، لە چ شوێنێکدا تەدریب دەکەن، ئایا بۆتان دەکرێت بچن بۆ ناوخۆی ئەفغانستان؟ چۆن دەتوانن بەرامبەر دەبابەی رووسی بە چەقۆ رووبەڕوو ببنەوە؟ پاشان یەکێك لە گەنجەکان پرسیاری لێ دەکات لە وانەی کە ئامادەی مەجلیسەکە بوون دەڵێت: من دکتۆرم دەمەوێت بچم بۆ ئەفغانستان، ئایا بچم؟ فەرمووی: نەخێر مەڕۆ! ئەم فتوایەی شێخ ئەلبانی دای لە رۆژێکدا بوو کە راستی مەسەلەکەی لا روون نەبوو و نەیدەزانی، حەقیقەتی جیهادی لە ئەفغانستاندا نەدەزانی و نەدەناسی، لەکاتێکدا کە ئەو دەیوت: چۆن بە چەقۆ شەڕ بکەن، نەیدەزانی کە ئێمە لە مزگەوتدا دەتوانین هاوەن بکەینەوە و بیتەقێنین، ئەو چەکانەی کە دژی تەیارەن بەکاربهێنین بۆ مەبەستی خۆیان، وە نەیدەزانی کە ئێمە دەتوانین بە سەربەرزی نوێژ بکەین و شەونوێژ بکەین، وە فێری زانیاری ببین و کەسانی تریش فێر بکەین، وە نەیدەزانی کە ئێمە تەقەمەنی بە سواری ئەسپ و هێستر بار دەکەین و مانگێك رێگا دەکەین لەناوخۆی ئەفغانستاندا بێ ئەوەی کەس بەرمان بگرێ و دەست بێنێتە رێگەمان، وە کەس ناتوانێ دژایەتیمان بکات، جا مامۆستای بەڕێزمان شێخ ئەلبانی کاتێك کە بەم شێوەیە لە حاڵ و ئەحواڵی ناوخۆی جیهاد ئاگادار بوو، ئەوەتا مانگێك لەمەوپێش فتوایەکی تر ئەدات کە کاسێتەکەی لەم زوانە پێمان گەیشتووە و لەلامە، سەبارەت بە مەسەلەی حوکمی

---

[١] مەبەستی شێخ عبدالله عزام خوا لێی خۆش بێت لێرەدا ئەوەیە کە دەیەوێ زیاتر ئەوە رۆشن بکاتەوە کە زانایان هەرکاتێك حاڵی جیهادیان زانی ئەو کاتە فتوای جیهادیان لێ وەردەگیرێت، چونکە ئەگەر حاڵی جیهادەکەیان نەزانی ئەوە لە فتوادانیش لەسەری تووشی هەڵە دەبن.

**جیهاد لە ئەفغانستاندا کە دەفەرموێت: "ئێستا بەراستی جیهاد لە ئەفغانستاندا فەرزی عەینە، یەکێك لەو گەنجانەی کە لەلای دەبێت پرسیاری لیٚ دەکات و دەڵێت: ئایا جیهاد فەرزە ئەگەر لەگەڵ خەڵکی بیدعەچیشدا بێت؟ مامۆستا لە وەڵامیدا دەڵێت: کەواتە ئێوە دەتانەویٚ فەرزیەتی جیهاد تەرك بکەن و وازی لیٚ بهێنن؟ ئایا چ وڵات و کۆمەڵێك هەیە بەبیٚ بیدعە.**

[واتە چ جێگەیەك هەیە لەم رۆژگارەدا تووشی بیدعە نەبوبیٚ؟!!] **دووبارە پرسیاری لیٚ دەکات ئەی ئیزنی دایك و باوك چۆنە؟ لە وەڵامدا فەرمووی: لە فەرزە عەینەکاندا ئیزن بۆ دایك و باوك نییە، وە ئەو کاسێتەی ئێستا لای خۆم هەیە، لە پاشان پرسیاری لیٚ کرد لەبارەی دەست بەرزکردنەوە و پەنجە جوڵاندنەوە و غەیری ئەمانەش، ئەویش فەرمووی: ئەم پەنجە جوڵاندنەوەیە و بەرزکردنەوەی دەستە بە هیچ شێوەیەك بۆتان جائیز نییە ئەگەر ئیمامەکەتان نەیکرد، وە ئەگەر ئیمامەکەتان دانیشتنی (استراحة)ی نەکرد، ئەوا بۆ ئێوەش جائیز نییە دانیشتنی (استراحة).**[1]

**بەم شێوە کە شێخ ئەلبانی فتوای داوە بە دڵنیاییەوە فتوای بەسەردا داوە لەسەر فتواکەی شێخ الاسلام ئیبن تەیمیە لە ریسالەکەیدا بەناوی (اختلاف الأمة في العبادة) کە دەفەرموێت: وازهێنان یان تەرك کردنی سوننەتەکانی لەبەر مەبەستێکی چاکتر و راجح تر گەورەتر و باشتریشە.**[2] **لەبەرئەوەی خۆشویستن و راگرتنی دڵەکان فەرزن، بەڵام ئەوانەی باسمان کردن سوننەتن، دەی فەرزیش لە پێشترە بەسەر سوننەتەکاندا، پاشان ئیبن تەیمیە دەفەرموێت: ئایا نابینن**

---

[1] دانیشتنی (استراحە) ئەو دانیشتنەیە کە لەبەرزبوونەوەت بۆ رکاتی دووەم وە یان بۆ رکاتی چوارەم دانیشیت، واتە لە سوجدە بەرز دەبیتەوە بەر لە هەستانەوەی تەواوت کەمێك دادەنیشێت، پاشان بە یەکجاری هەڵدەستی، ئەمەش سوننەتێکی پێغەمبەری خوایە و فەرموودەی سەحیحی لەسەر هاتووە. بروانە کتێبی (سبل السلام) بەرگی ١ لاپەرە ١٨٣ بە درێژیی لەسەری دەدویٚ.

[2] واتە ئەگەر هاتوو سونەتێك لەگەڵ فەرزێك لەیەك کاتدا هاتنە پێش ئەوە باشتر وایە واز لە سوننەتەکە بهێنیٚ بۆ فەرزەکە.

**پێغەمبەری خوا ﷺ مەنعی کرد رووخاندنی کەعبە و دروستکردنەوەی لەسەر بناغەی ئیبراهیم (علیە السلام) لەبەر دڵ و دەروونی خەڵکانی تازە موسڵمان بوان (مؤلفة القلوب) وە فەرمووی: (یا عائشة لولا أن قومك حدیث عهد بالجاهلیة لهدمت الكعبة وأعدتها على أسس إبراهیم ولجعلت لها بابین بابا یدخل الناس منه وبابا یخرج الناس منه). رواه البخاري. واتە: ئەی عائیشە ئەگەر گەل و هۆزەکەت کات و سەردەمیان تازەو نزیك نەبوایە لە نەفامیەوە، ئەوە کەعبەم دەڕووخاند و دروستم دەکردەوە لەسەر بناغەی ئیبراهیم (علیە السلام) وە دوو دەرگام بۆ دروست ئەکرد، دەرگایەك خەڵکی لێوە بجوایەتە ژوورەوە و دەرگایەك خەڵکی لێوە بهاتایەتە دەرەوە، ئەم فەرموودەیە کە ئیمام بوخاری دەیگێڕێتەوە و سەرباسێکی بۆ داناوە بەناوی (ترك الإمام للمفضل المختار خوفا من نفرة قلوب الناس) کەواتە شێخ ئەلبانیش خوای گەورە بیپارێزێ بۆی هەیە فتوای لەسەر بدات و پاشان بە پشت بەستن بە دەلیلێکی راست کە لە فەرموودەیەکی درێژدا پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: "إنما جعل الإمام لیؤتم به فإذا كبر فكبروا، فإذا ركع فاركعوا، فإذا قال: سمع الله لمن حمده فقولوا: ربنا ولك الحمد، فإذا سجد فاسجدوا فإذا ـ أخیرا ـ صلى قاعدا فصلوا قعودا اجمعین" (رواه البخاري ومسلم). واتە: ئیمام بۆ ئەوە دانراوە کە شوێنی بکەون ئەگەر وتی: الله اکبر ئێوەش بڵێن الله اکبر، ئەگەر رکوعی برد رکوع ببەن، ئەگەرو تی: سمع الله لمن حمده ئێوەش بڵێن: ربنا ولك الحمد. ئەگەر کڕنووشی برد کڕنووش بەرن، ئەگەر نوێژی بە دانیشتنەوە کرد ئێوەش نوێژ بە دانیشتنەوە بکەن هەمووتان.** [واتە ئەگەر هاتو ئیمام عوزرێکی هەبوو بەهۆیەوە دانیشت ئێوەش دانیشن با عوزریشتان نەبێ]. **شێخ ئەلبانی لەبارەی ئەم فەرموودەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ رووکنێکی لەبەر شوێنکەوتنی ئیمام بەتاڵ کردەوە، وەستان لە نوێژدا روکنە بە کۆی زانایان.**[1]

---

[1] رکن: بریتییە لەوەی بە ئەنجامدانی ئەبێتە مایەی بەتاڵبوونەوەی ئەو عیبادەتە.

پێغەمبەر ﷺ ئەم روکنەی بەتاڵ کردەوە (إذا صلى قعد فصلوا قعودا أجمعين)، ئەگەر نوێژی بە دانیشتنەوە کرد ئەوا ئێوەش نوێژ بە دایشتنەوە بکەن، بە شێوەی فەرمان (صلوا) کە سونەتیەت و فەرزیەتیش هەڵدەگرێت، ئەگەر فەرز بێت ئەوە دانیشتن بۆ لەش ساغان فەرز دەبێ لە پاش ئیمامێکی دانیشتوو بە عوزری نەخۆشی، ئەگەر سوننەتیش بێت ئەوە لێرەدا بەجێهێنانی سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بریتییە لە تەرك کردنی پێچەوانەی ئیمام، لە هەردوو کاتەکەدا بریتییە لە وازهێنان لە راوەستان لە نوێژدا، لەبەر شوێنکەوتنی ئیمام، وە تەماع لە پاداشتەکەیدا، کەواتە لەبەرئەوە شێخ الإسلام ئیبن تەیمیە و شێخ ئەلبانی لەم بارەوە دەگەنە یەك، وە منیش ئەم فتوایەم هێناوە و لە رێگەی (أصولی)یەوە کە ناکرێت بۆ هیچ ئینسانێك مناقشەی لەسەر بکات، ئەویش ئەوەیە ئەی برایان پێتان دەڵێم ئەگەر هاتوو یەکێك بەخەبەر هاتەوە بە دوو دەقیقە بەر لە هەڵهاتنی رۆژ، لە پێشیدا هیچ نەماوە مەگەر دوو دەقیقە نەبێت بۆ خۆرهەڵاتن ئەم دوو دەقیقە یان بۆ نوێژە فەرزەکەیە یان بۆ سوننەتەکەیە ـ واتە لە ماوەی ئەم دوو دەقیقەدا تەنها دەتوانیت یەکێکیان ئەنجام بدات ـ ئایا کامیان بەجێ بێنێ؟!! گشت موسڵمانێکی هۆشیار و هەموو زانایەك و گشت نەزانێك و گشت نەفامێك دەزانێت بەراستی فەرزەکە لەم حاڵەتەدا پێش سوننەتەکە دەخرێ، منیش دەڵێم بە برایانم: ئەگەر هەڵبڕینی دەستەکان و جوڵاندنی پەنجە و دانانی هەردوو دەست لەسەر سینە سەری دەکێشا بۆ وازهێنان لەو جیهادە فەرزە و پیرۆزەی کە تۆ لە پێناویدا هاتووی، سەری دەکێشا بۆ توورە بوون و بێ تاقەت بوونی دەروونی ئەفغانییەکان لە تۆ، چونکە ئەوان وا هەست ئەکەن و گومان بەجۆرێ دەبەن کە تۆ هاتوویت بە دینێکی تازەوە، ئایا واز لێهێنانی باشتر نییە لەبەر خاتری ئەنجامدانی فەرزەکە کە جیهادەکەیە؟! چونکە ئەوان لە تەمەنیاندا نەیاندیوە کە کەسێك بەو جۆرە پەنجە بجوڵێنێ! یان کەسێك دەستی لەسەر سینەی دابنێ، لە ژیانیاندا نەیان دیوە کەسێك دابنیشێ لە دانیشتنی (استراحه)دا ئەوان وا هەست دەکەن و وا گومان

**دەبەن کە تۆ بە دینێکی تازەوە هاتوویت، بەو جۆرە حاڵی بوونەوەی بەرامبەر بە تۆ یەکسەر کینە لە دڵی دروست دەبێ، وە ناتوانیت بەردەوام جیهادیان لەگەڵدا بکەیت، کەواتە ئەگەر ئەم جیهادە فەرزی عەین بێت یاخود کیفایە ئەوە وازت لە فەرزێك هێناوە لەبەر خاتری سوننەتێك لەناو نوێژدا.**

[ئەی برای بەڕێزم جوڵاندنی پەنجە لە نوێژدا لەوە زیاتر نییە کە سوننەتێکە، واتە دەرەجەی سوننەتە و نابێتە فەرز، بەڵام جیهادەکە فەرزی عەینە، جا با ئەوەش بزانرێ ئێمە ناڵێین ئەو سوننەتە بچکۆلەیە و ئەنجامی نەدەیت، نەخێر، هەموو کردارێکی پێغەمبەری خوا ﷺ گەورەیە و دەبێ ئەنجام بدرێت، برایانم هەر ئەوەندە با بە شێوەیەك ئەنجام نەدرێت بێتە مایەی تەرك کردنی فەرزێك، قەیدی چییە با تۆ لە نوێژی نیوەڕۆ پەنجە نەجوڵێنی، لە شەونوێژێکدا بیجوڵێنە، ئەو کاتە نە کەس ئەتبینێ و نە ئەبێتە هۆی رق و کینە].

**ئەی برایان: جیهاد فەرزی عەینە باوك ئیزنی بۆ نییە، چونکە باوکی تۆ ئەوەی بەرهەڵستیت دەکات لێی خۆی تەرك کەر و ئەنجام نەدەرە بۆ فەرزێك بە نەفسی خۆی فەرزە، ئەو باوکەت کە ئیزنی لێ دەخوازیت دەبێت لە جیهاددا لە پێشتەوە بێت، ئایا بە چ حاڵێك تۆ داوای ئیزن دەکەیت لە نوێژنەکەرێك تاوەکو ئیزنی نوێژی بەیانیت بداتێ؟ ئەگەر حاڵی وابوو شەوان دوا دەکەوت لە سەعاتی سێ یان چواری شەودا دەخەوت و بە مەرجی بگرێت لەسەر تۆ کە هەڵنەسیت بۆ نوێژی بەیانی، لەبەرئەوەی کە تۆ بە دەستنوێژەکەت نارەحەتی دەکەیت، ئایا هیچ یەکێك لە زانایانی ئیسلام دەفەرموێت: فەرزە گوێڕایەڵی ئەو باوکەت بەو شێوەیە، وازهێنان لە نوێژ تاوەکو سەرپێچی دایك و باوکت نەکەیت؟! نەخێر،** [بەراستی هیچ یەکێك لە زانایان نافەرموون وازبهێنە لە نوێژی بەیانی با باوکت لە خەو هەڵنەستێت و بە دەست نوێژەکەت نارەحەت نەبێت]. **دەی ئەی برام با چاك بزانیت ئێستا جیهاد کردن بە تەواوەتی وەك نوێژ وایە هیچ جیاوازییەکیان نییە، بەڵکو ئێستا جیهاد لەپێشترە لە رۆژووی فەرز، لە پێشترە لە زەکات، لە پێشتر لە حەج و سەردانی ماڵی خوا** [چونکە

ئەگەر جیهاد نەبێ ئەوە نە زەکات زەکاتە و نە نوێژت نوێژە و نە ڕۆژووت ڕۆژووە و نە دەشهێڵن سەردانی ماڵی خوا بکەیت، ئەوەتا ئەوە چوار پێنج ساڵە موسڵمانانی عێراق نەڕۆیشتوون بۆ سەردانی ماڵی خوا، ئەمە هۆکەی چییە؟ هۆکەی بریتییە لە لەبیرچوونەوەی جیهاد لە دڵ و مێشك و یادی موسڵماناندا، ئەوەش بەرهەمی ئەو پیلانەیە کە بێ باوەڕان چەندەها ساڵە نەخشەیان بۆ کێشاوە و چاوەڕوانی بەروبوومی دەکەن، ئەوە هاتە دی کە ئەویش: لەبیربردنەوەی جیهادە لە مێشکی ئیمانداراندا، کەواتە کە تۆ جەنابت خەڵك لە جیهاد سارد دەکەیتەوە ئەوە هەوڵ لە پێناوی جێبەجێ کردنی پیلانە گڵاوەکانی ماسۆنیەت و جولەکەدایە، ئاواتە گڵاو ژەهراویەکانیان بەجێ دێنێ، کەواتە پیاوی چاك بە خەڵك لە جیهاد سارد مەکەرەوە کە خۆت مەردی ئەو مەیدانە نیت، تا ئێستاش ئەو کارانەت کردووە لە ئێستاوە وەرە پەشیمان بەرەوە و ڕوو لە خوا بکە و بڵێ: خوایە گیان من بە هەڵەدا ڕۆیشتم و تاوانبارم، پاشان چەکی جیهاد بکەرە شانت و بەرەو مەیدانی گینابازان بەرێ کەوە هەتاوەکو إن شاء الله بە ڕووی سپییەوە بگەینە خوای گەورە جل جلالە].

## ئەم جیهادە

ئەگەر ئافرەتێکی موسڵمان لە دوورترین شوێنی ڕۆژهەڵاتەوە دەستی بەسەردا گیرا، ئەوە فەرزە لەسەر موسڵمانانی ئەندەلوس کە ڕاپەڕن و بجوڵێن بۆ ئازادکردن و ڕزگارکردنی ئەو ئافرەتە! ئەی حاڵ چۆنە برای خۆم کە نامووسی ئافرەتانی موسڵمان بەیانیان و ئێواران دەتکێنرێن!! مەگەر ئێمە گومانمان وابێ کە نامووسی ئافرەتە حیجازییەکان و ئەردەنییەکان یان فەلەسەتینی یان شامییەکان بەڕێزو گەورەترە لە نامووسی ئافرەتە ئەفغانییەکان، مەگەر ئێمە گومان وابەرین کە خوێنی عەرەب پاکترە لە خوێنی ئەفغانییەکان، مەگەر گومان وا بەرین کە ئەم زەویە بۆ ئەوە ناشێت بەرگری لێ بکەین [جا کێیە ئەم گومانە ئەبات؟ مەگەر کەسێك بە هیچ شێوەیەك لە سروشتی ئەم دینە تێنەگەیەشتبێ].

بەڕاستی ئەمە زەوییەکی ئیسلامییە، خەڵکەکەی موسڵمانن، پێمان خۆش بێت یان نا، یەکێکە لە ولاتەکانی ئیسلام کە بەیداخی (لا إله الا الله) بەسەریەوە شەکاوەتەوە، بێجگە لەمانە خاکێکە کە جیهادی تێدا دەست پێکراوە، ئالاکەی روونە، هەموو لایەنەکانی دیاری کراوو مەبەستی ئاشکرایە، چونکە لە دەستووریاندا نووسراوە مەبەست لەم جیهادە دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامییە لە ئەفغانستاندا، وە پاککردنەوەیەتی لە فەساد، وە لە ماددەی دووەمی دەستووریاندا هاتووە کە دەستوورەکەمان لەم ئایەتەوە سەرچاوە دەگرێت ﴿ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ ﴾ (یوسف: ٤).

بەڕاستی ئەم جیهادە تاکە جیهادێکە لەسەر زەویدا، ئەو جیهادەی کە ئێستا گشت ولاتانی بێ باوەڕی هێناوەتە هەژین، بێ باوەڕان دەترسێن لە سەرکەوتنی، نەوەك جارێکی تر ئیسلام هەڵسێتەوە، هەر لەبەر ئەوەشە (نیکسۆن)ی تاغوت نەیتوانی کە ڕق و کینەی بەرامبەر ئەم جیهادە بشارێتەوە، یان دەربارەی ئەم دینە، بۆیە وتی: مافە بەسەر ئەمریکاوە کە ڕق و کینەکانی یان جیاوازییەکانی لەگەڵ رووسیادا لەبیر بباتەوەو ڕێك بکەوێ بەرپەرچدانەوەی ئەم هێرشە زۆرە ئیسلامیە کە دروست بووە، ئەو هێرشەی کە دەستی پێکردووە و یەکەمجار و سەرەتاکەی لە ئەفغانستاندا دەجوڵێت.

ئەمڕۆ هەموو جیهان لەسەر دژایەتی ئەم جیهادە یەك کەوتووە بۆ ناوزڕاندن و ناشیرینکردنیان، لەسەر تەلەفزیۆنی ئەمریکی دەریان دەخەن وەك کۆمەڵێك دز و ڕێگر، حەشیش خۆر، پاش ئەمانە هێرش دەکەنە سەر سەربازگەی رووس یان شیوعییەکان، ئەمانە هەموو لەسەر تەلەفزیۆنی بەریتانی پیشان دەدرێت، یان لەسەر تەلەفزیۆنی ئەمریکی ئێوارەو بەیانی ساروخی (ستنگر) و یارمەتییە ئەمریکییەکان نیشان ئەدات هەتا وای پیشان بدات کە ئەم جیهادە بریتییە لە گەمەیەکی ئەمریکی و کەی ویستی رای ئەگرێت، یان وا پیشان بدات کە منداڵێکی

ڕێنمونی کراوە بەدەست ئەمریکییەکانەوە، بەم شێوازە زۆر لە بێ ئاگایانی عەرەب ـ کە زۆربەیان بێ ئاگان لە حەقیقەتی ئەم جیهادە ـ کەوتوونەتە گومانەوە کە ئەم جیهادە یارییەکی ئەمریکییە، یارییەکی (C.I.A)ە، هەروەك (C.I.A) لە خوای گەورە بەتواناتر بێت، پاکی بۆ خوا لەو گومان و قسانە، ئەمان ئەمە حاڵیانە، ئەگەرچی بەدەم ئەمەوە ئەناڵێنن.

بەڕاستی ئەم جیهادە، جیهاد لە نێوان ئەفغان و ئەفغاندا، کەواتە لەبەرئەوەیە کە مەبەستەکە زۆر ئاشکراو و ڕوونە، ئایا بۆچی نەجیب لەگەڵ جەلالەدین، لەگەڵ سەییاف، لەگەڵ ئەحمەد شا مەسعود، شەڕ دەکات و بۆچی خوێن دەڕێژن و لەبەرچی؟ لەکاتێکدا کە ئەم ئەفغانییە و ئەویش ئەفغانییە و زمانەکەی ئەم (پشتوو)یە و زمانی ئەویش (پشتوو)ییە، ئایا ئەم شەڕە لەسەر دەسەڵاتە؟ لەسەر پارەیە؟ نەخێر لەسەر ئەم قسە لاوەکییانە نییە، بەڵکو ئەمانە ئەو کۆمەڵەن کە لە ڕۆژانی (داودی ئەفغانی)ەوە جیهادیان دەست پێکردووە، ئەم جیهادە بەردەوام بوو تا ڕۆژانی (تراقی ئەفغانی)، پاشان (حفیظ الله ئەفغانی)، پاشان سەردەمی (بابرك کارملی ئەفغانی).... کەواتە شەڕ بە تەنیا لەسەر دەرکردنی دوژمنێکی دەرەکی نییە کە هاتووەتە وڵاتەوە، بەڵکو ئەم شەڕە لەسەر عەقیدەیە و بۆ پاڵ پێوە نانی بیروباوەڕی شیوعیەتە کە شیوعییەکان بە زۆری ئاسن دەیانەوێت بیسەپێنن بەسەر خەڵکدا، بەڵام موجاهیدان ئەوەیان پێ قبوڵ نییە هەرچەندە قوربانی پێشکەش بکەن، چەندی تێ بچێت، قبوڵیان نییە عیزەت و سەربەرزی بێجگە بۆ خوا بۆ کەسێکی تر بێت، چ عیزەتێك لەوە گەورەترە کە (نەجیب) نامە دەنێرێ بۆ (جەلالەدین حەققانی) لە کاتی شەڕدا، کە ئێستا ئەو نامەیەم لە گیرفاندایە، پێی ئەڵێ: ڕێگای نێوان شارەکانم بۆ بکەرەوە ـ ئەمینی بکە ـ چیت ئەوێ ئەتدەمێ، هەموو ئەسیرەکانی (بەکتیا) ئازاد دەکەم، پاشان عەفوم کردووی لە حوکمی ئیعدام، پاشان من موسڵمانم، من و سولەیمان لائیق کە وەزیری (سنوور)ە، بەڵام ناتوانین هیچ بکەین لە نێوان ئەم شیوعییانەدا، من ئامادەم سەد بارمەتەت بدەمێ تا دڵنیا

بی ئەگەر لەگەڵم دانیشی، شێخ جەلالەدیش حەققانیش وەڵامی داوەتەوە بە نامەیەکی درێژ دەڵێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٣ ﴾ (الصف: ٢ - ٣)[1] واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە، ئەوە بۆچی بە زمان قسەیەك ئەکەن کە بە کردەوە نایکەن، گەورەترین ڕق و تووڕە بوون لای خوای گەورە ئەمەیە کە بە زمان قسەیەك بکەن و بە کردەوە جێبەجێی نەکەن. پاشان پێی وت لەگەڵت دادەنیشم بە دوو مەرج: بێ باوەڕی خۆت بە شیوعیەت ڕاگەیەنی و هێرش بکەیتە سەر رووسیا... پێش ئەمانە دانیشتن نییە، چونکە من ڕانەهاتووم لەسەر سفرەی زەلیلی دانیشم.

جەلالەدینی حەققانی چییە؟ مامۆستای قوتابخانەیەکی ئایینی بچکۆلە بوو لە ئەفغانستاندا، جیهاد بەم شێوەیە بەرزی کردەوە و عیزەتی دایە کە سەرۆك دەوڵەتان نامەی بۆ دەنێرن، [بەڵێ بە ڕاستی ئەم جیهادە مایەی سەربەرزی و شکۆمەندی هەموو موسڵمانێکە، ئەو موجاهیدانە زۆر بەڕێزن لای خوای گەورە لە کاتێکدا کە بە سکی خاڵی و قاچی پەتی و گیرفانی خاڵییەوە بەرامبەر ئەو هەموو تاغوت و ستەمکارانە وەستاوون].

بەڕاستی عوزر هێنانەوە بۆ موسڵمانان بە هیچ شێوەیەك نەماوە، لە رۆژێك فوقەهای ئیسلام فتوایان دەدا لەسەر ئەوەی جیهاد فەرز دەبێت لەسەر نزیکتر... نزیکتر، رۆژێك بوو کە هۆکارەکانی هاتوچۆ و سەفەرکردن بە گوێدرێژ بوو، بە ئەسپ و هێستر و حوشتر و ماین بوو، بەڵام ئەمڕۆ ئەگەرچی رێگەکانیش درێژ و دوور بن، بەڵام تۆ دەتوانیت لە دووترین شوێنی ئەم زەوییەدا بێیت بۆ زەوی جیهاد، رۆژێك کە فوقەهای ئیسلام فتوایان دەدا کە جیهاد فەرزی عەینە و پاشان بڵاودەبێتەوە،

---

[1] ئین کەسیر لە تەفسیرەکەیدا دەربارەی ئەم ئایەتانە دەوفەرموێت: ئەم ئایەتانە لە کاتێکدا دابەزی کە یارەکانی پێغەمبەر ﷺ ئاواتیان خواست کە جیهاد لەسەریان فەرز بێت، بەڵام کاتێ خوای گەورە فەرزی کرد، کۆمەڵێکیان کەمتەرخەمییان تێدا کرد.

**ڕۆژێك كە شەڕ لە دوو ڕۆژ و سێ ڕۆژدا تەواو دەبوو، ئەگەر زانیمان شەڕی قادسیە گەورەترین شەڕ بووە لە مێژوودا، سێ ڕۆژی خایاندووە، بەڵام ئێستا شەڕ دە ساڵە بەردەوامە، چ بەهانەیەك بۆ موسڵمانان هەیە لە زەویدا،** [چ عوزرێك هەیە بۆ موسڵمانان لە زەویدا؟ چۆن خۆتان ئەدزنەوە لێی، بۆچی خۆتان لە گوفتار و فتوای زانایانی پێشین گێل و بێ ئاگا دەكەنەوە:

ئا ئەمەی وا تۆش براكەم بە سەبری مەككەی تێ دەگەی

دڵنیابە خۆكوشتنە چونكە تۆ (ذل) ئەكەی پینە

سبەی یان دووی كاتێ سەربازانی كوفر هێرش دێنن

دەبینی میحرابی رووخا و وەك قورئان بە خوێن ڕەنگینە

قورئانی پیرۆز و میحراب چۆن وایان بەسەر نایە

كە پاسەوانی هەردووكیان شاڵ و شمشێری دارینە].

**ئەی برای خۆم وەرە لەگەڵمدا بۆ ئەوەی بە چاوی خۆت ببینیت كە چۆن تەیارەكان لە لادێ بچكۆلەكاندا دێنە خوارەوە و دەنیشنەوە، ئەو لادێیە كە موجاهیدان لە دوورەوە چواردەوریان گرتووە... دێنە خاورەوە لە لادێكان بۆ ئەوەی چەندین ئیشی نابەجێ بكەن، بەڵێ تەیارەكە لەناكاوێكداو لە كاتی بێ ئاگاییدا دەنیشێتەوە و چاكترین و جوانترین كچان و ژنانی لادێكە هەڵدەبژێرن، پاشان بەرزی دەكەنەوە بەسەر لادێكەوە و كراسەكانیان لەبەر دادەڕنن و دای دەكەنن، ناموسیان هەتك دەكەن، پاشان بە ڕووتی هەڵیان دەدەن بەسەر باوك و براكانیاندا، ئایا ناموسی ئێمە پیرۆزترە لە ناموسی ئەمانە؟ خوێنی ئێمە لە خوێنی ئەمانە گەورەترە؟ ئەوە چ دینێكە بە تۆ دەڵێن كاتی جیهاد نەهاتووە لە كاتێكدا كە تۆ ئەم هەموو گوناحو خراپەكارییە دەبینیت، تۆ ئەم هەموو جەریمەیە دەرهەق بە ماف موسڵمانان دەبینیت كە پێشێل دەكرێت، ئەمە چ دینێكە كە بۆ تۆی ڕەوا داوە كە بمێنیتەوە بە دانیشتوویی و ئەوانیش سەردەبڕێن و ناموسیان هەتك دەكرێت؟ لە چ دینێكدا ئەمەتان خوێندووە؟ لە كوێدا ئەم دەقەتان دۆزیوەتەوە؟**

**ئایا موسڵمانان هەتا ئێستاش شەرم ناکەن، ئایا شەرم نایانگرێت لە دوای تێپەڕبوونی دە ساڵ بەسەر ئەم قەسابخانەیەدا کە لە هەر چوار لاوە خوێن وەکو لافاو دەڕوات، لە هەموو چوار دەقیقەیەکدا یەکێك شەهید دەبێت لە ئەفغانستاندا، هەموو دەقیقەیەك یەکێك لە وڵات و زەوی خۆی کۆچ دەکات بۆ شاخ و دۆڵەکان، بەڵام هێشتا موسڵمانان بە هەندێ زانیاری وشك و مێشێکێکی ساردەوە موناقەشەی ئەوە دەکەن ئایا جیهاد فەرزی عەینە یان کیفایەیە؟ ئای خۆزگە بمزانییایە ئەمانە چۆن لەو دەقانە تێدەگەن؟ ئای خۆزگە بمزانیایە چۆن بەسەر سورتی (التوبة)دا تێپەڕدەبن و ڕووبەڕووی دەبنەوە؟ سبەینێ چۆن بەرامبەر خوای پەروەردگار ڕادەوەستن؟** [بە چ بیانوویەك دەڵێن جیهادمان نەکردووە؟ بەڕاستی هەمووی بیانووی ترسنۆکی و تەمبەڵی و تەوەزەلییە، بەڵام ناچارن بەوە دەری ببڕن کە گوایە کاتی جیهاد نەهاتووە].

**ئەی براینە: ئایا پێغەمبەری ئیسلام ﷺ سوپای (موئتە)[1]ی نەنارد کە سێ هەزار نەفەر بوون بۆ تەمێ کردنی (حارث الغسانی) ئەو پیاوەی کە نێرراوەکەی پێغەمبەری ﷺ شەهید کرد، یەك موسڵمانی کوشت، پێغەمبەری خوا ﷺ سوپایەکی نارد بۆ تۆڵەسەندن، بۆ تۆڵەسەندنی خوێنی ئەو موسڵمانە.** [بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم سوپایەی نارد بۆ تۆڵەسەندنی خوێنی موسڵمان، سوپای سێ هەزار جەنگاوەری نارد بۆ بەرامبەرکێی دوو سەد هەزار نەفەر، ئەوەبوو لە سەرەتای کۆکردنەوەی سوپاکەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئاڵایەکی سپی بەست و دای بە دەستی زەیدەوە فەرمووی: ئەگەر زەید تووشی شتێ هات ئەوە جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب سەرۆك و ئاڵابەدەست بێت، ئەگەر جەعفەریش تووشی شتێك هات ئەوە ئەوە عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە با سەرۆك بێت، ئەگەر ئەویش تووشی شتێك هات، موسڵمانەکان با خۆیان فەرماندەیەك هەڵبژێرن، ئەوەبوو کە شەڕ لە نێوان سێ هەزار جەنگاوەری ئیسلام و دوو سەد

---

[1] موئتە دێیەکە لە وڵاتی شام دوو قۆناغ لە قودسەوە دوورە کەوتووەتە خوارووی خۆرهەڵاتی دەریای مردوو.

هەزار جەنگاوەری کافردا دەستی پێ کرد، یەکسەر زەیدی کوڕی حاریسە ئاڵاکەی پێغەمبەری خوای ﷺ هەڵگرت و خۆی کوتا بۆ ناوجەرگەی دوژمن، زەید جەنگێکی فیداکارانەی کرد تاوەکو شەهید بوو، ئینجا جەعفەری کوڕی ئەبی تالیب ئاڵاکەی هەڵگرت و پەلاماری داو کەوتە سروود خوێندنەوە و وتی: ئای چەند خۆشە بەهەشت و نزیکبوونەوە لە بەهەشت، جەعفەر کەوتە ڕم بازی و هەتا دەوریان گرت و ئەسپەکەیان کوشت و ئەویش دابەزی بە شمشێر پەلاماری دەدان، ئەوەبوو ئاڵاکەی بە دەستی ڕاست گرتبوو دایان لە دەستی ڕاستی و قرتاندیان، پاشان بە دەستی چەپی ئاڵاکەی گرت کە دەستی چەپیشیان قرتاند بە قۆڵەکانی گرتی هەتاوەکو لەوێدا شەهیدیان کرد، پاشان عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە ئاڵاکەی هەڵبڕی و بەرەو مەیدانی شەڕ کەوتەڕێ، لەو کاتەدا ئامۆزایەکی پارچە گۆشتێکی بۆ هێناو وتی: تۆ ئەمڕۆ زۆر ماندوو بوویت و هیچت پێ نەخوراوە ئەم نەختە گۆشتە بخەرە بەردڵت، گۆشتەکەی وەرگرت و پاروویەکی لێ داگرت و گوێی لە گرمەو هەرای دوژمن بوو لەبەردەمیەوە، ئەویش گۆشتەکەی فڕێدا و پەلاماری دا هەتاکو شەهید کرا. ئەی برایند ئەوەی لێرەدا مەبەستە ئەوەیە کە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ ویستی تەمێی ستەمکاران دادات، ویستی بۆ کافرانی بسەلمێنێ کە ئیسلام خاوەن شەرەف و شکۆمەندییە، ئەی بە دایك و بابم بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆزگە موسڵمانانی سەدەی بیستەمیش وەك تۆ بیریان بکردایەتەوە، بەڵام داخەکەم ئەمڕۆ شمشێری دارین بووە بە پارێزەری ئیسلام، دەی سوێند بە تاکی خوا جل جلالە هەتاکو لە دەروونی موسڵماناندا جیهاد ڕیشە دانەکوتێ موسڵمان هەر زەلیل دەبێت، ئای ئیمام عومەر و شمشێرەکەی لە کوێ بێنم؟.

ئای خۆزگە جەنگاوەرەکانی بەدر چۆن دروست ببنەوە؟ ئای تەڵحە لە کوێ بێنم کە لە شەڕی ئوحوددا لەکاتێکدا کە بێ باوەڕەکان دەوری پێغەمبەریان ﷺ گرتبوو ئەویش دەیفەرموو ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سەرت بەرز مەکەرەوە با تیرێك لێت نەدات، سکم بە قوربانی سکت بێت، بە جۆرێك ئەو تیرانەی کە دەهاتن بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەم خۆی کردبووە قەڵغان تا بە پێغەمبەر ﷺ نەکەون].

**ئەی براینە:**

**ئایا خەلیفەی ئیسلام لە شاری بەغدادەوە سوپایەکی ڕێك نەخست کە ژمارەکەی حەفتا هەزار سەرباز بوو؟ بۆ ڕزگارکردنی ناموسی ئافرەتێکی ئیماندار لە دووری هەزاران میل لەناو وڵاتی تورکەکاندا لە عەموریە؟! ئایا معتصم ڕانەپەڕی بۆ ڕزگارکردنی ئافرەتێك؟ کە ئەمە حوکمێکی شەرعییە، وای تێنەگەی کە سوننەتێکە، حوکمێکی شەرعییە ئەگەر ئافرەتێك لەلایەن بێ باوەڕانەوە بە دیل گیرا جیهاد دەبێتە فەرزی عەین لەسەر ئوممەتی ئیسلامی تا ڕزگارکردنی،** [ئەگەر بە تەنها بۆ ڕزگارکردنی ئیماندارێك ئەمە حوکمی شەرعیەکەی بێت ئەی چی دەڵێیت لە خوێنی هەزاران ئافرەتی داوێن پاك؟!! هەزاران ئافرەت کە هاوار دەکەن ئەی برا موسڵمانەکان بۆ نایەن ڕزگارمان بکەن، نازانم لە ڕۆژی قیامەتدا چی وەڵامی پەروەردگار بدەینەوە؟ بە هەزاران کۆرپەی زۆڵ کەوتنە ناو کۆمەڵگەی ئیسلامیەوە، تازە ئەویش دەڵێت کاتی چەك هەڵگرتن نەهاتووە، بەڕاستی ئەمە نەك قسەیەکی موسڵمانانە نییە، بەڵکو قسەیەکی پیاوانەش نییە، چونکە هەر کەسێك غیرەتی پیاوەتی تێدا بێت ڕێ بەرنادات بۆ کافران کە زینا لەگەڵ خوشکە موسڵمانەکاندا بکەن و کۆرپەی زۆڵ بخەنە کۆمەڵگەی ئیسلامیەوە].

**ئەی براینە:**

**ئایا یارەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی ماڵی خوایان نەکرد لە (حجة الوداع) کە نزیکەی سەدو چواردە هەزار سەحابی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (لەسەر کەمترین ریوایەت)!! کوان ئەم کۆمەڵە... کوانە ئەمانە؟ چیان لێ هات؟ (ئایا لەسەر جێگە مردن؟!!) ئایا ئەوانە لە گۆڕستانی (البقیع) دا چەندیان نێژران؟ سوێند بە خوا با چاك بزانیت لەو سەدو چواردە هەزارە ئەوانەیان لە گۆڕستانی (البقیع)دا لە چاڵ نران و ئەسپەردە کران لە سێ هەزار کەس کەمترن، ئەی برای خۆم لە کوێن ئەوانی تریان؟ بەڵێ ئەوانە ئێستا لاشەکانیان لە ناو ئەم زەویەدان، گۆڕەکانیان وان لە تورکیا، وان لە ئەرمینیا، وان لە ئازەربایجان، ئەم هەموو شارانە لە ڕۆژی جێنشینی پێغەمبەر ﷺ، عوسمانی کوڕی عەففان فەتح کراو کەوتنە ژێر پەرچەمی (لا اله الا**

**الله)، ئەوە وڵاتی ئەرمینیا کە ئەوەتا لە یەکێتی سۆڤیەت و ئێستا زۆربەی ویلایەتە ئیسلامییەکان زەلیل و داماون، سەر دادەنەوێنن بۆ یەکێتی سۆڤیەت کە زۆربەی شار و ناوچەکانی لە زەمانی ئیمام عومەردا دەستی بەسەردا گیرا و فەتح کرا، بەهەمان شێوە لە کاتی عوسمانی کوڕی عەففاندا (خوای لێ رازی بێت) ئەو شوێنەی ئێستا موسڵمانان داماون تێیدا و رۆژێك بوو ئیمام عومەر ئاڵای گەشاوەی (لا الە الا الله)ی لەناودا بەرزکردونەتەوە،** [بەڵێ ئەم یارە دڵسۆزانەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە جیهاد و خوێن بەخشینیان کرد هەتاکو گەیشتنە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو] **ئەی موسڵمانان چی بوو ئەوەی کە هێنانی بۆ ئەو ناوچانە؟!** [چی ڕاپەڕاندن بۆ رۆژهەڵات و رۆژئاوا؟] **ئایا بۆ سەفەر هاتن؟ ئایا گەڕانیان مەبەست بوو؟ ئایا بۆ کاروانێکی خۆشی و دڵڕفێن هاتن و ڕابوێرن لە وڵاتاندا؟!! ئایا (عەبدوڵڵای کوڕی عەمر) خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت حەوت دانە مانگ نەوەستا لە سەردەمی شاخی (رام هورمز) داو بەفر و سەرما بەرهەڵستی لێ دەکرد بۆ چوونە ناو ناوچەکەوە؟!!** [ئەو شێرە بە جەرگ و ئازایە حەوت دانە مانگ چاوەڕوانی کرد لەبەردەم تاسەی بەفردا، بۆچی چاوەڕوانی کرد؟! بۆ هێرشکردنە سەر ناوچەی کافرن و هێرش کردنە سەریان و گەیاندنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەو ناوچانە]، **ئایا عەبدوڕەحمانی کوڕی سەمرە دوو دانە ساڵی تەواو نەوەستا لەبەردەم شاری (کابل)دا، بۆ وەستا؟!! چونکە بەفر ناوچەکەی داپۆشیبوو زۆربەی ئەو زستانەو بەشێکیش لە بەهارو هاوین،** [ئایا ئەو یارە خۆشەویستەی پێغەمبەر ﷺ دوو دانە ساڵ چاوەڕوانی نەکرد؟ بەڵێ بەڕاستی ئەمانە مێژوو شایەتییان بۆ دەدات، بەڵێ ئەمانە لەگەڵ ڕەوتی رۆیشتنی مێژوودا رەوتیان کردووە بە وڵاتاندا بۆ گەیاندنی ئەم بەرنامە پاکە و جیهاد کردن لەسەری، وە با چاکیش بزانیت زۆربەی زۆریان کەمدەرامەت بوون و تەنانەت وڵاخیشیان نەبووە سواری ببن. ئەمانە هەڵسان ڕاپەڕین لە شاری مەککەوە هەتاکو گەڕان بە هەموو جنسی مرۆڤ لە زەویدا هەتاکو دینی خوایان گەیاند بە ئینسانەکان و لە بەندایەتی بەندە دەریان هێنان بۆ بەندایەتی پەروەردگار جل جلالە. چەند ئازارو ئەشکەنجەو برسێتی و هەژاری و بێ جلوبەرگی و ترس‌و مردن و بریندار

بوونیشیان هاتۆتە ڕێ، بەڵام بە هیچ شێوەیەك كۆڵی پێ نەداون لە جیهادی پیرۆز، وە هەموو ناخۆشی و دڵگرانییەكیشیان بریتی بووە لە بەدەستهێنانی پلەی شەهیدی ئەوەتا خالیدی كوڕی وەلید (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: (لقد شهدت كذا وكذا زحفا وما من جسدي موضع إلا وفيه ضربة سيف، أو طعنة رمح أو رمية سهم... ثم هذا أموت على فراشي ـ حتف أنفي ـ كما يموت البعير، فلا نامت أعين الجبناء...).][1]

## ئێستا ئیزن لێوەرگرتن نییە بۆ كەس بۆ دەرچوون بۆ جیهاد

جارێكیان یەكێ لە گەنجەكان پێی وتم: دایكم تووڕە بووە لێم بە هۆی هاتنم بۆ ئەم جیهادە، دایكم وتی: من زۆر توڕە دەبم ئەگەر تۆ نەگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوە، منیش لە وەڵامدا وتم بە گەنجەكە چەندەی دایكت تووڕە بووە لێت ئەوەندەش خوای (الرحمن) ڕازی بووە لێت، لەبەرئەوەی تۆ ڕاپەڕیوی بە هیوای ڕازی بوونی خوای گەورە، بۆ وەڵامدانەوەی بانگەوازی خوا و سەرپێچی دایكت لە گوێڕایەڵی خوای گەورەدا كردووە، ڕاپەڕیوی بۆ ڕاپەڕاندنی بەرنامەی (خالق)، بەڵام دایكت ئینسانە و دروستكراوە لێت دەڕەنجێ ئەمە هیچ قەیدی ناكات، چونكە لە فەرموودەی بوخاری و موسلیمدا هاتووە دەفەرموێت: (إنما الطاعة في المعروف) واتە: بەس تەنها گوێڕایەڵی كردن لە چاكەدایە، دووبارە وتم بە گەنجەكە: هەتا ئێستا هیچ زانایەك لە زانایانی ئیسلام نەیفەرمووە لەسەر ئەوەی كە فەرزە ئیزن وەرگرتن لە دایك و باوك بۆ فەرزە عەینەكان، بەڵكو ئیزن لێوەرگرتنی پێ ناوێت تەنانەت بۆ

---

[1] واتە: بەڕاستی من لە فلان شەڕو فلان ڕووبەڕووبوونەوەدا ئامادە بووم لە كاتی بە كۆمەڵ هێرش هێنانی دوژمندا، لەلاشەمدا شوێنێك نییە مەگەر لێدانی شمشێرێكی پێوەیە یان زامی رمێك یان بەركەوتنی وەشاندنی تیرێكی پێوەیە، بەڵام ئێستا دەمرم بەسەر جێگاكەمەوە، بەبێ شەهیدیی، دەڕۆم و مردار دەبمەوە هەروەك حوشتر، دەی یا خوا چاوی ترسنۆكەكان هەر نەخەوێت. بەڵێ ئەم موجاهیدە نارەحەتی ئەوە دەردەبڕێت كە لەو هەموو شەڕانەدا بەشداری كردووە، بەڵام شەهید نەبووە، بۆیە ئیمام عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) دەیفەرموو: بەڕاستی ئافرەتان و دایكان ناتوانا بوون كە كوڕی وەكو خالید بخەنەوە...

**ئەمیری موسڵمانانیش نییە ئەگەرچی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیش بێت، ئەوەتا ئوممەتی ئیسلامی و زانایانی ئیسلام دەفەرموون جیهاد کردن باش نییەو (مکروه)ە ئەگەر بەبێ ئیزنی ئیمام بکرێت بێجگە لە سێ کاتدا نەبێت کە جائیزە بەبێ ئیزنی ئیمامیش بکرێت:**

**١. ئەگەر ئەو ئیمامە وازی لە جیهاد هێنا و تەرکی کرد.**

**٢. ئەگەر ئیزن وەرگرتنەکە ئەو بەرژەوەندییەی کە مەبەستە فەوتاندی** [واتە هەتاکو دەگەی بە ئیمام ئیزنی لێ وەردەگریت ئەوەی مەبەستە دەفەوتێت، بۆ نموونە ئەگەر ئیمام خۆی حازر نەبێت].

**٣. ئەگەر زانیمان کە ئەو ئیمامە ئیزن نادات بۆ جیهادەکە،** [ئەوە ئیتر جائیزە تەنانەت بەبێ ئیزنی ئیمامیش بچیت بۆ جیهاد].

**بەڵێ بە هیچ شێوەیەك ئیزن وەرناگیرێت لە هیچ کەسێك بۆ جیهاد کە بوو بە فەرزی عەین، بەڵکو یارەکانی پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا کە لە شاری مەدینە لەلایەن بێ باوەڕانەوە نیازی هێرش بۆ کردنی بۆ کرا، وە شاری مەدینە کۆمەڵێك لە دەشتەکیەکانەوە نیازی تەماعی پیسی لێ کرا، حەیوانەکانی مەدینەیان هەڵگرت و فڕاندنیان، ئا لەو کاتەدا ئەو هێرشە ناڕەوایەی بۆ کرا، یارەکانی پێغەمبەر ﷺ دەرچوون بۆ بەرهەڵستی بەبێ ئیزنی پێغەمبەر ﷺ، بەڵێ یەکسەر دوو یاری پێغەمبەر ﷺ ئەبو تەڵحەو سەلەمەی کوڕی ئەکوەع، دەرچوون و گەیشتن بە دەشتەکیەکان و گەڕاندنیانەوە و لەسەر ئەم ئیشە ئەگەرچی پرسیشیان بە پێغەمبەر ﷺ نەکردبوو سەنا و سوپاسی کردن و مەدحی کردن، فەرمووی: (خیر فرساننا أبو طلحة وخیر رجالاتنا سلمة) واتە چاکترین سوارەکانمان ئەبو تەڵحەیە و چاکترین پیاوەکانیشمان سەلەمەیە. بەڵێ بەبێ ئیزنی پێغەمبەر ﷺ دەرچوون و پێغەمبەر ﷺ لۆمەی نەکردن و ناڕەحەتی نەکردن، بە چ حاڵێك لە ئەمڕۆدا ئیزن وەرگرتن هەیە؟! لە چ ئینسانێك؟! چۆن ئیزن وەردەگیرێت بۆ ئەوەی کە منداڵە ساواکان ڕزگار بکەیت لەناو ئاگردان و گڕی ئاگردا. چەند منداڵ ئاگریان تێبەربوو**

لەبەردەمتدا، بۆنی گۆشتی لاشەیان بەرزبوویەوە بۆ ئاسمان و لەگەڵ دووکەڵدا، بۆنی گۆشتی برژاو و قرچە قرچیان لە کاتی سوتانیاندا خەریکە هەموو خەڵکی ناڕەحەت دەکات، ئا لەو کاتەدا کە گریان لێ بەرزبووتەوە و دراوسێی تۆن و دەتوانی ڕزگاریان بکەی لەو ئاگر و سوتان و قرچە قرچە، دایکیشت دانیشتووە پێی دەڵێیت: ئایا ئەی دایکی خۆم ئیزنم ئەدەی کە ئەو منداڵانە ڕزگار بکەم؟! دایکیشت دەڵێت نەخێر مەڕۆ، دەترسم پارچەیەك لە کراسەکەت بسوتێت و دەترسم جلەکانت ڕەش بێتەوە، دەترسم کە خۆشت بسوتێی، کەواتە حەزناکەم بڕۆی، من لەم کاتەدا پێت دەڵێم ئایا ڕەوایە و جائیزە بۆ تۆ گوێڕایەڵی دایکت بکەی؟!! ئەگەر واش دابنێین کە لەو شوێنەدا کۆمەڵێك پیاو هەن و دەتوانن ئەو منداڵانە لەو ئاگرە ڕزگار بکەن، بەڵام کەسیان نەجوڵان و هەڵنەسان بۆ ڕزگارکردنیان، ئەوا بە کۆمەڵ هەموویان گوناهبارن، دووبارە چاك بزانە کە ئیزن وەرگرتن نییە لە نموونەی ئەو کاتەدا، چونکە فەرزی کیفایە دەبێتە فەرزی عەین، ئەگەر موسڵمانان نەیانتوانی فەرزی کیفایە ڕاپەڕێنن، ئەگەر جەنازەیەك کە فڕێ دراوە کەس خۆی پێش نەخست بۆ لای و نوێژی بەسەرەوە بکات ئەوە ئوممەتی ئیسلامی گوناهبارە، ئەگەرچی نوێژی مردوویش فەرزی کیفایەش بێت [ئیتر موسڵمانانی جیهان دووبارە و سێ بارە پێتان دەڵێمەوە کە بیکەن بە خاتری خودا گەنجەکان لەم جیهادەی سەدەی بیستەم سارد مەکەنەوە، چونکە هەرکەسێك گەنجێك لە جیهاد سارد بکاتەوە ئەوا وەك ئەوە وایە کە ڕۆژووی فەرزی ڕەمەزانی پێ شکاندبێت و هەرکەسێکیش کە ئەم ئیشە بکات ئەوە رووزەردی بەردەستی قاپی خوا دەبێت. جیهاد ئێستا پێویستی بە پیاوان هەیە زۆرتر لە ماڵ و پارە، ئەی موسڵمانە گەنجەکان دووبارە وەسیەتتان بۆ دەکەم کە ڕاپەڕن بۆ جیهاد، وەرن بۆ سەربازگەی ئیسلامی خۆتان تاقی بکەنەوە، قەسەم بە خوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرزی کردووە لەسەرمان یارمەتیدانی برایانی موجاهیدمان بە نەفس و ماڵ، وە خوای گەورە پێش پێغەمبەری خوا ﷺ فەرزی کردووە یارمەتیدانی برایانی موسڵمان ـ بە مافی برایەتی ئیسلامی ـ کە ئەمە یاسایەکە لە

**ئیسلامدا و هیچ گومانی تێدا نییە] هەموو زانایانی ئیسلام کۆبوونەتەوە لەسەر ئەوەی کە یارمەتی دانی موسڵمان بۆ موسڵمان بۆ جیهاد فەرزی عەینە وەك رۆژوو، ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (المسلم اخو المسلم لا یسلمه ـ لأعدائه ـ ولا یظلمه ولا یخذله). رواه البخاري ومسلم، واتە موسڵمان برای موسڵمانە، زەلیلو تەسلیمی دوژمنەکەی ناکات، خیانەت و زوڵمی لێ ناکات و رووزەرد و سەرشۆڕی ناکات.**

**هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (ما من مسلم یخذل أخاه في موطن ینتهك فیه من عرضه وتنتقص فیه من حرمته إلا خذله الله في موطن ینتقص فیه من عرضه وتنتهك فیه حرمته)[1]. رواه البخاري، واتە: هیچ موسڵمانێك نییە كە برا موسڵمانەکەی رووزەردو سەرشۆڕ بکات لە شوێنێکدا کە ئەو برایەی نامووسی تێیدا بتکێنرێ و حورمەتی تێدا لاواز بکرێت و بهێنرێتە خوارەوە، مەگەر خوای گەورەش ئەو موسڵمانە رووزەرد دەکات لە شوێنێکدا کە نامووسی تێدا لاواز دەکرێ و خورمەت و ئابڕووی تێدا دەتکێنرێت.** [پێغەمبەری ئیسلام ﷺ لەم فەرموودەیەدا مەبەستی لەوەیە کە هەر موسڵمانێك لەبەرچاویدا دەستدرێژی بکرێتە سەر برا موسڵمانەکەی ئەمیش گوێی پێ نەداو خۆی لێ گێل بکات ئەوە خوای گەورەش ئەو رووزەرد دەکات بەشێوەیەك کە کەسێ نەچێ بە هانایەوە، کەواتە ئەگەر ئێمە ئەمڕۆ یارمەتی برا موجاهیدەکانمان نەدەین و سەرشۆڕیان بکەین ئەوە خوای گەورەش ئێمە سەرشۆڕ دەکات و رووزەردی دنیاو قیامەتمان دەکات، بەڵێ ئەی موسڵمانی بەڕێز وانەزانن کە کافران ئەمڕۆ بەس دەستدرێژی لە سەر ناوچەیەکی ئیسلام دەکەن] **ئەمڕۆ ئەفغانستان و سبەینێ لە عەرەبستان و** [کوردستان]، **کەواتە ئەگەر دوژمنەکانی خوا دەستدرێژییان کردە سەر ئەم ناوچە ئیسلامییە و ئێمە رووزەردمان کردن و نەچووین بە هانایانەوە ئەوە با چاك بزانین خوای پەروەردگار دوای ماوەیەکی تریش دوژمنانمان زاڵ دەکات**

---

[1] صحیح جامع الصغیر، رقم ٧٥١٩.

بەسەر ئێمەشدا، ئەو کاتەش کە وامان لێهات موسڵمانان نایەن بە دەمانەوە و رووزەردمان دەکەن، هەروەك چۆن ئێمە برایانی خۆمانمان رووزەرد کرد، برایانی خۆم ئەگەر ئێمە ئەمڕۆ سەیری ئەو ناموسانە بکەین کە لە لایەن جەندرمەکانەوە دەتکێنرێت و ئەو لاشە و پلە گۆشتانەی کە شەلو پەت دەکرێت، ئەو سەروەت و ماڵەی کە دەستی بەسەردا دەگیرێت و ئەو بیروباوەڕەی کە لە ڕیشەدا دەردەهێنرێت، ئەگەر هەروا بەوشێوە سادەیە سەیری بکەین و غیرەتمان نەجوڵێت بۆ یارمەتیدانیان و رزگارکردنیان ئەوە دێت بەسەر ئێمەشدا ئەوەی کە بەسەر ئەواندا هاتووە، [کەواتە ئەی موسڵمانان با ئیتر بەس بێت، با ئیتر شەرمی خوای گەورە بمانگرێت و ڕاپەڕین بۆ مەیدانی سەربازگەی ئیسلامی بۆ خۆئامادەکردن بۆ ڕیشەکێشکردنی دوژمنانی خوا و دین و دنیا].

**ئەی براینە:**

**کەواتە ئیزن وەرگرتن نییە بۆ دایك و باوك بۆ دەرچوونتان بۆ مەیدانی جیهاد، چونکە سەرپێچی فەرمانی خوای گەورەی تێدایە و پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێت: (إنما الطاعة في المعروف، ولا طاعة لمخلوق في معصية الخالق)، واتە گوێڕایەڵی کردن بەس لە چاکەدا هەیە، گوێڕایەڵی کردن نییە بۆ دروستکراو لەسەرپێچی دروستکەردا کە (الله)یە جل جلاله.**

**ئەی برایانی خۆم با چاك بزانن موسڵمانی خێزاندار فەرزە لەسەری کە بێت بۆ جیهاد و پێویستی بە ئیزنی ژنەکەی ناکات، ئەگەر ژن پێویست نەکات ئیزن لە مێردەکەی وەربگرێت ئەی چۆن پیاو ئیزن لە ژنەکەی وەربگرێت؟**

**ئەی برای خۆم نابێت خەفەت بخۆیت بۆ منداڵەکانت، نابێت سەیری ئەو شتە بکەیت، چونکە بەڕاستی شەڕو پێکدادان توندترو ناسۆرترە، هێرشی کافران گەورەترە، ئەم موسیبەتە تیژتر و گەورەتر و گشتی ترە، بە ئازارترە لەسەر موسڵمانان، بەڕاستی ئەی برای خۆم ئەگەر تۆ خاوەنی خێزانیت هەر ئەوەندەت**

لەسەرە لەلایەن ژنەکەتەوە ژیانی ئاسایش و خۆش بکەیت بە ئەندازەیەك پارە و خەرجی کە بتوانێت پێی بژی بە ژیانێکی ئاسایی.

بەڵێ ئەی برایانی خۆم قەرز بەرهەڵستی ناکات بۆ هاتنت بۆ جیهاد ئەوەتا پرسیار کرا لە شێخ الاسلام ئیبن تەیمیە لەبارەی پیاوێکەوە کە قەرزارە و پاشان بانگ کەرێك بانگ ئەکات بۆ جیهاد ئەوە چی بکات؟ ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: سەیر دەکرێت ئەگەر قەرزارەکە ئەندازەیەك پارەی هەبوو، وەك ئەوەی توانی پارەی قەرزەکەی بداتەوە بە خاوەن قەرزەکە لەم کاتەدا سەیر دەکرێت بۆ خاوەن قەرزەکە ئایا خاوەن قەرزەکە قەرزەکەی بەکاردەهێنێت بۆ جیهاد یان بەکاری دەهێنێت بۆ بەرژەوەندی گیانی خۆی، ئەگەر خاوەن قەرزەکە بەکاری دەهێنا بۆ بەرژەوەندی گیانی خۆی ئەوە فەرزە لەسەر قەرزارەکە ڕاپەڕێ بۆ جیهاد لەو حاڵەتەدا و قەرزەکە نەداتەوە، بەڵام ئەگەر هەر پارەی نەبوو ئەوە چاکتر دەبێ ڕاپەڕێ و واز لە قەرزەکە بێنێ. [دەسا ئەی برایان چەند جار یادتان دەخەینەوە و دەڵێین: ] قەرزاری بەرهەڵستیت ناکات، ژن بەرهەڵستیت ناکات، دایك و باوك ناتوانن بەرهەڵستیت بکەن....

بەڕاستی ئەمڕۆ لە سەدەی بیستەمدا جیهاد فەرزی عەینە بە هیچ شێوەیەك ئیزن نییە بۆ هیچ کەسێك بەسەر تۆوە، ئەمڕۆ دەرچوونت بۆ جیهاد وەك نوێژ و ڕۆژوو وایە، چونکە بەجێهێنانی نوێژ چ نوێژی بەیانی بێت یان نوێژی ئێوارە بێت ئەگەر ویستت ئەنجامی بدەیت ئەوا بۆ هیچ کەسێك لەم جیهانەدا پێویست ناکات ئیزن وەربگری لێی، ئەمەش یاسای شەرعییە و گوفتاری هەموو زانایانی ئیسلامە، کەواتە بەسە بێن و بەسەر بەڵگەو نیشانەکانی پەروەردگارتانەوە بڕۆن و هەڵوێستتان یەك بخەن و گوێ بگرن لە گوفتاری خوای پەروەردەگار کە دەفەرموێت: ﴿ قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ

وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُواْ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦۗ ﴾ (التوبة: ٢٤) واتە ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ: ئەگەر ئێوە باوکانتان و منداڵەکانتان و ژنەکانتان و کەس‌و کار و تایفەکەتان و ئەو ماڵەی کە بەناڕەحەتی دەستتان کەوتووە و ئەو بازرگانییەی کە دەترسێن بوەستێت و قیمەت نەکات (زەرەر بکات) ئەو شوێن و مەنزڵگایەی کە خۆتان پێی ڕازین، ئەگەر ئەمانە خۆشەویستتر بوو لاتان لە خوا و نێرراوەکەی کە پێغەمبەر (ﷺ)ە لە تێکۆشان لە پێناوی خوادا ئەوا چاوەڕوان بکەن هەتاکو خوای گەورە فەرمانی خۆی دێنێت. واتە چاوەڕوان بکەن بۆ تۆڵە و ڕق و سزایەك لە ئاسمانەوە کە بریتییە لە زەلیلی و سەرشۆڕی دونیا و قیامەت... پاشان زەرەرێکی تریش ئەوەیە کە خوای گەورە بەڕاستی شایەتی فاسقێتی دەدات بۆ ئەو کەسەی کە دانیشتووە بە فاسقێتی کە دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴾ واتە بەڕاستی خوای گەورە هیدایەتی گەل و کۆمەڵێکی لادەر و سەرپێچی کار نادات، بەهەمان شێوەش لە فەرموودەی ڕاستی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە کە دەفەرموێت: (من مات ولم يغزو ولم يجهز غازيا ولم يخلف غازيا في أهله بخير أصابه الله بقارعة قبل يوم القيامة)[1] واتە هەر موسڵمانێك مرد و شەڕو کوشتاری نەکرد و موجاهیدێکی رێك نەخست بۆ جیهاد و موجاهیدێکی لەناو ئەهلەکەیدا بەجێ نەهێشت بەخێر، ئەوە خوای گەورە تۆڵە و سزایەکی سەخت و ناڕەحەت دێنێ بەسەریدا پێش ڕۆژی قیامەت، بە هەمان شێوە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە دەفەرموێت: (من مات ولم يغزو ولم يحدث نفسه بغزو مات على شعبة من النفاق) رواه مسلم. واتە: هەر موسڵمانێك مردو شەڕو جیهادی نەکردو نەهات بە دەروونیدا کە جیهاد بکات ئەوە مردووە لەسەر بەشێك لە دووڕوویی. [بەڵێ ئەی موسڵمانانی خۆشەویست ئەمە فەرموودەی پێغەمبەری خوایە ﷺ

---

[1] رواه أبو داود قال في تخريج المشكاة (١١٢٣/٢) وإسناده ضعيف

و گوفتاری کەسێکی تر نییە، کەواتە ئیتر بۆ شەرمی خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ ناتانگرێت و نایەنە مەیدانی جیهادەوە؟!]، **خۆزگە ئەگەر لە دوای بەردەوام بوونی دە ساڵ جیهاد نەهاتبێت بە دەروونیدا ئەم شەڕو کوشتارە ئەی چ کاتێك دێت بە دەروونیدا؟!! بەڕاستی ئەو دەروونە وای لێهاتووە کە بە هیچ شێوەیەك جیهاد پێیدا تێپەڕ ناکات، چونکە ئەگەر بیانویستایە جیهاد بکەن ئەوا خۆیان بۆ ئامادە دەکرد، خوای گەورە نیشانەیەکی بۆ ئەو کەسانە کە دەیانەوێت جیهاد بکەن داناوە، ئەویش خۆئامادەکردنە، ئەوەتا** [سەرزەنشتی دووڕووەکان دەکات] **دەفەرموێت:** ﴿ وَلَوْ أَرَادُوا۟ ٱلْخُـرُوجَ لَأَعَدُّوا۟ لَهُۥ عُدَّةً ﴾ **(التوبة: ٤٦) واتە: ئەگەر ئەو دووڕووانە بیانویستایە دەرچن بۆ جیهاد خۆیان بۆ ئامادە دەکرد، بەڵام پەنا بەخوا:** ﴿ وَلَـٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ وَقِيلَ ٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْقَـٰعِدِينَ ﴾ **(التوبة: ٤٦) واتە: بەڵام ئەمانە خوای گەورە پێی ناخۆش بوو دەرچوونیان و هەڵسانیان بۆ مەیدانی جیهاد، بۆیە قورسی کردن و داینیشاندن و پێیان وترا دانیشن لەگەڵ دانیشتووەکاندا وەك ژن و پیرو منداڵی بچکۆلە.** [ئەی برای بەڕێزم بەڕاستی بۆت ڕۆشن بوویەوە و هیچ عوزرێکت بۆ نەماوە کە چەك هەڵناگریت، مەگەر هەر عوزری هەواو هەوەس کاری نەبێت، بەڵام منیش ئامۆژگاریت دەکەم و دەڵێم ئارەزووی خۆت مەپەرستە و بە گوێی فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ بکە] **ڕۆشن بوویەوە ئەمە حوکمی خوایە، وە حوکمی پێغەمبەری خوایە ﷺ وە گوفتار و بۆچوونی فقهاء و موفەسیرینی قورئانە، بۆچوونی فەرموودەناسانە بە گشتی،** [کەواتە وریابە و تێبفکرێن و بەخەبەر بێنەوە لە خەوی زەلیلی و ڕووزەردی بەڕاستی مەسەلەکە گاڵتە و گەمە نییە].

## کۆنگرەی لاوانی موسڵمان

## دینێکی کردەوەیی (دین عملي):

**بەڕاستی ئەم دینە جوانە هەروەك چۆن فێر کراوین و ئاگاداربووین دینێکی کردەوەییە.. بزووتنەوەییە، جوڵاندنەوە و خرۆشانە، ئاشکرا و روون و بێ خڵتە و خۆڵە، زۆر رێکە و گاڵتە نییە، بەڵێ ئایەتەکانی قورئانە دادەبەزێت لەناویدا بۆ بەجێهێنانە،** [بۆ ڕاپەڕاندن و بۆ شۆڕش کردنە دژی زاڵمان]، **بەڵێ یارەکانی پێغەمبەر ﷺ ئایەتێکیان وەردەگرت یان دوو ئایەت یان سێ ئایەت لە دە ئایەت تێنەدەپەڕین، ئەو ئەندازەیان وەردەگرت دەیانبرد بۆ ئەوەی جێبەجێی بکەن و ئەهاتنەوە سەرلەنوێ ئەوەندەی تر فێر دەبوون،** [نەك وەك ئێمە کە لەم سەر بۆ ئەو سەری قورئان دەخوێنیتەوە و جارێك بە دڵماندا نایەت لە ئاستی ئایەتێکدا بوەستین و بچین لە خوێندنەوەوە بیکەین بە کردەوە].

**ئایەتەکان دانەدەبەزین بۆ رۆشنبیری، بەڵکو دادەبەزین تا جێبەجێ بکرێن و بخرێنە مەیدانی واقیع و جوڵەوە، هاوەڵەکان ئەفەرمون - خوا لەهەموویان ڕازی بێت - ئێمە زانیاری و کردەوە پێکەوە فێربووین بە قورئان،** [مەبەستیان لەوەیە کە ئەو قورئانە دەیخستنە مەیدانی کردەوەوە و لە تەمەڵی و تەوەزەلی دەری دەهێنان و لە خەوی بێ ئاگایی خەبەری دەکردنەوە، ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرەتای بوون بە پێغەمبەرێتیەوە خوای گەورە دەیەوێت ڕاپەڕێ و نەخەوێت و تەمەڵ نەبێت و ترسنۆك نەبێت، کردەوەیی بێت کە لە ئەشکەوتەکەوە دێتە دەرەوە دەڵێت دامپۆشن. دامپۆشن (دثروني، دثروني) یەکسەر خوای پەروەردگار حەزرەتی جوبرائیل دەنێرێت و پێی دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ﴾ (المدثر: ١) ئەی ئەو کەسەی کە خۆت داپۆشیوە لە ژێر کەلوپەلی خەوتندایت ﴿ قُمۡ فَأَنذِرۡ ﴾ (المدثر: ٢) هەستە و بترسێنە، ئینزاری خزمەکانت بکە بەتایبەتی و هەموو دونیا بە گشتی، خوای خۆت، پەروەردگارت بە بەڕێز و گەورە بگرە،

کەواتە خوای گەورە هەر لە سەرەتاوە پێغەمبەری خوای ﷺ کرد بە ئینسانێکی کردەوەیی، بۆیە دایکی ئیماندارانی عائیشە دەیفەرموو: (کان خلقە القرآن)].

**گوێم لێ بگرن براینە: زۆربەی لاوەکان پرسیار دەکەن کە ئایا حوکمی شەڕکردن (الجهاد) لەم سەدەی بیستەمەدا چییە؟! بەڵێ ئەوەی کە دەرهاتووە لە ژێر ڕۆشنایی زاراوەکانی قورئان و فەرموودەدا لە ژێر دەقەکاندا ئەوەیە کە جیهاد ئەمڕۆ فەرزی عەینە و هیچ پەڕاوێکی ئیسلامیم نەدیوە کە پێچەوانەی ئەم دەقە بێت، بە دڵنیاییشەوە دەڵێم کە هەموو زانایان ئەوانەی کە خاوەنی سیقە و خاوەنی زانیاری تەواون لەسەر ئەم دەقەن وەك منن هیچ جیاوازییەکیان نییە، هەموو ئەو زانایانەی کە شتیان لێ وەردەگیرێ و خاوەن تەقوان وەك بەڕێز شێخ بن باز و بەڕێز موحەممەد صالح عثیمین و بەڕێز سەعید حەوا و بەڕێز شێخ موحەممەد نەجیب موتیعی (خوا لێی ڕازی بێت) کە بەڕاستی لەم سەدەدا شارەزاترین زانایە کە خوای گەورە بردیەوە بۆ لای خۆی. هەروەها شێخ عەبدوڵڵا ناصیح عەلوان هاوڕامە کە ئەویش یەکێکە لە زانا شارەزاکان، وە زۆری تریش لەسەر ئەم ڕایەم کۆکن کە ئەگەر بێ باوەڕان بستێك لە زەوی موسڵمانانیان داگیرکرد ئەوە جیهادە دەبێت بە فەرزی عەین وەك ڕۆژوو لەسەر هەموو موسڵمانێك لەو پارچە زەویە ئیسلامییەدا تەنانەت ئافرەت دەردەچێت بەبێ ئیزنی مێردەکەی، بەڵام دەبێ مەحرەمێکی لەگەڵدا بێ، وە قەرزار دەردەچێت بەبێ ئیزنی خاوەن قەرزەکەی، مناڵ دەردەچێت بەبێ ئیزنی دایك و باوکی، واتە فەرز دەبێت ئەگەر ئەم ناوچە ئیسلامییە، ئەگەر خۆیان کەم بوون و بەس نەبوون بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن، یان کەمتەرخەمییان کرد یان سڵیان لە دوژمن کردەوە یان تەمەڵیان کردو پاڵیان دایەوە یان وازیان لە ڕووبەڕووبوونەوەکە هێناو دانیشتن، ئەوە ئەو فەرزە عەینە کە ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنە بڵاودەبێتەوە و دەڕوات بۆ ئەو موسڵمانانەی کە نزیکن لێیانەوە و دەبێتە فەرزی عەین لەسەریان، پاشان نزیکتر... نزیکتر... هەتاکو فەرزی عەین بە گشتی هەموو زەوی دەگرێتەوە، فەرزێکە ناتوانین بە هیچ شێوەیەك وازی لێ بهێنین**

**هەروەك نوێژ و رۆژووی فەرز... کەواتە لەو کاتەوە وڵاتی ئەندەلوس لە دەستی موسڵمانان کەوت و کەوتە ژێر دەستی بێ باوەڕان هەتاکو ئەم رۆژەی خۆمان جیهاد فەرزی عەینە لەسەر ئوممەی ئیسلامی، لەو رۆژەوەی کە موسڵمانان وازیان لێ هێناوە تاوانباربوون،** [وە با هەموو موسڵمانانی جیهان لە زانا و نەزانەوە ئاگادار بن] **قیتال و جیهاد یەك زاراوەی ئیسلامین و هیچ جیاوازییەکیان نییە، جیهاد لە ئیسلامدا بریتییە لە هەڵگرتنی چەك و بەس، هەر چوار مەزهەبەکە پێناسەی جیهادیان وا کردووە کە (الجهاد هو القتال بالسلاح، هو قتال الاعتداء)، واتە زاراوەی جیهاد لە ئیسلامدا بریتییە لە شەڕکردن بە چەك و تەقەمەنی، برتییە لە شەڕ کردن لەگەڵ دوژمن و بێ باوەڕاندا، بەم شێوەیە ئیمام ئەبو حەنیفە و ئیمام مالیك و ئیمام شافیعی و ئیمام ئەحمەد (خوایان لێ ڕازی بێت) لە کتێبەکانیاندا پێناسەی جیهادیان وا کردووە، بەڕاستی ئێمە وەك شوێنکەوتووی پێغەمبەر ﷺ نامانەوێت دەقەکانی قورئان و فەرموودە بتوێنینەوە، نامانەوێت تەئویلیان بکەین بۆ ئارەزووەکانی خۆمان،** [بتەوێت و نەتەوێت پێت خۆش بێت و پێت ناخۆش بێت] **مەبەست و مانای جیهاد لە ئیسلامدا واتە سەربڕین** [سەربڕینی زاڵمان، سەربڕینی لادەران و تاغوتان، بەڵێ، ئەمەیە یاسای خوایی و هیچ گومانی تێدا نییە] **کە ئەگەر بێ باوەڕان زەویەکی ئیسلامیان داگیرکرد و دەستیان بەسەردا گرت ئەوە جیهاد یەکسەر دەبێتە فەرزی عەین لەسەر هەموو موسڵمانێك لەو ناوچەیەدا، پاشان بڵاو دەبێتەوە، گشتی دەبێت هەتاکو ئەو فەرزە عەینە کە جیهادە، کە ڕووبەڕووبوونەوەی کافرانە هەموو زەوی دەگرێتەوە بە گشتی، فەرزە بەسەریانەوە، فەرزێکە کە ناتوانن وازی لێ بهێنن هەروەکو نوێژو رۆژوو، کەواتە ئەی موسڵمانانی جیهان گوێ لە هەڵوێستی من و بۆچوونی هەموو زانایان بگرن، ئەو موسڵمانەی کە ئێستا لە مەیدانی جیهاد نییە و شەڕ دژی کافران ناکات کافران ناکوژێت بە چەك... ئەو موسڵمانەی کە سەری هاوەڵ بڕیاردەر نابڕێت؟ ئەو موسڵمانە بەو شێوەیە هەروەك ئەو کەسە وایە کە لە مانگی رەمەزاندا بە زمانی بەرۆژووەوە نان بخوات،**

وەك ئەوە وایە لە رەمەزاندا بە عەمدی رۆژووی بشكێنێت و هەروەك ئەو كەسە وایە بە عەمدی واز لە نوێژ بهێنێ، ئەی موسڵمانانی جیهان لە فەرمانی دینەكەتاندا بەسەر بەڵگەی روون و ئاشكراوە بن، راست بن، حەق بێن بن، جیهاد لە زاراوەی ئیسلامیدا واتە شەڕ كردن (قتال)، جیهاد قیتالە، هەروەك زانای بەڕێز ئیبن روشد دەفەرموێت: (وحيثما اطلق كلمة الجهاد فإنما تعني قتال الكفار بالسيف حتى يسلموا أو يعطوا الجزية عن يد وهم صاغرون). واتە: لە هەر كاتێكدا وشەی جیهاد بە گشتی هات واتە بە موتەڵەقی هاتو موقەیەد نەكرابوو بە هیچ شتێكەوە، ئەوە مەبەستی شەڕكردنی بێ باوەڕانە بە شمشێر، بە تەیارە هەتاكو موسڵمان بن یان لە دەوڵەتی ئیسلامیدا دانیشن و باجی ساڵانەیان لێ بسەنرێت و زەلیل بن، بەڕاستی ئەی موسڵمانان هەمووتان داوالێكراون لە مەیدانی جیهاددا بن، لە جیهاددا بژین لەهەر شوێنێك بێت لەم زەوییەدا بێت تۆ لەناو جیهاددا بیت، هەر شوێنێكت دەوێت هەر پارچە زەوییەكت دەوێت كە جیهادی تێدا بێت دەبێت خۆت بگەیەنیتە ئەو شوێنە ئەگەر توانیت لە فەلەستین جیهاد بكەیت ئەوە فەرزە لەسەرت كە جلوبەرگی شەڕ لەبەر بكەیت و چەك و تەقەمەنی هەڵگریت و شەڕ و كوشتاری كافران لەناو خاكی فەلەستیندا بكەیت، ئەگەر نەتوانی لە فەلەستین ئەوە [لە چیچان] ئەگەر نەت توانی ئەوە لە ئەفغانستان لە فلیپین لە ئەریتریا لە چاد [لە كوردستان لە عێراق لە هەر شوێنێك بتوانیت كە خۆتی پێ بگەیەنیت دەبێ برۆیت].

شەڕ ئەمڕۆ لە سەدەی بیستەمدا فەرزی عەینە لەسەر موسڵمانان هەروەك نوێژی عەسر و بەیانی، هەروەك ئەو نوێژی عەسرەی كە ئێستا ئەنجامامان دا، بەڵێ ئەی موسڵمانان ئەگەر دەتانەوێت دینەكەتان ئەنجام بدەن، ئەگەر ئێوە لە فەرمانی دینەكەتاندا جددین، بەڕاستی ئەم دینە دینی كردەوەیە و روونە و رۆشنبیری ناناسێ بەبێ جێبەجێ كردن لە واقیعی ژیاندا، ئەنجامدانێكی زیندوویی بزووتنەوەییە.

**بەڵێ موسڵمانانی فەلەستین، ئەوەی کە دەتوانێت بگات بە فەلەستین ئەوە فەرزە لەسەری بچێت بۆ ئەوێ بۆ ئەو جیهادە پیرۆزە، بەڵام فەلەستینییەکە کە ناتوانێت ڕاپەڕی و بجوڵێ بەرەو فەلەستین ئەوە فەرزە لەسەری کە بیر بکاتەوە و بکەوێتە باس و خواس لە پارچە زەوییەکی تر کە لە ناویدا چەك و تەقەمەنی و شەڕی تێدا پەیدا بکات و دەستی ستەمکاران ببڕێت،** [کەواتە ئەی برایانی خۆم با لە ئاگری دۆزەخ بترسین، با هەر لە خۆمانەوە دەربارەی ئەم جیهادە قسە نەکەین، باوەکو یارەکانی پێغەمبەر ﷺ بین کە ئەوان هەموو دڵتەنگی و خەفەتێکیان ئەوەبوو لە جیهاد دوا بکەون، کە ئەگەر بۆیان نەگونجایە جیهاد بکەن، ئەوەتا سەرکردەی دلێر و بەڕێز سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (خوای لێ ڕازی بێت) لە کاتێکدا کە ڕووبەڕووی ڕۆستەم وەستابوو ئا لەو کاتەدا یارێکی پێغەمبەری ئازیزی ﷺ نارد بۆ گفتوگۆ کردن لەگەڵ ڕۆستەمدا کاتێك ڕۆیشت و گەڕایەوە هەواڵی دا بە سەعد کە دەیانەوێت شەڕ بکەن، ئا لەو کاتەدا خەبەری شەڕ هات سەعدی سەرکردە زۆر نەخۆش بوو بە جۆرێك نەیدەتوانی بە تەواوی لەسەر زەوی دانیشێ، چونکە هەموو لاشەی بووبوو بە دومەڵی پڕ کێم، ئا لەم کاتەدا کاتی جیهادە و سەعدیش لاشەی هەمووی دومەڵە ناتوانێت سواری وڵاخ بێت و بڕوات، بۆیە یەکسەر هەردوو چاوی سەرکردە پڕ دەبێت لە فرمێسك، ئاواتی دەخواست ئەو شەڕ یان ماوەیەك پێشتر بوایە یان دواتر بوایە، هەتاکو نەخۆشییەکەی چاك ببێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەر خۆی پێنەگیراو ڕۆیشت بۆ مەیدانی شەڕ و مەیدانی جیهاد، بۆیە لە کاتی سەرەمەرگیشدا حەزی دەکرد بەو عاباوە بیخەنە قەبرەکەوە کە شەڕی بەدری پێوە کردبوو، لەسەرەمەرگیشدا فەرمانی کرد کە عاباکەی بۆ بێنن کە بۆیان هێنا سەیری کرد کۆن بووە و ڕزیوە، پاشان فەرمانی کرد بە کەسوکاری کە لەناو ئەم عابایەدا کفنی بکەن و فەرمووی: (لقد لقيت المشركين فيه يوم بدر، ولقد إذخرته لهذا اليوم) واتە: بەڕاستی بەم عاباوە لە ڕۆژی بەدردا گەیشتم بە هاوەڵ بڕیاردەران و کوشتارم پێوە کرد، بەڕاستی شاردمەوە بۆ ئەم ڕۆژە.

کەواتە ئەی موسڵمانی بەڕێز با من و تۆ وەك سەعدی بەڕێز بین بەئێش و ئازاری لاشەمانەوە هەر واز لە جیهاد نەهێنین، ئەگەر لە کاتێکدا کە خۆشمان نەیەینە مەیدانی جیهادەوە با

خەڵکیش سارد نەکەینەوە، چەند جار دەیڵێمەوە کە ئەم دینە دینێکی کردەوەییە] بەڕاستی خوێندنەوە لەناو پەڕاوەکاندا و زانیاری فێربوون شتێکی پیرۆزە، بەڵام تواندنەوەی دەقەکانی قورئان و فەرمووده تەئویل کردن بۆ خاتری ئەنجامدانی ئارەزوویەك ئەمە بە هیچ شێوەیەك جائیز نییە و ڕەوا نییە و رووزەردی بەردەم قاپی خوا دەبین.

## روونی لەگەڵ دەروون و دەقە شەرعییەکاندا

[بەڕاستی ئەوەی کە بووە بە هۆیەك لە هۆیەکانی ساردکردنەوەی لاوانی خوێنگەرم لە جیهاد بریتییە لەوەی کە کاتێك فەرمووده جیهادییەکان دەدەی بە گوێیاندا دەڵێن خۆ جیهاد مەبەستی بەس چەك هەڵگرتن و شەڕ کردن نییە، واتە تێکۆشان، دەتوانیت بە هەموو شتێکی گونجاو ئەنجامی بدەیت، تەنانەت جاری واش هەیە لە دەمی دەردەچێت دەڵێت دەستنوێژ گرتنیش هەر جیهادە]، برای بەڕێز بەڕاستی وشەی جیهاد لە دینی خوا و لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ زاراوەیەکی قورئانی بۆ هەیە، زاراوەیەکی بۆ هەیە لە لایەن خواوەیە، هەرکاتێ لە قورئان و فەرموودەدا هات ئەوا مانا و مەبەستەکەی شەڕ کردنە لەگەڵ بێ باوەڕاندا، جیهادیش بەردەوام بە فەرزی عەین دەمێنێتەوە بەسەر شانی ئیماندارانەوە هەتاکو دوایین پارچە زەوی کە رۆژێك لە رۆژان لە ژێر دەسەڵاتی موسڵماناندا بووە بگەڕێتەوە ژێر دەستی موسڵمانان، بێتەوە لای ئیسلام...

جیهاد واتە شەڕ کردن و کوشتار بە درێژایی ژیانت بە فەرزی عەین بەسەرتەوە دەمێنێتەوە، ئەی برای خۆم واش دابنێ کە تۆ لە ئەفغانستان یان فەلەستین شەڕو کوشتارت کرد هەتاکو فەلەستینمان ڕزگار کرد وە لە دەستی ستەمکاران دەرمان هێنا، ئەوە بە ئەندازەی ئەو شەڕو کوشتارە، ئیتر کۆتایی نایەت بە فەرزی عەین، نابێ بڕۆی پاڵی لێ بدەیتەوە و بڵێی وڵاتەکەی خۆم ڕزگاری بووە، ئیتر جیهاد تەواو بوو!! نەخێر، نابێت بەو شێوەیە بیر بکەیتەوە فەرزە لەسەرت کە بیر لە

**ڕزگاری پارچەیەکی تری ئیسلامی بکەیتەوە، ڕاپەڕی و تیّ بکۆشی بۆ وڵاتێکی تر، ناوچەیەکی تر، شارێکی تر، پارچە زەوییەکی تر.** [هەتاکو یان دەکوژرێیت یان هەموو سەر زەوی لە ژێر ستەمی ستەمکاران ڕزگار دەکەیت، دەبێت وەك یارەکانی پێغەمبەر ﷺ بیر بکەیتەوە، خۆ ئەوان ئەگەر بەس بیریان لە موسڵمان بوونی شاری مەدینە بکردایەتەوە، یان دورگەی عەرەب، ئەوە ڕۆشنایی ئەم خۆرە پاکە نەئەگەیشتە مرۆڤەکان. برای خۆم بەڕاستی نازانم مسولّمانان هەتاکو کەی لە جیهاد تیّ دەگەن؟! جیهادیش فەرزێکە لە فەرزەکانی ئیسلام، خۆ هیچ غەریب نییە لە دینی خوادا بەڵام نازانم بۆ غەریب بووە لەناو دەروون و مێشکی موسڵماناندا، تەنانەت زاناکایش!!

برای خۆم هەتاکەی تێدەگەی بەڕاستی و بەبیّ گومان دەڵێم:] **خوێندنەوەت جیهاد نییە، زانیارییەکەت جیهاد نییە، فێربوون و فێرکردنەکەت جیهاد نییە،** [وتار و ئامۆژگارییەکانت جیهاد نییە، گریان و ڕۆژووگرتنەکەت جیهاد نییە]، **جیهاد واتە شەڕ کردن، شەڕکردن لەگەڵ بیّ باوەڕان** [بەڵیّ ئەی برای خۆم هیچ بیانوویەکت نەماوە کە بە هۆیەوە خۆت و خەڵکی گێل بکەیت لە جیهاد] **لەبەرئەوەی ئالاّی جیهاد بەرز کراوەتەوە، لەبەرئەوەی سوپاس بۆ خوا کوێر و شەل و نەخۆش نیت و لەشساغیت و لە تواناتدا هەیە کە چەك هەڵگریت** [کەواتە ئیتر خۆت گورج و چالاك بکەرەوە بەرەو مەیدانی سەربازگەی ئیسلامی بەڕیّ بکەوە، بکەوەرە جیهادیِ بیّ باوەڕان، گویّ مەدە بەو کەسانەی کە دەیانەوێت ساردت بکەنەوە و لەو خێرە بیّ وێنەیە بێبەشت بکەن].

**بەڕاستی فەرزە کە دەبێت ئەم باسە زۆر ئاشکرا بێت،**[1] **فەرزە کە تۆی موسڵمان دەبیّ لەگەڵ دەقە قورئانییەکاندا لە لایەنی کەمیەوە ئاشکراو ڕوون بیت و لێت ون نەبن لە ئاستی مەبەستەکانیدا بیّ هۆشت نەکەن، فەرزە لەسەرت کە تۆی موسڵمان دەبێت ڕوون و ئاشکرا بیت لەگەڵ پەروەردگارتدا، لەگەڵ پێغەمبەرەکەتدا ﷺ لەگەڵ دەقەکانی قورئان و فەرموودەکاندا.**

---

[1] واتە باسی ئەوەی کە جیهاد واتە شەڕکردن.

بەڵێ ئەی برایانی خۆم ئەگەر ئێمە هەر حەز ناکەین کە جیهاد بکەین، ئەگەر ئێمە کورت ڕەو و کەمتەرخەمین ئەگەر ڕانابینێت بە ئیمان و ئازایەتی خۆتدا بۆ جیهاد؟!! ئەوا دانی پێدا بنێ و خەڵکیش سارد مەکەرەوە [ئەگەر جەنابت پیاوی ناو مەیدانی گیانبازی و فیشەك و شەهیدی نیت ئیتر بۆ خەڵکیش بە خۆتەوە بەرەو سزا دەبەیت؟[1] کە تۆ خۆت توانای دەستنوێژگرتنت نییە، توانای نوێژی بەیانیت نییە، ئیتر خەڵکی تریش ساردمەکەرەوە و پێیان مەڵێ خۆ قەیدی نییە ئەگەر نوێژی بەیانی لەگەڵ خۆرکەوتندا بکەن... ئەمە فێڵ کردنە لەگەڵ موسڵماناندا، لەگەڵ خوادا، لەگەڵ ئیسلامدا، لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، ئەگەر ئەو موسڵمانە کە جەنابت لە جیهاد ساردی دەکەیتەوە، تۆزێ ڕۆشنبیر و چاوکراوە بێت ئەو سارد نابێتەوە، بەڵام ئەگەر خۆی هەر لە سروشتدا جیهادی پێ گران بێ ئەوە خواخوایەتی یەکێك بڵێ کاتی نەهاتووە، ئەوە بە ڕاستی هەموو کەسێ دەتوانێ بە دوو قسەی زرق و برق ساردی بکاتەوە و داینیشێنێت، کەواتە با فێڵ لە خۆمان و لە ئیسلام و موسڵمانانیش نەکەین]، ئەگەر ئێمە ناتوانین لەو قەفەزەدا کە تێی خراوین بفڕین، باڵەفڕێ دەکەین، ئەگەر بفڕین دەکێشین بەسەر تاقی ئەو قەفەزەی کە تێیدا دەژین، دەبێ دان بەوەدا بنێین کە ئێمە ناتوانین بفڕین.

جیهاد واتە شەڕکردن بە چەك، ئێستا لە سەدەی بیستەمدا فەرزی عەینە، فەرزە وەك نوێژ و ڕۆژوو و بەردەوامە و دەمێنێتەوە، هەتاکو دوایین پارچە زەویەکانی ئیسلام کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئاڵای (لا اله الا الله)دا بووە، جارێکی تریش بگەڕێتەوە بۆ ژێر ئەم ئاڵایە، ئەی موسڵمانانی جیهان ئەی ئیمانداران ئەگەر خۆشحاڵن و حەز دەکەن کە ڕوون و ئاشکرا بن لەگەڵ پەروەردگارتاندا، لەگەڵ ڕێڕەوی سوننەتی پێغەمبەرەکەتاندا ﷺ، لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا، ئایا خۆشحاڵن بەم شێوە بن؟ دەی ئەمەی کە وتمان حوکمی شەرعییە و هیچ گومانی تێدا نییە [ئەگەر دەتانەوێت

---

[1] چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِلَّا تَنفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ (التوبة: ٣٩) واتە: ئەگەر ئێوە ڕانەپەڕن و نەچن بۆ جیهاد ئەوە سزاتان ئەدرێت بە سزایەکی توندو ناخۆش.

فەرمانەکانی خوا ڕابپەڕێنن، بەڕاستی ئەمەش یەکێکە لە فەرمانەکانی قورئانی پیرۆز] بەڕاستی جیهاد بەندایەتی ژیانە، بەندایەتی و پەرستنێکە بەهیچ شێوەیەك نایپچرێت مەگەر بە دەرچوونی ڕۆح نەبێت، بە تەواوی وەك نوێژ وایە، هەروەکو چۆن نوێژکردن لەسەر شانت ناکەوێت، مەگەر لە کاتێکدا ڕۆحت دەرچوو بێت، واتە بمریت، ئینجا لەسەرت دەکەوێت، بەهەمان شێوەش بەندایەتی جیهاد لەسەر شانت ناکەوێت مەگەر لە کاتێکدا نەبێت کە گیانت دەرچووبێت، بەڕاستی هۆ هێنانەوە بە قسەی هیچ و پڕوپووچ دروست نییە، بەئاوات خواستنی بێ سنوورو دروست نییە، دروستکردنی عوزرەکان و هەڵبەستنیان بە هیچ شێوەیەك ڕەوا نییە بۆ دواکەوتنت لە جیهاد و جائیز نییە تواندنەوەی دەقەکانی قورئان و فەرموودە و تەئویل،[1] (کردنیان بەبێ بەڵگە و بەهیچ شێوەیەك یاری کردن بە ئایەتە قورئانییەکان جائیز نییە)، [بە ئارەزووی خۆت بڵێی مانای ئەمە و ئەوەیە].

جیهاد ماناو مەبەستی شەڕ و کوشتارە، وەرن خۆتان بپێچنەوە و شەڕو کوشتار بکەن لە فەلەستین، کۆچ بکەن، بەڕاستی فەلەستین کراوەیە بۆت، ئایا پێم بڵێ و بۆم ڕۆشن بکەرەوە ناتوانیت کۆچ بکەیت؟ فلیپین کراوەیە؟ ناتوانیت ئەفغانستان کراوەیە؟ زۆر شوێنی تر هەیە کە بانگی جیهادی تێدا هەڵکراوە و دەشتوانیت بیگەیتێ، ئەوە دە ساڵە شەڕو کوشتار لە ئەفغانستان لەگەڵ کافراندا بەردەوامە، بەڵام تۆ نایەیت مانای کە تۆ بە دڵتدا نەهاتووە کە جیهاد بکەی، (من مات ولم يغزو ولم يحدث نفسه بغزو مات على شعبة من النفاق) رواه مسلم. واتە: هەر موسڵمانێك مردو شەڕو کوشتاری نەکردو بە دەروونیدا نەهات کوشتار کردن و شەڕ کردن، ئەوە ئەو موسڵمانە کاتێ مرد لەسەر بەشێك لە دووڕوویی دەمرێت، بەڵێ بەڕاستی ئەگەر موسڵمانیت هەر دەبێت دەروونی خۆت ئامادە بکەیت بۆ جیهاد [بۆ شەهیدی،

---

[1] تەئویل بریتییە لەوەی کە دەقەکە لە مانا ئاشکراکەی خۆی لادەیت و بڵێی مەبەستی شتێکی ترە، جا ئەمە دروست نییە مەگەر بە بەڵگەوە نەبێت، هەروەك لە (أصول الفقه)دا باسکراوە بە ڕوونی.

بۆ کوژاندنەوەی ئاگری بێ ئابڕووان، بۆ گرتن و بەربەستی لافاوی ستەمکاران، بەڕاستی بەهیچ شێوەیەك نابێت خۆت گێل بکەیت و خۆت بدزیتەوە بەوەی کە جارێ کاتی نەهاتووە، چونکە ئەگەر کاتیشی نەهاتبێت ئەوە تۆ خۆئامادەکردنەکەت هەر لەسەر فەرزە، چونکە خۆئامادە نەکردن یەکێکە لە نیشانەکانی دووڕووەکان، ئەوەتا خوای گەورە نهێنییەکانی دڵ ئاشکرا دەکات و دەفەرموێ: ] ﴿ وَلَوْ أَرَادُوا۟ ٱلْخُـرُوجَ لَأَعَدُّوا۟ لَهُۥ عُدَّةً ﴾ (التوبة: ٤٦) **واتە: ئەو دووڕووانە ئەگەر بیانویستایە دەربچن بۆ جیهاد، ئەوە چەك و شمشێر و هۆکارەکانی شەڕیان بۆ جیهاد ئامادە دەکرد** [کەواتە ئەوانەی کە دەڵێن کاتی نەهاتووە ئێمەش پرسیاریان لێ دەکەین و دەڵێین: ئایا تەقەمەنیتان بۆ ئامادەکردووە ئەگەر کاتەکەی هات؟ بێگومان نەخێر] **کەواتە داوا دەکەین لە خوا و هیوا دەکەین لە پەروەردگار کە ئێمە لەوانە نەبین کە ڕاپەڕینمان پێ ناخۆش نابێ و داماننیشێنێ و پێمان بوترێ دانیشن لەگەڵ دانیشتووواندا.**[1]

**بەڕاستی لە نموونەی ئەم ڕۆژانەدا و ئەم حاڵانەدا خوای گەورە باسی هەڵوێستی ڕاستەقینەمان بۆ دەکات دەفەرموێت:** ﴿ لَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ أَن يُجَـٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَٱرْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِى رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ ﴾ **(التوبە ٤٤. ٤٥) واتە ئیزنت لێ ناخوازن ئەوانەی کە باوەڕیان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە کە جیهاد بکەن بە ماڵ و گیانیان، بەڕاستی خواش زۆر زانایە بە لەخواترسەکان، تەنها ئەوانە داوای ئیزنت لێ دەکەن کە باوەڕیان نییە بە خوا و بە ڕۆژی دوایی و هەڵگەڕاونەتەوە و لەناو گومانی خۆیاندا دێن و دەڕۆن.** [بەڵێ ئەم ئایەتە مەبەستی

---

[1] ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿ وَلَـٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ وَقِيلَ ٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْقَـٰعِدِينَ ﴾ التوبة: ٤٦) کە دەربارەی موونافیقەکان هاتووەتە خوارەوە کە لە جیهاد دواکەوتن هەروەك لە پەڕاوەکانی تەفسیردا بە درێژی باس کراوە.

ئەوەیە هەرکەسێك باوەڕی دامەزراو بێ ئەوە ناڕوات چەندین عوزرو بیانوو هەڵبەستێ بۆ خۆدوورگرتن لە جیهاد و کوشتار، ئەو کەسانەی ئەم جۆرە ئیشانە ئەکەن ئەوە دڵیان گومانی تێدایە و دانەمەزراوە، دڵیان نەخۆشە، نەخۆشی زەلیلی، ترس لە دوژمن، مردن، خۆشویستنی دونیا و بوغزاندنی قیامەت.... ئەم نەخۆشییانە وا لاوازی کردووە بەشێوەك ئەگەر باسی جیهادی بۆ بکەیت هەروەك ئەوە وایە کە ڕەوانەی کەی بۆ مردن]. [١]

**بەڵێ ئەی موسڵمانان باش بزانن ئەو قسانەی کە من ئێستا دەیانڵێم و باسم کردوون لەبارەی جیهادەوە خەڵکی گومانی تێدا دروست دەکات، دەڵێ وانییە و بەهەڵەدا چووە، ئەوا با باشیش بزانن ئەو گوفتارانە گوفتاری ئیمام حەسەن بەنناو مەودودی و سەید قوتبن، کە حەسەن بەننا پێش چل ساڵ لە ریسالەی جیهاددا فەرموویەتی: (إن الجهاد اذا الاعتدي على أرض المسلمين يصبح فرض عين حتى يخرج الولد دون إذن والده ـ والدين لا يؤثر ـ تخرج). واتە: جیهاد دەبێتە فەرزی عەین هەرکاتێ دەستدرێژی کرایە سەر خاکی موسڵمانان تەنانەت کوڕ بەبێ پرسی باوکی دەردەچێت و قەرزاریش هیچ کاریگەرییەکی نییە بۆ دەرچوون.**

**ئیبن تەیمیە پرسیاریان لێ کرد لەبارەی جیهاد کردن بە ماڵ و دوایی وتیان کۆمەڵ و گەلێك هەن زۆر برسی و هەژارن، ماڵیشمان هەیە ئەگەر پارەکەمان دایە هەژارەکان ئەوە جیهادەکە زەرەر دێنێ، ئەگەر دامان جیهاد ئەوە برسییەکان دەمرن، چی بکەین لەو ماڵە؟ وتی: بیدەن بە جیهاد با برسییەکان بمرن،** [ئەمەیە تێگەیشتن لە جیهاد، ئەمەیە زانیاری، ئەمەیە هەڵوێست، جەنابێکی لە شارێکی بچکۆلەدا پازدە مزگەوت دەکاتەوە بەسەریەکەوە، بەڵام موجاهیدان لە سەنگەرەکانی ڕووبەڕووی دوژمنان نانیان دەستناکەوێت بیخۆن].

**ئەی براینە نازانم گرفتی ئێمە ئێستا چییە؟ نازانم داواکاریمان چییە؟ نازانم باس و هاتن و چوونی ئێمە ئێستا لە زەویدا چییە؟ بەڕاستی ئێمە چەند هەتیوێکی**

---

[١] ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى الْمَوْتِ وَهُمْ يَنظُرُونَ﴾ الأنفال: ٦

**ونبووین هەواڵ دەپرسین، باسی ماڵێك دەكەین بۆ هەتیوان كە پەنای بۆ بەرین و بحەوێنەوە، بەڕاستی ماڵێكمان دەوێت كە ناوەكەی** (دار الاسلام)**ە، ماڵی موسڵمانانی پێ دەگووترێت، بۆ ئەوەی لەو ماڵەدا بمێنینەوە و بەسەر ئەو ماڵەوە بین، بۆ ئەوەی جەماوەری موسڵمان ڕاپەڕێنین و لەوێدا دەوڵەتی ئیسلامی دامەزرێنین، بۆ ئەوەی ئاڵای (لا اله الا الله) بەسەریەوە بەرز بكەینەوە و بگەشێتەوەو بشەكێتەوە، بۆ ئەوەی لەبەردەرگای سێبەرەكەیدا دابنشین و ماندوویمان دەرچێت... ئەی موسڵمانانی جیهان گوێم لێ بگرن و وەسیەت دەكەم: هەتاكو موسڵمانان ئامانجیان و تێكۆشانیان یەكلا نەكەنەوە بۆ هەڵوێستێك لە هەڵوێستەكان و نەبن بە یەك كۆمەڵ و دەست و هەتاكو لەناو دەروونیاندا دروست نەبێت كە لەو ئاست و ئەندازە هەرێمەی كە لەناویدا زیندان بووین ڕاپەڕین و دەرچین و لەو چوارچێوانەی كە لە ناویاندا و لەژێریاندا زیندان كراوین دەرنەچن و ڕزگار نەبن، هەتاكو دەرباز نەبین لەو خۆپەرستی و ئارەزووپەرستییەی كە بە زۆر زاڵ بووە بەسەرماندا، هەتاكو بیرنەكەینەوە لە ماڵێك بۆ ئیسلام لەسەر ئەم زەوییەدا لەناویدا ئارام بگرین و خۆگر بین، ئەوە هەر دەمێنینەوە بە فەوتاوی هەروەك كۆمەڵێك هەتیو لەسەر سفرە و خوانی ڕەزیلێك،** [ئەوە هیچمان بە هیچ نابێت و خوای گەورە ئێمە لا دەبات كۆمەڵێكی چاكترو لێبڕاو تر دێنێتە مەیدان].

**بەڕاستی ئێمە لە تێكۆشاندایین بۆ دروستكردنی ماڵێك، بەڕاستی ئێمە لە باسكردنداین لە بۆ ماڵێك، باسی دەكەین لە ماڵێك بۆ ئیسلام.** [ئای خۆزگە موسڵمانان لانەیەكیان هەبوایە لەسەر ئەم زەویەدا ئیمانداران پەنایان بۆ ببردایە ! !].

**سوێند بە خوا ئەگەر ئێمە بتوانین بچین بۆ فەلەستین ڕزگاری بكەین لەژێر دەستی یەهود، ماڵی ئیسلامی بەسەرەوە دامەزرێنین، ئەگەر ئەمانە بتوانین و نەمان كرد، ئەوە هەریەكە لە ئێمە تاوانیارە دانیشێ لە ماڵی خۆیدا، ئەگەر پارچە زەویەكی تر هەبێت بگونجێت كە بەسەریەوە** (دار الاسلام) **دابمەزرێت، ئەو هەموو بێ نەوا و هەتیوانە پەنای بۆ لابەرن، بەسەریەوە كۆمەڵگای ئیسلامی دروست بكرێت، ئەوە**

**بەڕاستی حەرامە لە سەرمان ئەو پارچە زەویە واز لێ بهێنین و کەمتەرخەمی بکەین و جێی بهێڵین بۆ فڕاندنی گورگەکان لەکاتێکدا کە ماڵەکە هیچی نەماوە، سەربانەکە رووخاوە و نەماوە، مەگەر کەمێکی نەبێت،** [بەڕاستی بەجێهێلانی ئەو ماڵە هەموو موسڵمانان تاوانبار دەبن و ڕووزەردی بەردەم قاپی خوا دەبن].

**ئەی براینە:**

**بەڕاستی ئەم مەسەلەی جیهادە ئاشکرا و ڕوونە و گاڵتە نییە، مەسەلەیکی جددییە، بەڕاستی ئێمە ئیش‌و مامەڵە لەگەڵ ئەم دینەدا دەکەین، مامەڵە لەگەڵ پەروەردگاری جیهانیان دەکەین، ئەو پەروەردگارەی کە ئاگادارە بە دڵەکان، زۆر زانای شاراوە و نهێنییەکانە، زۆر بیسەر و بینەرە، ئێمە دەتوانین فێڵ لەگەڵ هەموو کەسێك بکەین و هەموو ئینسانێك بخەڵەتێنین تەنها نەفسی خۆمان نەبێت، ناتوانین خۆمان بخەڵەتێنین، دەتوانین بڵێین هەرچی بڵێین، دەتوانین فێڵ لە خەڵکی بکەین** [بەلام خۆ فێڵ کردن لە پەروەردگاری جیهانیان ناکرێت، خۆ فێڵ لە پەروەردگاری میهرەبان ناکرێت]، **بەڵی دەتوانین لەگەڵ خەڵکی چی بڵێین، بەلام لەگەڵ دەروونی خۆماندا ناتوانین چی بڵێین، تەنها ئەوە نەبێ کە پاکی بکەینەوە و بڵێین: ئایا من راست دەکەم و یەك لام بۆ شەڕی کافران؟!! ئایا من ڕاستگۆ و یەك لام بۆ جیهاد؟!!** [هەموو کەسێك چاك دەروونی خۆی دەناسێت].

**ئەی براینە:**

[ئێمە چەندین جار هاوارمان بۆ موسڵمانان بەرزکردەوە، چەندین جار وتوومانە و دەیڵێینەوە ئەمڕۆ ڕۆژی دانیشتن نییە، ئەمڕۆ تۆ دەبێت لە ناو جیهاددا بیت، ئەگەر بتوانیت لە ناوچەو وڵاتەکەی خۆت دەبێ ئاڵای جیهاد ڕاپەڕینی، ئەگەر ناتوانیت ئەبێ کۆچی بکەیت، بۆ مەیدانی جیهاد]، **دەبێ کۆچ بکەیت بۆ لامان، ئێمە چەندین سەربازگەمان کردووەتەوە بۆ موجاهیدان و برایانی موسڵمان لەسەر سنوورەکان هەموویان کراوەن لەبەردەم موسڵماندا، هەموو موسڵمانانمان ئاگادار کردووەتەوە، دوو ساڵی تەواو بانگمان کردن، نازانم بۆ ناجوڵێن، ئەوا کوا ئەو موسڵمانەی کە هاتن بۆ جیهاد بۆ**

**ئەمڕۆ تۆی موسڵمان بانگەواز بۆ کراویت هیچ عوزرو بیانوویەك نەماوەتەوە بۆ تۆ لە لای خوای پەروەردگار،** [ئەگەر خێزانداریت ئەوە شوێنی بۆ دابنێ و خۆت وەرە، چونکە بانگەوازە و بانگەوازی دەرچوونە بۆ جیهاد، با تۆش لەو کاروانە بەفەڕو بەرەکەتە بەجێ نەمێنی].

**مەسەلەی پێنجەم[١]: جیهاد لە ئیسلامدا مەبەست و واتای (قتال)ە، چونکە هەموو زانایان و ئوممەتی ئیسلامی دانیان پێدا ناوە و باسیان کردووە کە جیهاد واتە شەڕ کردن، ئەوەتا ئیبن روشد و قورتوبی دەفەرموون: (وحيثما اطلقت كلمة الجهاد فإنها تعني قتال الكفار بالسيف حتى يسلموا أو يعطي الجزية عن يد وهو صاغرون) واتە: هەر کاتێك وشەی جیهاد لە قورئانو سوننەتدا بە (مطلق)ی هات و (مقيد) نەکرابوو بەشتێکەوە ئەوە مەبەستی شەڕکردن و کوشتاری بێ باوەڕانە بە شمشێر، هەتاکو موسڵمان بن یان ئەگەر جولەکە بن لە دەوڵەتی ئیسلامیدا دابنیشن و سەرانە بدەن و زەلیل بن، کەواتە لەهەر کاتێکدا وشەی جیهاد بە گشتی هات و تایبەت نەکرابوو بەشتێکەوە ئەوە مەبەست پێی شەڕ (قتال)ە و بەهەمان شێوە پێناسەی جیهاد لەلای حەنەفیەکان هاتووە لە پەڕاوی (فتح القدير)دا لە لاپەڕە (٥٨٧)دا کە دەفەرموێت: (الجهاد دعوة الكفار إلى دين الحق وقتالهم إن لم يقبلوا) واتە: جیهاد بانگەوازکردنی بێ باوەڕانە بۆ ئیسلام و شەڕکردن و کوشتنیان ئەگەر ئیسلامیان وەرنەگرت.**

**ئیمام کەسائی لە پەڕاوی (البدائع)دا فەرموویەتی: (الجهاد بذل الوسع والطاقة بالقتال في سبيل الله عزوجل) واتە: جیهاد سەرف کردنی هەموو توانا و هێزە بۆ شەڕکردن و کوشتنی بێ باوەڕان لە پێناوی خوادا.**

---

[١] ئەم مەسەلەیە زۆر گرنگە، وە دەتوانم بڵێم ئەمەی (شێخ عبدالله عزام) باسی دەکات و شیی دەکاتەوە بووەتە هۆیەکی سەرەکی بۆ تواندنەوەی مەبەستی فەرموودە جیهادییەکان.

هەموو زانایانی ئیسلام فەرموویانە (فی سبیل الله) زاراوەیەکە کە لای پەروەردگار مەبەست پێی جیهادە و (الغزو والقتال فی سبیل الله) واتە (قتال)، ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (لغدوة أو روحة في سبيل الله خير من الدنيا وما فيها) (رواه البخاري) واتە: بەیانیەك و ئێوارەیەك لە جیهاددا خێرترە لە هەموو دونیا و ئەوەش لەناو دنیادایە.

کەواتە برای بەڕێزی خۆم ڕاپەڕین و دەرچوون بۆ ئاگادارکردنەوە و بانگەواز (الدعوة) جیهاد نییە، قیتال نییە، جیهاد واتە قیتال. (في سبيل الله) زاراوەیەکی خواییە، زاراوەیەکی شەرعییە، خوای پەروەردگار گوفتاری پیّ کردووە و پێغەمبەری ئیسلام ﷺ ئەندازەی داناوە و شیکردووەتەوە، مەبەستی (قتال)ە، چەند بارەی دەکەمەوە و دەڵێم: (الجهاد) واتە (قتال)، (فی سبیل الله) واتە (قتال).

## بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە جیهاد واتە قیتال

بەڵگەش ئەوەیە کە : (سئل رسول الله ﷺ ماذا يعدل أجر المجاهد؟ قال: لا تستطيعونه، ثم قال: هل تستطيع إذا دخلت مسجد أن تقوم فلا تفتر، أو تصوم فلا تفطر، قالوا: من يستطيع؟ قال: فذلك أجر المجاهد، مثل المجاهد في سبيل الله كمثل الصائم القائم القانت لا يفتر عن صيام أو قيام حتى يرجع المجاهد). والحديث في البخاري، واتە: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا چی هەیە بگات بە پاداشتی موجاهید؟ فەرمووی ناتوانن ئەو شتە بکەن، لە تواناتاندا نییە، پرسیاریان کرد چیی هەیە یەکسان بێت وەك پاداشتی موجاهید؟ فەرمووی: ئەو شتە ناتوانن، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا تۆ دەتوانیت ئەگەر چوویتە ناو مزگەوتەوە بوەستیت بۆ نوێژ و هیچ سست نەبیت یان بەردەوام بەرۆژوو بیت و نەیشکێنی (خواردەمەنی نەخۆی) ئەوانیش وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کێ دەتوانێت؟ ئەویش فەرمووی: دەی ئەوە پاداشتی موجاهیدە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نموونەی موجاهید لە پێناوی خوادا هەروەك نموونەی

**بەرۆژوو و نوێژکەر زۆر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوایە کە بەشێوەیەك سست نەبێت لە رۆژووەکەی یان نوێژەکەی هەتاکو ئەو موجاهیدە بگەڕێتەوە.**[1]

[کەواتە ئەم فەرموودە و چەندین فەرموودەی تر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە جیهاد واتە (قتال)]، **باشە ئێمە ئەگەر هاتین و جیهادمان شیی کردەوە، بەوەی کە جیهاد بریتییە لە جیهادی دەروونی، باشە ئایا رۆژوو گرتن جیهادی نەفس نییە، ئایا نوێژکردن جیهادی نەفس نییە؟ ئەی باشە لەبەرچی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڕاستی پاداشتی موجاهید ئێوە لە تواناتاندا نییە! کەواتە غەیری ئەو کەسەیە کە رۆژوو دەگرێت و نوێژ دەکات لە پاداشتدا،** [چونکە نوێژ پاداشتی خۆی هەیە و جیهادیش پاداشتی خۆی هەیە، ئەگەر وشەی جیهاد لە زاراوەی شەرعیدا بریتی بێت لە هەموو تێکۆشانێك ئایا نوێژ و رۆژوو تێکۆشان نییە؟] **کەواتە جیهاد واتە شەڕ، موجاهید واتە بکوژ لە پێناوی خوادا، چونکە ئەمە گوفتاری کەس نییە زاراوەی شەرعییە، بەڕاستی هەروەکو نوێژ وایە (الصلاة) بەهیچ شێوەیەك یاری پێکردنی ڕەوا نییە، چونکە (الصلاة) لە زمانەوانیدا واتە پاڕانەوە (الدعاء)، بەڵام لە زاراوەی شەرعییدا مانا و مەبەستەکەی بریتییە لە وەستان، کڕنووش، رکوع، خوێندنی فاتیحە بە شێوەیەکی دیاری کراو کە پێغەمبەری خوا ﷺ دیاری کردووە.**

**باشە لێرەدا پرسیارێك دەکەین: ئایا ئەگەر کاتی نیوەڕۆ بوو یەکێك هاتو بە جوانی پاڕایەوە پاشان وتی: من نوێژم کرد، چونکە نوێژ لە زمانی عەرەبیدا واتە پاڕانەوە، ئایا خوای گەورە ئەمەی لێ وەردەگرێت؟ بێگومان نەخێر، چونکە ئەگەر هەرشتێك لە زاراوەی شەرعیدا گۆڕا ئەوە خوای گەورە وەریناگرێت، دەی نوێژیش**

---

[1] مەبەستی فەرموودەکە وایە ئەگەر یەکێك توانی لەو کاتەی کە موجاهید دەڕوات بۆ جیهاد ئەمیش بڕواتە ناو مزگەوت و بەردەوام بە رۆژوو بێت و نوێژ بکات هەتاکو موجاهیدەکە بگەڕێتەوە ئەوە دەگاتە پاداشتی موجاهید، ئیتر ئایا ئەو موجاهیدە ساڵێکی پێ دەچێ یان دوو ساڵ یان دە ساڵ دەبێ هەر بەردەوام بێت لە نوێژ و رۆژووگرتن، بێگومان کام کەس کە زۆر لەخواترسە هەر سێ رۆژ دەتوانێت بەسەریەکەوە بەرۆژوو بێت ئیتر پەکی دەکەوێت...

**زاراوەیەکی شەرعیە و مەبەستی ئەو فەرمانانەیە کە هەموومان دەیزانین** [بە پاڕانەوەش لەسەرمان ناکەوێت].

**بەهەمان شێوە ڕۆژوو زاراوەیەکی شەرعییە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەندازەکەی لە شەرعدا داناوە کە بریتییە لە وازهێنان لە خواردەمەنی و خواردنەوە و کۆبوونەوەی ژن و مێرد لە هەڵکەوتنی فەجردا هەتاکو ئاوابوونی خۆر، ئەمە لە زاراوەی شەرعیدا بەم شێوەیەیە، بەڵام لە زمانی عەرەبیدا واتە خۆگرتنەوە، باشە ئەگەر یەکێك هات و خۆی لە قسەکردن گرتەوە (قسەی نەکرد) پاشان وتی من بە ڕۆژوو بووم ئایا ئەمەی لێوەردەگیرێت؟!! بێگومان نەخێر، چونکە ئەمە یاری بە زاراوەی شەرعی دەکات ئەو زاراوەیەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەندازەی داناوە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لە خۆیەوە قسە ناکات، بێگومان سروشتی خوایی لەگەڵدایە.**[1]

[برای بەڕێزم، جیهادیش هەر بەم چەشنە لە زمانی عەرەبیدا لە (جُهدَ) یان (جَهَدَ)ەوە هاتووە، واتە تێکۆشانی کرد، ئیتر ئەم تێکۆشانە هەموو شتێ دەگرێتەوە، بەڵام لە زاراوەی شەرعیدا واتە: "بذل الوسع والطاقة في قتال الكفار"].

**برای بەڕێزم جیهادیش زاراوەیەکی شەرعییە، جیهاد هەروەکو نوێژ و ڕۆژوو وایە وەك زەکات و سەردانی ماڵی خوا وایە، هەروەها ماناو مەبەستێکی دیاری کراوی هەیە، ئەندازە بۆ کێشراوی هەیە، کە خوای گەورە دیاری کردووە و ئەندازەی بۆ کێشاوە بەهیچ شێوەیەك یاری کردن تێیدا جائیز نییە،** [هەموو ئارەزوو بەکارهێنان تێیدا ڕەوا نییە بەهیچ شێوەیەك جائیز نییە لە ئیسلامدا مانای جیهاد لە شتێکی تردا بەکاربهێنی]، **چونکە جیهاد واتە: شەڕو کوشتار لە پێناوی ڕێگەی خوا، بەڵام گوفتاری کۆمەڵێ خەڵکی گومان دروستکەر کە دەڵێن پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (رجعنا من الجهاد الاصغر إلى الجهاد الأكبر) واتە: گەڕاینەوە لە جیهادی بچکۆلە بۆ**

---

[1] هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ ﴾ (الشعراء: ١٩٣ – ١٩٥).

**جیهادی گەورە.**[١] **ئەوە فەرموودەیەکی هەڵبەستراوە بەدەم پێغەمبەرەوە ﷺ، واتە گوللەهاوەن و تۆپ و تەیارە بارین بەسەردا جیهادی بچکۆلەیە، بەڵام دانیشتن و قسەی زرق و برق کردن و** [گۆشت خواردن و دانیشتن لەلای ژندا] **جیهادی گەورەیە؟ توخوا ئەمە ڕەوایە؟** [ئەمە پەروەردگاری جیهانیان پێی ڕازییە؟ بریندداربوون و کوژران و سوتان پێی دەوترێت جیهادی بچووك؟!! بەڵام خەوتن و خواردن و خواردنەوە و دەرس خوێندن جیهادی گەورەیە؟!!] **وە تۆ لە ماڵی خۆتاندا بە دەمدا پاڵ کەوتووی ئەمە جیهادی گەورەیە؟ ئایا ئەمە ڕاستە... ئەمە هۆش و هەست وەری دەگرێت؟ ئەمە مەعقولە؟ توخوا ئەمە ڕاستە بڵێی ئەمە جیهادی بچکۆلەیەو ئەوەیش جیهادی گەورەیە؟! قەسەم بەخوا ئەمە راست نییە، قەسەم بە (لا اله الا الله) ئەمە ڕێك نییە، قەسەم بە خوا ئەوانە درۆزنن، درۆ بە دەم خوا و پێغەمبەری خواوە ﷺ دەکەن، ئەمەش فەرموودەیەکی هەڵبەستراوە و هیچ بناغەیەکی نییە، نە پێغەمبەر ﷺ و نە یارەکانی شتی وایان نەوتووە، بەڵکو ئەمە وتەیەکە لە یەکێك لە تابیعینەوە نەقڵ کراوە، قسەکەشی تەواو نییە و نازانم بە چ شێوەیەك ئەمە جیهادی بچکۆلەیە و ئەوەش جیهادی گەورەیە؟!**

**ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ زاراوە شەرعییەکە، جیهاد بریتییە لە شەڕ و کوشتار، ئەی برای خۆم لەکاتێکدا خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ تِجَـٰرَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿١٠﴾ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ **(الصف: ١٠ – ١١) واتە: ئایا ئەی موسڵمانان هەڵتان بنێم و ڕێتان پێ نیشان بدەم بۆ بازرگانییەك کە لە سزای ناڕەحەت ڕزگارتان دەکات کە ئەو بازرگانیەش بریتییە لەوەی باوەڕ بهێنن بە خوا و نێردراوەکەی و جیهاد و کوشتار**

---

[١] مەبەست ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ شەڕ و کوشتارەکەی بە بچووك داناوە، بەڵام گەڕانەوە بۆ زانیاری و دانیشتن بە جیهادی گەورەی داناوە و پێغەمبەر ﷺ هەردووکیشی ناوناوە جیهاد، بەڵام ئەم فەرموودەیە، فەرموودەیەکی هەڵبەستراوە بەدەم پێغەمبەرەوە ﷺ.

بکەن لە ڕێگەی خوادا بە ماڵ و گیانتان، لە کاتێکدا کە خوای گەورە دەفەرموێت: (وَتُجَٰهِدُونَ) ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە ڕۆژوو دەگرن؟!! مانای ئەوەیە نوێژ دەکەن، (وَتُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ) مانای ئەوەیە شەونوێژ دەکەن؟!! شەو هەڵدەستیت؟! پەروەردگار دەفەرموێت: (وَتُجَٰهِدُونَ) واتە: (تقاتلون) مەبەستی شەڕو کوشتارە...

کەواتە ئەم زاراوەیە کە جیهادە، فەرزە کە دەبێت زۆر ڕوون و ئاشکرا بێت و تەواو بێت و هیچ تۆز و خۆڵێکی بەسەرەوە نەبێت، کەواتە یەکەم شت ئەوەیە کە تێ بگەین جیهاد کردن فەرزی ژیانە، فەرزی تەمەنە، بەهیچ شێوەیەك بەسەر موسڵمانانەوە ناکەوێ، مەگەر لە کاتێکدا نەبێت کە گیانی ئینسان دەردەچێت یان نەخۆشی دای دەنیشێنی، یان کوێر یان شەل هەتاکو تەنانەت شەلیش چاوپۆشی لێ ناکرێت لەوەی کە بێت و هێزی موسڵمانان زۆر بکات، وە کەرەستەی جەنگ و خواردەمەنییەکەیان بپارێزێت، وە نەخۆشیش بە هەمانشێوە.[1] ئەوە سەعیدی کوڕی موسەیب (خوای لێ ڕازی بێت) دەرچوو بۆ جیهاد لەکاتێکدا کە زۆر پیر ببوو و چووبووە ساڵەوە، یەکێك لە چاوەکانی کوێر بوو، خوای لێ ڕازی بێت زاناترین مرۆڤی سەرزەوی بوو لە کاتی خۆیدا (سيد التابعين)، بەڵێ ئەو زانا بەڕێزە کە پیر و کوێر بوو پێی وترا: تۆ بۆچی دێی بۆ شەڕ، تۆ نەخۆشی؟ ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: خوای گەورە داوای ڕاپەڕینی کردووە لە پیرو گەنج لە لەشساغ و نەخۆش (الخفيف والثقيل) من هەردێم... خۆ ئەگەرهاتو نەشتوانم شەڕ بکەم ئەوا ژمارەی سوپاکە زۆر دەکەم، چونکە ئەگەر موشریکەکان ئەندازەی سوپاکە بە زۆر ببینن، ئەوە دەترسێن، وە من کەرەستە و خواردەمەنی موجاهیدەکان دەپارێزم... ئیمامی تەبەری دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: میقدادی کوڕی ئەسوەد لە تابیعین بوو لەبەردەم دوکانێکدا بوو لە شاری (حیمص)دا، دەیویست بچێت بۆ جیهاد،

---

[1] واتە: با نەخۆشیش بێت، با شەلیش بێت هەر باشتر وایە بێت بۆ جیبهادەکە، چونکە سوپای موسڵمانان زۆر دەکەن و کەرەستەکانیان دەپارێزن. ـ والله أعلم ـ.

خستبوویانه ناو تابوتێکەوه گۆشتی لاشەکەی لە تابوتەکەوە دەرچووبوو، چونکە لەکۆتایی تەمەنیدا زۆر زۆر قەڵەو بوو بە شێوەیەك نەیدەتوانی ڕێگە بکات، پێیان وت: ئایا ئەوە بۆچی ئەمساڵ دانانیشی؟ بۆ ئەم ساڵ ناحەوێیتەوە؟ ئایا تۆ بڵێیت وەڵامی مقداد چ بێت؟ تۆ بڵێیت ئیتر دەرنەچێت؟ نەخێر، لەوەڵامدا فەرمووی: بەڕاستی سورەتی (التوبه) ڕازی نابیّ دانیشم.

[بەڵێ ئەو زانا بەڕێزە بەو چەشنە لە جیهاد تێگەیشتووە]. ئەبوتەڵحە (خوای لیّ ڕازی بێت) ئایەتی: ﴿ ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا ﴾ ی خوێندەوە و فەرمووی: بەڕاستی ئەم ئایەتە پیر و گەنج دەگرێتەوە، بەڕاستی خوای گەورە عوزرو بیانووی کەس نابیستێت و قبوڵی ناکات، پاشان فەرمووی: ئەی منداڵەکانم کەرەستەی جیهادم بۆ ئامادە بکەن، وڵاخەکەم بۆ ئامادە بکەن، کوڕەکانیش وتیان: ئەی باوکی خۆشەویستمان بەڕاستی تۆ جیهادت لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کرد، هەتا کۆچی دوایی کرد، وە لەگەڵ ئەبوبەکردا (خوای لیّ ڕازی بێت) جیهادت کرد هەتا کۆچی دوایی کرد، بەهەمان شێوە لەگەڵ عومەریشدا جیهادت کرد، بەڵام ئێستا پیر بوویت، ئێمە لە باتی تۆ ئەڕۆین ڕائەپەڕین، فەرمووی: خوای گەورە عوزرو بیانووی هیچ کەسێك نابیستیّ و وەرناگرێت، کەرەستەم بۆ ئامادە بکەن، کەرەستەکەیان بۆ ئامادەکرد و لەناو دەریادا جیهادی کرد (خوای لیّ ڕازی بێت)، پاشان لەناو دەریادا لە کەشتییدا کۆچی دوایی کرد، ئەو یارە خۆشەویستەی پێغەمبەر ﷺ (٧) ڕۆژ لاشەکەی مایەوە گۆڕێکیان دەست نەکەوت، شوێنێکی وشکیان دەست نەکەوت تێیدا بینێژن. کە لاشەکەشی ئەوەندە نەرم بوو وەك ئاوریشم وابوو هیچ نەگۆڕابوو... حەوت ڕۆژ!!! بەڵێ لە ڕێگەی خوادا کۆچی دوایی کرد، بەڕاستی شەهیدە، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویّ: (من وضع رجله في الركاب فاصلا فوقصته دابته فمات، أو لدغته هامة فمات، او مات بأي حتف مات فهو شهيد). (حديث صحيح) واتە: هەرکەسێك قاچی دانا بەسەر وڵاخەکەیەوە بۆ جیهاد، یان بەسەر بارەوە، ئەگەر وڵاخەکەی خستیە خوارەوە یان مار و مێروویەك گەستی و

**مرد، یان بە هەر هۆیەکەوە مرد ئەوە شەهیدە. بەڵێ لەبەرئەوەی تۆ موجاهیدیت ئیتر بە هەر هۆیەك گیانت دەرچێت هەر پلەی شەهیدیت هەیە، سەیارە دەکەوێت بەسەرتدا، هەڵدەگەڕێی و دەمری، مار دەتگەزێت، دووپشك پێتەوە ئەدات، لەهەر شوێنێك دەمریت بمرە تۆ شەهیدی، موجاهیدێك فیشەکی لەدەست دەرچێت و بتکوژێت، شیوعییەك بتکوژێت، دووڕوویەك بتکوژێت، دەمرێت بە هۆی سووتانەوە، بەهۆی خنکانەوە، بەهۆی نەخۆشییەوە، بمرە لەهەر شوێنێکدا دەمریت ئەوە تۆ شەهیدیت، هەروەك پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: باشە ئەگەر پلەی تۆ بەم شێوەیە بێت ئایا ماڵی خۆتان باشتر و گەورەترە لە ئەمە، لەم شوێنە بەفەڕە؟! بەڵێ بە هەرچی دەمریت تۆ شەهیدیت، بەڵام بەیەك مەرج ئەوەیە کە ئەو نیەتە پاکەی هەتە هەر بمێنێتەوە بە دامەزراوی لەناوخۆدا لەسەر بەردەوام بوونی جیهاد، نیازەکەت دەبێت نەگۆڕی، ئەگەر تۆ بگەڕێیتەوە سەردانی خێزانەکەت بکەیت، بۆ ئەوەی دەروونت بحەوێتەوە، بۆ ئەوەی خزم و کەس‌وکارت بەسەر بکەیتەوە، بۆ ئەوە چالاکی لەش تازە بکەیتەوە، ویستی خوا وابوو لەوێ تەیارەیەك کەوتە خوارەوە، قەسفی کرد و مردیت، یان لە ماڵەوە تووشی نەخۆشییەك بوویت و لەوێ مردیت ئەوە تۆ هەر شەهیدیت، لەبەرئەوە نیازەکە دامەزراوە،** [الله اکبر، خوایە گیان شەهادەتمان پێ ببەخشە و بەنسیبمانی بکە].

**مژدە بێت ئەی شێخ تەمیم، مژدە بێت ئەی شێخ تەمیم، قەسەم بەخوا خوای گەورەت قەت رووزەردت ناکات إن شاء الله بە ویستی خوا هیوامان بە خوا هەیە، هیوامان هەیە و داوا دەکەین لە پەروەردگار کە جێگیرمان بکات،** [هیوادارین خوای گەورە و میهرەبان بمانکات بەم موجاهیدانەی کە هەردەم بەردەوام بن، خوایە گیان ئێمە زۆر لاوازین، هیوامان وایە کە جێگیر و ئارامممان بکەیت، خۆشی و لەزەتی دنیا کارمان تێ نەکات، هەتاکو بەڕووسووری بە بەهەشتی نەبڕاوە شاد بین، إن شاء الله].

**بەڕاستی ئێمە لە کاتێکدا کە موسڵمانان بانگ دەکەین بۆ جیهاد یەکەم مەبەستمانە کە لە ئاگر ڕزگاریان بکەین... دەمانەوێت دەربازیان بکەین، ئەوەتا خوای گەورە**

**دەفەرموێت:** ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ قَالُوا۟ فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ قَالُوٓا۟ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُوا۟ فِيهَا ۚ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴾ **النساء:** ٩٧

**ئیمام بوخاری له ئیبنو عەباسەوە دەیگێڕێتەوە کە ئەم ئایەتە دابەزی لەسەر ئەو موسڵمانانەی کە لە مەککەدا بوون، ئەوانەی کە کۆچیان نەکرد بۆ مەدینە لەبەر پاراستنی دارایی و ماڵەکەیان و بەرژەوەندییەکەیان، وە لە رۆژی بەدردا لەگەڵ کافرەکان دەرچوون بەهۆی ترس و شەرمەوە لە موشریکەکان، لەبەرئەوەی پێیان نەڵێن ترسنۆکن، ئەوەبوو هەندێکیان لە شەڕەکەدا بەدەستی موسڵمانان کوژران یارەکانی پێغەمبەر ﷺ زۆر پەشیمان بوونەوە زۆر بێ تاقەت بوون، ئەوەبوو وتیان برا موسڵمان و ئیماندارەکانمان کوشت، ئەوانەی کە لە مەککە مابوونەوە** [دەترسان لەوەی خوێنی موسڵمان هاتبێتە گەردنیان] **خوای گەورەش دەستبەجێ ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە، واتە: ئەو موسڵمانانەی کە کۆچیان نەکرد و کوژران شوێن و مەنزڵگایان ئاگری دۆزەخە کە ناخۆشترین و پیسترین شوێنە، جا ئەگەر ئەم کۆمەڵە موسڵمانەی کە مشتیان کردبوو بە دینەکەیاندا وەك مشت بە پشکۆدا بکەن، ئەگەر ئەم کۆمەڵە چوونە ناو ئاگرەوە لەبەرئەوەی کۆچیان نەکرد، لەبەرئەوەی دەرچوون بۆ بەدر لەبەر شەرم و ترسی قوڕەیش، سوپای بێ باوەڕەکانیان زۆر کرد، ئەگەر ئەمانە چوون بۆ دۆزەخ، ئەی چی دەڵێیت لەگەڵ هەزاران موسڵماندا کە دانیشتوون؟!! ئەی چی دەڵێیت لەگەڵ ملیۆنەها موسڵمانی لاوازکراو لەژێر ئاگر و گڕی کۆیلەیدان، ئایا لە قیامەتدا دەڵێن بە پەروەردگاریان ئێمە نەمانتوانی بجوڵێین لە ترسدا، یان دەڵێن نەمانئەتوانی دەرچین بۆ جیهاد و کۆچ بکەین لەبەرئەوەی سەرۆکەکەمان بەرهەڵستی دەکرد؟! ئایا چ موسڵمانێك هەیە لەو ملیۆنەها موسڵمانەی کە جیهاد ناکەن، دەتوانێت کە ناموسی خۆی بپارێزێت، ئەگەر لە یوەی شەوداو لە تاریکایی شەودا لەناو ماڵەکەی خۆیدا دەستدرێژیی بۆ کرا؟!!**

**ئەگەر پیاوانی دەوڵەت لە نیوەی شەودا دەستی کچەکەیان گرت و بردیان، کێ هەیە بڵێ نایەڵم بیبەن؟!! وەڵاممان بدەنەوە؟ ئایا دەتوانێت هەر بەو ئاسانییە بەرهەڵستکاری دەوڵەت بکات؟ بێگومان نەخێر، کێ هەیە بتوانێت بەرهەڵستی بکات لە دەوڵەت کە کچەکەی بەرن بۆ سەربازی لە هەندێ شوێندا؟! کێ هەیە بتوانێت ئەمڕۆ کە بیروباوەڕی خۆی بپارێزێت، یان ناموسی خۆی یان دارایی لە زۆربەی شوێنەکانی ئەمڕۆی جیهاندا و جیهانی ئیسلامیدا؟!! بەڵێ ئەم کۆمەڵە موسڵمانە دانیشتووەش ئەگەر فریشتەکان پرسیاریان لێ کردن ئایا ئێوە چیتان دەکرد، بۆ کۆچتان نەکرد؟ چی وەڵام دەدەنەوە بێجگە لەوەی کە دەڵێن:** (كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي ٱلْأَرْضِ ) [دەتوانن چی وەڵامی فریشتەکانی خوا بدەنەوە] **غەیری ئەو وەڵامەی کە موسڵمانەکانی مەککە دایانەوە؟!**

**بەڕاستی ئەی موسڵمانان چەند بارە پێتان دەڵێمەوە کە ئیشەکە ئیشێکی زۆر گرنگە، گاڵتەی تێدا نییە، بەڕاستی ئێمە ئەمڕۆ موسڵمانان بانگ دەکەین بۆ جیهاد دەمانەوێت کە لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاریان بکەین، ئێمە بانگی موسڵمانان دەکەین بۆ جیهاد لەبەرئەوەی بێ باوەڕیی لەسەر زەویدا بڵاونەبێتەوە، چونکە ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ﴾ (الأنفال: ٣٩) **واتە: ئەو بێ باوەڕانە بکوژن، هەتاکو شیرك نەمێنێت، هەتاکو یاساو دین هەمووی بۆ خوای میهرەبان بێت،** [لەم کاتەدا خوای پەروەردگار نەمانی شیرکی بەستووە بە جیهادەوە، چونکە ئەگەر هێزی چەکداری ئیسلام نەما ئیتر کافران ئایدۆلۆژیای خۆیان بە ئاسانی بڵاودەکەنەوە].

## بۆچی موسڵمانان بانگ دەکەین؟!

**ئێمە خەڵکی بانگ دەکەین بۆ (قتال) هەتاکو دەستی بێ باوەڕیی بەسەرمانەوە بەرز بێتەوە و نەمێنێ، ئەو دەستەی کە کردوویتی بە زەلیل، لە هەموو شوێنێك، ئەو دەستەی کە داوای بەندایەتیمان لێ دەکات بۆ غەیری خوای میهرەبان، وە دەستی بێ باوەڕان لا ناچی بەسەرمانەوە هەتاوەکو خوێن نەڕژێت، دەستی دوژمنانمان لە کۆیلەیەتی کردنمان لا ناچێ یان لە داگیرکردنی ولاتمان، مەگەر بە (قتال) نەبێت،** [چونکە بە جیهاد ئاگری ستەمکاران دەکوژێتەوە، چونکە بە جیهاد بەری لافاوی کافران دەگیرێ، چونکە بە هۆی جیهادەوە بێ ئابڕوویی موشریکەکان ڕامالّ دەکرێ]، **ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿ فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَۚ وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأۡسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ ﴾ **(النساء: ٨٤)**[١] **واتە: بکوژە لە ڕێگەی خوادا، داوات لێ ناکرێ بۆ جیهاد مەگەر لە دەروونی خۆت نەبێت، وە ئیماندارانیش هاندەو هەڵیان بنێ لەسەر جیهاد، ئومێد وایە خوای گەورە شەڕو خراپەی ئەوانەی بێ باوەڕان بکوژێنیتەوە،** [لێرەشدا خوای گەورە سڕینەوەی خراپەی بێ باوەڕانی بەستووە بە (قتال)ەوە]، **وە ئێمە موسڵمانان بانگ دەکەین بۆ قیتال، بۆ وەلامدانەوەی فەرمانی پەروەردگار کە دەفەرموێت:** ﴿ ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا ﴾ [کەواتە هەرکەسێك ئەمڕۆ موجاهید نییە و جیهاد ناکات، ئەوە وەلامی فەرمانی خوای گەورەی نەداوەتەوە، وە ئێمە بانگی موسڵمانان دەکەین بۆ قیتال لە ڕێگەی خوادا، بۆ ئەوەی بە ڕووزەردی نەمێنێتەوە لە دونیاو دواڕۆژدا، واتە جیهاد دەکەین بۆ ئەوەی تووشی ڕووزەردی دونیاو قیامەت نەبین]. **خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ إِلَّا تَنفِرُواْ يُعَذِّبۡكُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ ﴾ **التوبة: ٣٩واتە: ئەگەر ئێوە ڕانەپەڕن بۆ جیهاد ئەوە خوای گەورە سزاتان دەدات بە سزایەکی زۆر سەخت و بە ئازار، وە ئێوە دەگۆڕێ و لاتان دەبات و گەلێکی تر جگە لە ئێوە دەهێنێ،** [لەم ئایەتەدا خوای گەورە بڕیاری داوە ئەگەر موسڵمانان ڕانەپەڕن بۆ جیهاد ئەوە سێ جۆر سزایان بۆ بنێرێت:

---

[١] طبری ئەفەرموێت: هەموو وشەیەکی (عسى) کە بێژەرەکەی (الله) بێت ئەوە بۆ (تحقیق) و ڕاستی و حەتمیە. تەفسیری ڕامان، ل٢٠٨، چاپی دووەم (سەردار).

١ـ سەرشۆڕی و ڕووزەردی لە ژیانی دونیادا.

٢ـ سزاو ئاگر لە دوارۆژدا.

٣ـ لەناوبردنیان و هێنانی کۆمەڵێکی تر لە جیاتی ئەوان.

کەواتە هەرکەسێ جیهاد نەکات ئەوە لە سزای دونیاو قیامەت ڕزگاری نابێت، ناتوانێت جێنشینایەتی خوای گەورە بکات لەسەر زەویدا].

**ئێمە، موسڵمانان بانگ دەکەین بۆ قیتال لە ڕێگەی خوادا، بۆ لادانی ستەم و زوڵم لە ستەملێکراوان، بۆ لادانی ناهەمواری لەسەر چەوساوەکان لەسەر منداڵ و ژن و پەك کەوتووەکان، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴾ **النساء: ٧٥ واتە: ئەوە چییە بۆ ئێوە ئەی موسڵمانان شەڕو کوشتار ناکەن لە پێناوی خوادا و لە پێناوی ڕزگارکردنی چەوساوەکاندا، لە پیاوە پیرەکان و ئافرەتان و منداڵان، ئەوانەی کە دەڵێن: پەروەردگارمان دەرمانکە لەم لادێیە (مەککە) کە خەڵکەکەی زۆر ستەمکارن، پەروەردگار لەلایەن خۆتەوە بۆمان دابنێ و بۆمان بنێرە خۆشەویستێك،[1] پەروەردگارا لەلایەن خۆتەوە بۆمان بنێرە یارمەتیدەرێك و سەرخەرێك.**

[کەواتە ئەگەر بە وردی و صحابەئاسایی سەیری ئەم ئایەتە بکەین، ئەوە دەردەکەوێت کە جیهاد دەبێتە هۆی ڕزگارکردنی چەوساوەکان، دەبێتە هۆی دەرکردن و ڕووزەردکردن و ئابڕووبردنی زاڵمان، دەبێتە هۆی پاککردنەوەی وڵاتان لە ستەمکاران، بەڵام ئەگەر وازمان لە جیهاد هێنا ئەوە ئێمە بوینەتە هۆی خۆشکردنی کورسی ئارەزووپەرستان، ئیتر وڵاتمان دەبێتە مەڵبەندی خراپە و خراپەکاری، ئیتر وای لێ دێت موسڵمانان چاوترسێن دەبن کەس ناوێرێ لە ڕاستی بدوێ، بۆیە خوای میهرەبان بانگەوازی موسڵمانان دەکات و هەڵیان دەنێت بۆ ڕاپەڕین و جیهاد].

---

[1] ولی: هەروەك زانایان و مەفەسیرینی قورئان دەفەرموون: بە چەندین مانا و مەبەست هاتووە، وەك پاڵپشت، خۆشەویست، فەرماندە، قۆڵگیر، تکاکەر.

**ئێمە موسڵمانان بانگ دەکەین بۆ قیتال لە ڕێگەی خوادا هەتاکو بە ئیزن و یارمەتی خوا ڕایان کێشین بۆ بەهەشتی خوا، لەپێناوی بەدەستهێنانی پاداشتی گەورە** [چونکە ئەو پاداشتەی کە لە جیهاددا دەست دەکەوێت، لەهیچ پەرستشێکی تردا دەست ناکەوێت]، **بۆ ئەم مەبەستەش بەسە بۆ ئێمە کە تەنها فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ بزانین لەبارەی پاداشتی کۆچکردن و سەنگەرنشینی و شەڕکردن لە پێناوی خوادا، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ لەبارەی پاداشتو گەورەیی کۆچکردنەوە دەفەرموێت: (من وضع رجله في الركاب فاصلا فوقصته دابته فمات، أو لدغته هامة فمات، او مات بأي حتف مات فهو شهيد). واتە: هەر موسڵمانێك قاچی نایە سەر وڵاخەکەی و سەرکەوت، لەو کاتەدا وڵاخەکەی هەڵیدایە خوارەوە و مرد یان ئەگەر مار و مێروویەك گەستی و مرد، یان بە هەر ڕێگەیەکی تر مرد ئەوە شەهیدە.** [پێغەمبەری ئیسلام ﷺ لەم فەرموودەدا مەبەستی لەوەیە کە هەر موسڵمانێك ڕێگەی کۆچکردنی بۆ جیهاد گرتە بەر ئیتر بە هەر هۆکارێك بمرێت ئەوە هەر شەهیدە و پاداشتی خوا وەردەگرێت]، **لە ڕیوایەتێکی تری ئەم فەرموودەدا دەفەرموێت: (فقد استحق المآب)، واتە: ئەو موسڵمانە کۆچکەرە بەهەشتی بەدەستهێناوە،** [بەڵێ لە ڕوانگەی فەرموودەکانەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە پاداشتی کۆچکەر بۆ جیهاد چەند گەورەیە، ئەوەندە لای پەروەردگار بەڕێزە، تەنانەت بە هەر هۆکارێکی تر بمرێت ئەو هەر شەهیدە، ئەوە پاداشتی خۆی بە زیادەوە دەدرێتێ]، **لە ڕێگەی کۆچکردندا کۆچی یەکجاری بکات ئەوە بە دەقی قورئان پاداشتەکەی دەکەوێتە سەر پەروەردگاری، ئەوەتا خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت:** ﴿ وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ **النساء: ١٠٠ ئەم ئایەتە لەبارەی (ضمری کوڕی عیص)ەوە هاتە خوارەوە کە ئەم یارە بەڕێزەی پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی زۆر بە ساڵاچوو بوو، وە پیر بوو، بەڵام لە کاتێکدا کە ئەم ئایەتەی بیست لەبارەی هاندانی پەروەردگار بۆ کۆچکردن، هێشتا هەر لە شاری مەککە مابوویەوە و کۆچی نەکردبوو، جا ترسا ئەمیش لەو موسڵمانانە بژمێردرێ کە پێیان دەڵێن:** (فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ) **بۆیە ترسا فەرمووی: وڵاخەکەم بۆ گورج بکەنەوە و بۆم ئامادە بکەن، بەڕاستی خوا عوزر و بیانوو لە من وەرناگرێت... من ڕێگە**

**دەزانم، ڕێگەی کۆچکردن شارەزام، وە خوای پەروەردگار عوزرو بیانوو وەرناگرێت، مەگەر لە چەوساوەکان، ئەوانەی کە ناتوانن کۆچ بکەن لە پیاوانی پیر و ئافرەتان و منداڵان، ئەوانە کە نازانن فێڵ بدۆزنەوە بۆ دەربازبوونیان، ناتوانن ڕێگەیەك بدۆزنەوە و دەرچن بە جۆرێ کەس پێیان نەزانێ کەواتە وڵاخەکەم بۆ گورج بکەنەوە و ئامادەی بکەن ئەوانیش وڵاخەکەیان بۆ گورج کردەوە و ئامادەیان کرد و ڕێگەی کۆچکردنی گرتەبەر، بەڵام نەگەیشتە ناوچەی (التنعیم) کۆچی دوایی کرد و ماڵئاوایی کرد، ئیتر لەو کاتەدا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە:** ﴿ وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً ۚ وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ **(النساء: ١٠٠) واتە: هەرکەسێك کە کۆچ بکات لە ڕێگەی خوادا بۆ جیهاد ئەوە لە زەویدا دەستی دەکەوێت و دەیبینێ** (مُرَٰغَمًا )

[بەچەند جۆرێ تەفسیر کراوەتەوە:

ئیبن عەباس ئەفەرموێ: واتە بارکردن لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دی.

موجاهید دەفەرموێ: (مُرَٰغَمًا كَثِيرًا ) واتە ڕزگاربوون و دوورکەوتنەوە لەو شتەی کە پێی ناخۆشە.

ئیبن کەسیریش ئەفەرموێ: ئەوەی ئاشکرایە لەم ئایەتەدا ـ خواش چاکتر دەزانێ ـ ئەوەی کە بریتییە لەو شوێنەی کە کۆچکەرەکە تیایدا دەپارێزرێ و لوتی دوژمنانی پێ تۆزاوی دەکرێت، پاشان ئایەتەکە دەفەرموێ: (وَسَعَةً) ئیبن کەسیر دەفەرموێ: واتە ڕزق و ڕۆزی]، **پاشان خوای گەورە هەرکەسێك لە ماڵی خۆی دەربچێت بۆ کۆچکردن بۆ لای خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کەسە لە ڕێگەی کۆچەکەدا مردن ڕێی لێ گرت و کۆچی کرد ئەوە ئەو کۆچەرە پاداشتەکەی کەوتۆتە سەر پەروەردگار، بەڕاستی خوای گەورە لێبوردەی میهرەبانە.**[1] [بەڕاستی ڕێگەی کۆچکردن و دوورکەوتنەوە لە وڵات ڕێگەی هەموو پێغەمبەران بووە هەروەك ئیبراهیم و موسا و عیسا و زەکەریا (سەلامی

---

[1] ئیبن کەسیر لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێت: مەبەستی ئەم ئایەتە ئەوەیە کە هەرکەسێك لە ماڵی خۆی دەرچێت بە نیازی کۆچکردن بۆ جیهاد، پاشان لە کاتی برینی ڕێگەدا مرد ئەوە پاداشتی ئەو کەسەی کە کۆچەکەی بە یەکجاری کردووە دەستدەکەوێت. (مختصر تفسیر ابن کثیر، ص٤٢٨).

خوایان لەسەربێت) و ئەوانی ترە، وە ڕێگەی پێغەمبەری خواش بووە ﷺ ئەوەتا هەر لە یەکەم کاتەوە کە زانی بووە بە نێرراوی خوا یەکسەر موژدەی دەرکردنی لەلایەن خزمەکانیەوە پێ درابوو ئەوەبوو کاتێ کە لە ئەشکەوتی (حراء) هاتەوە و تووشی دڵەڕاوکێ بوو، وتی: دەترسم لە خۆم، بەڵام خەدیجە کە بردی بۆ لای وەرەقەی کوڕی نەوفەل کە پیاوێکی پیری نەصرانی بوو چاوی کوێر بوو بوو، شتەکەی تێگەیاند، پیاوەکەش لەبەرئەوەی شارەزای تەورات و ئینجیل بوو کە باسی پێغەمبەری ﷺ تێدا کرابوو پێی وت: مژدەدەت دەدەمێ تۆ نێرراوی خوای بۆ سەر ئەم ئوممەتە، ئەوەی لە ئەشکەوتەکەدا هات بۆ لات هەر ئەوەبوو کە هات بۆ لای موسا، بەڵام خۆزگە من گەنجێك بوومایە یارمەتی و قۆڵگیرییم بکردیتایە لەکاتێکدا کە خزمەکانت دەریان ئەکردی. پێغەمبەری خواش ﷺ زۆر سەری سوڕماو فەرمووی: (أو مخرجي هم؟)، ئایا ئەوان من دەردەکەن؟ وتی: هەرکەسێك پێش تۆ هاتبێ و ئەم بەرنامەی تۆی هێنابێ بێگومان دەرپەڕێنراوە.[1]

کەواتە ئەگەر ئێمەش بە گشتی و زانایان بەتایبەتی ڕێگەی ئەوان بگرینە بەر وەك خۆی باسی بکەین و فێڵی تێدا نەکەین، ئەوە بێگومان تاغوتانی سەردەم یان ئەمانگرن یان دەمانکوژین، یان شاربەدەرمان دەکەن، بەڵام نەك وەکو هەندێ بەناو زانایانی ئەمڕۆ کە هەموو هیواو ئامانجێکیان ئەوەیە کە بچن لە شارێ یان لادێیەکدا دابنیشن و خەڵکی بیانژیەنن و ئیتر شۆڕش کردن بەرامبەر تاغوتان بەهیچ شێوەیەك نایە بە هۆش و بیریاندا، ئەو کۆمەڵە بەناو زانا با چاك بزانن نە ئیسلام سوودیان لێ دەبینێ و نە سوودیش لە ئیسلام دەبینن].[2]

---

[1] الرحيق المختوم، لاپەڕە (٥٧)، صحيح البخاري/١، ٢، ٣. فقه السيره، لاپەڕە (٨٣).

[2] مەبەستم لە سوودی قیامەتییە، ئەگینا لە دونیادا لە ئیسلام سوود دەبینن و بەسەر ئیسلامەوە خۆیان دەژیەنن.

## گەورەیی پاداشتی سەنگەرنشینی

[لە سەرەتای ئەم پەڕاوەدا چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوامان ﷺ بە نموونە هێنایەوە لەبارەی پاداشتی سەنگەرنشینیەوە کە ئەو فەرموودانە مایەی ڕاچڵەکاندنی دەروونی مرۆڤی موسڵمانن، مایەی ئەوەن کە هەرکات موسڵمانان بینیان یەکسەر بێ سێ و دوو کردن بەرەو مەیدانی سەنگەرنشینی بکەونەڕێ، لێرەشدا هەروەك بیرخستنەوەیەك بەسە کە فەرموودەیەك بهێنینەوە] **فەرموودەیەك ئیمام حاکم بە سەحیحی داناوە و ئیمام (الذهبي) موافەقەی لەسەر کردووە، ئەویش ئەمەیە کە دەفەرموێت: (عن عثمان ـ رضي الله عنه ـ قال: قال رسول الله ﷺ : رباط يوم في سبيل الله خير من ألف يوم فيما سواه من المنازل يقام ليلها ويصام نهارها).[١] واتە: سەنگەرنشینی ڕۆژێك لە پێناوی خوادا خێرترو چاکترە لە هەزار ڕۆژ لە شوێنەکانی تر، کە ئەو شوێنانەشی شەوەکەی هەڵسێ شەونوێژ بکات و ڕۆژەکەی بە ڕۆژوو بێت، ڕۆژێك بە هەزار ڕۆژ، بەڵام ناو شەڕەکە ئەوە هەر نازانرێت خێرەکەی ئەوەندە زۆر و بەفەڕە مرۆڤی پاك سەری سوڕ ئەمێنێ، ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (قيام ساعة في الصف للقتال خير من قيام ستين سنة). واتە: وەستانی چرکەیەك یان سەعاتێك لە ڕیزدا بۆ شەڕکردن چاکتر و خێرترە لە نوێژکردنی شەست ساڵ،** [ئەمەیە فەڕو بەرەکەت، ئەمە ڕێزە، ئەمەیە چاکە کردن، ئەو کەسەی حەزی لە زیندووکردنەوەی سوننەتە ئێمە ناڵێین وازی لێ بهێنێ، بەڵام دەڵێین با بێت ئەم فەرزەش زیندوو بکەنەوە، نازانم چی بوو، کە وای کرد جیهاد لە دڵ و مێشکی موسڵماناندا شۆرایەوە؟ نازانم چ فێڵێك بوو بەهۆی سڕینەوەی (قتال) لە مێشکیاندا، نازانم تا کەی وامان لێ دێت کە وەك یارەکانی پێغەمبەر ﷺ لە پاداشت و گەورەیی جیهاد تێ بگەین؟] **ئەوەتا لە فەرموودەیەکی سەحیحدا هاتووە کە ئەبو هورەیرە خوای لێ ڕازی بێت ئەفەرموێ: من ئەگەر حەرەس بم یان سەنگەرنشینی بگرم لە مەیدانی ڕووبەڕووبوونەوەدا یەك شەو لە پێناوی ڕێگەی**

---

[١] سەیری پەڕاوی (صحيح الجامع الصغير) بکە، رقم ٤٤٢٩.

**خوادا ئەوە لام خۆشەویستترە لەوەی کە شەوی (لیله القدر) بمێنمەوە و نوێژ بکەم لەلای بەردە ڕەشەکەی ماڵی خوا.**[١]

[جا کەواتە ئەگەر ئێمەش دەمانەوێت تووشی خێر و چاکە بین، با بکەوینە ڕێ بەرەو مەیدانی جیهاد، بکشێین یان تەپوتۆزی خۆشەویستی دنیا بەسەر دڵەکانمانەوە ڕامالین، بەڵکو خوای گەورە بە میهرەبانی خۆی پلەی شەهادەتمان پێ ببەخشێ و بە بەهەشتی نەبڕاوە شادمان بکات، ئامین].

## ئیش و کاری بزووتنەوەی ئیسلامی

**ڕاستییەك هەیە دەبێ بزانرێ کە بە هیچ شێوەیەك وڵات و کیان و نرخێك دروست نابێت بۆ موسڵمانان بەبێ شەڕو جیهاد کردن، بەهیچ شێوەیەك ڕێك ناکەوێت و ناگونجێ ڕێگە بۆ دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی ڕاست و ڕەسەن، مەگەر لە ژێر سێبەری ئەنجامی جیهادێکی جەماوەری گشتییدا نەبێت، بەهیچ شێوەیەك بانگەواز ئەگەرچی ڕێك و تەواو بێت، ئەگەرچی بە بەرنامە و تێڕوانین بێت ئەندازە و شێوازی هەرچی بێت ئەو بانگەوازە، بە تەنها ناتوانێ دەوڵەتی ئیسلامی دابمەزرێنێ و بەڕێوەی بەرێ**، [چونکە ئەگەر بانگەوازێك هێز و توانایەکی چەکداری لەگەڵ دا نەبێت بیپارێزێ ئەوە هەر لە سەرەتاوە سست دەبێت و بە ئارەزوو دەستکاری دینەکە دەکرێت، بەڵێ خۆ ئێمە نالێین بانگەواز پێویست نییە]، **بەڵام بانگەواز تەنها بۆ ئەوەیە کە بیرو هۆشی ئوممەتی ئیسلامی جۆش بدرێت**، [بۆ ئەوەی موسڵمانان لە سروشتی دینەکەیان تێ بگەن، بۆ ئەوەی ئوممەتی ئیسلامی دڵو دەروونی ئامادەو باشی بێت بۆ بینینی ناڕەحەتییەکانی ژیان، بۆ ئەوەی دەروونی ئازاو چالاك و پەروەردە بێت].

---

[١] ئیمام حاکم ڕیوایەتی کردووە و دەفەرموێ: فەرموودەیەکی سەحیحە لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم. سەیری پەڕاوی (المنجر الرابع) بکە لە لاپەڕەی (٢٤٣)، بەهەمان شێوە لە ڕێوایەتێکدا هاتووە کە ئەمە فەرموودەی پێغەمبەری خواشە ﷺ.

**بەڵێ بەڕاستی بانگەوازی ئیسلامی بە هەورە گرمەیەك دادەنرێت كە غیرەت و توانای ئوممەتی ئیسلامی بگەیەنێت،** [بەڕاستی بانگەوازی ئیسلامی دەبێ بۆ ئەوە بێ كە كۆمەڵێكی چوست و چالاك پەروەردە بكرێت بۆ ڕۆژگاری جیهاد، نەك پەروەردەی بكەی و ئەوەی باسی نەكەی جیهاد بێت].

**بەڕاستی ئیش‌و كاری بانگەوازی ئیسلامی ئەوەیە كە خێرو چاكە جوڵە پێ بدات لەناو خودی دڵ و دەروونی ئوممەتی ئیسلامی،** [دەبێ بیخاتە بزووتنەوە و كاروانی ڕێگەی جیهاد و بەڕێی بخات، ئەمڕۆ بێ باوەڕی جیهانی هێرشی هێناوە، پێت خۆش بێت و پێت ناخۆش بێت كوفر بە ئێمە ڕازی نابێت، بەڵام نازانم هەتاكەی موسڵمانان لە خەوی بێ ئاگایی و تەمبەڵی و ترس بە خەبەر نایەن؟ بەڕاستی ئەمڕۆ شەڕی نێوان بێ باوەڕی و باوەڕ دەستی پێ كردووە، موسڵمانان نابێ خۆیان گێل بكەن ئەگەرهاتو خۆیان لەم جیهادە دواخست ئەوە بێگومان خوای گەورە روویان زەرد دەكات لە دنیاو قیامەتدا].

**ئەمڕۆ ئەم جیهادە پێویستی بە سوتەمەنی هەیە، سوتەمەنییەكەشی لاوانی خوێنگەرمی موسڵمانن داوا لە لاوە موسڵمانەكان دەكەین كە خۆیان بە كاروانی جیهاد بگەیەنن، چونكە بە ڕاستی لەناو كاروانەكەدا دەروونیان پاك دەبێتەوە و ڕۆح و گیان و دەروونیان خاوێن و روون دەبێت. دنیایان لا سووك و بێ ئەندازە ئەبێت** [ئارەزووە دەروونی و دنیاییەكانیان لا خامۆش دەبێ، قیامەتیان لا خۆشەویست دەبێ]**، وایان لێ دێ ئیتر ناكۆكی و دووبەرەكی لەسەر شتە بێ كەڵك و پوچەكان ناكەن،** [بەڕاستی نازانم بە چ شێوەیەك پێناسەی جیهاد بكەم، بەڕاستی جیهادی پیرۆز ئەو قوتابخانەیە بوو كە پیاوی وەكو (ئەبو تەڵحە)ی پەروەردە كرد چەندین پیاوی وەكو عەمماری پێگەیاندو ئارەزووە دەروونییەكانی لەبیر بردنەوە، كەواتە دەبێ ئێمە لەگەڵ بانگەوازەكەماندا موسڵمانانیش لەسەر جیهاد هان بدەین، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ حَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَى ٱلْقِتَالِ ﴾ (الأنفال: ٦٥) واتە: ئەی پێغەمبەر، باوەڕداران هاندە لەسەر شەڕ و جیهاد. سبحان الله، خوای گەورە دەفەرموێت خەڵك هان دەن كەچی خەڵك پەشیمان دەكەینەوە، بەڕاستی زۆر بە ئاشكراو ڕاشكاوی دەڵێم: نەكردنی

جیهاد سیفەتێکی زۆر ئاشکرای دووڕووان بووە هەر لە سەردەمی پێغەمبەرانەوە (علیهم السلام) هەتاکو سەردەمی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ جیهاد گەورەترین هۆکارێك بووە بۆ جیاکردنەوەی دووڕووان لە ڕاستگۆیان، ئەوەتا بە حەزرەتی موسایان دەگوت: ﴿ فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَـٰتِلَآ إِنَّا هَـٰهُنَا قَـٰعِدُونَ ﴾ (المائدە: ٢٤) واتە: ئەی موسا تۆ خۆت و پەروەردگارەکەت شەڕ بکەن ئێمە لێرە دانیشتووین، واتە ئێمە ناتوانین جیهاد بکەین و بە هەمان شێوە خوای گەورە لەبارەی دووڕووەکانەوە دەفەرموێت: ﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَـٰذِبِينَ ﴾ (التوبة: ٤٣) خوا لێت خۆش بووە ئەی پێغەمبەر ئەوە بۆچی ئیزنت دا بەو دووڕووانە بۆ دواکەوتنیان لە جیهاد هەتاکو لەناو جیهادەکەدا بۆت دەربکەوتایە ئەوانەی کە ڕاستیان کردووە و درۆزنانت بناسیایە؟ دەفەرموێت: ﴿ لَا يَسۡتَـٔۡذِنُكَ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ أَن يُجَـٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَا يَسۡتَـٔۡذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَٱرۡتَابَتۡ قُلُوبُهُمۡ فَهُمۡ فِي رَيۡبِهِمۡ يَتَرَدَّدُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾ (التوبة: ٤٤ — ٤٥)
واتە: ئیزن و یارمەتیت لێ ناخوازن بۆ نەچوون بۆ جیهاد ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە بە خوا و بە ڕۆژی دوایی، بەڕاستی خوا خۆی زۆر زانایە بە لەخواترسان، بەڵکو تەنها ئەوانە ئیزنت لێ دەخوازن بۆ نەکردنی جیهاد کە باوەڕ ناهێنن بە خوا و بە ڕۆژی قیامەت و دڵەکانیان تووشی دوودڵی و گومان بووە، بەڕاستی ئەوانە لەناو گومانەکەیاندا دێن و دەڕۆن، دەیدا بە گوێی هەموو موسڵماناندا کە هەرکەسێك جیهاد نەکات بەبێ عوزری شەرعی ئەوە مانای ئەوەیە کە باوەڕی بە پاداشتی خوای گەورە نییە، خوایە گیان ئێمە لەم جۆرە خەڵکانە نەگێڕیت، ئامین].

## دەرکەوتنی سەرکردەی هیوا پێکراو لەناو جیهاددا

**ئەوەی بۆم دەرکەوتووە و بە چاوی خۆم دیومە ئەوەیە: لە ئەنجامی ڕێ کردنی کاروانی بزووتنەوەی جیهادیدا قیادەی پاك دەردەکەوێت** [جیهاد دەبێتە هۆی دروستبوون و هەڵکەوتنی پیاوانی کەموێنە، ئەمەش کە دەیڵێم هەر قسە نییە و بەس، بەڵکو مێژوو پەڕاوەکانی گەواهی دەدەن لەسەر ئەم ڕاستییە، چونکە بەڕاستی بە هۆی ئەو جیهادەی کە ڕابورد لەپێشدا زۆر قیادەی بەرز و بەڕێز دەرکەوت]، **بەڕاستی ئەبوبەکر و عوسمان و عەلی (خوایان لێ ڕازی بێت) بانگەوازی هەڵبژاردن و تەلەفزیۆن دەری نەخستن و دروستی نەکردن، بەڕاستی جیهادەکەیان دروستی کردن و پێی گەیاندن، ئازایەتی و غیرەتەکەیان پێی گەیاندن، دڵپاکی و خۆنەویستییەکەیان پێی گەیاندن، ئەو جموجوڵ و بزووتنەوە دوور و درێژەیان پێی گەیاندن لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ و دروستی کردن و کردنی بە قیادە.**

[بەڵێ لەبەر ئەمە بوو کە لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کردو لەناو یارەکانیدا ماڵئاوایی دەکرد، ئوممەتی ئیسلامی هەموو بەجارێ وەستاو ئەم پرسیارە بە مێشکیدا دەهات، ئایا کێ دەبێ هەستێ بەم ئیشە گرانە؟ بۆ کەس دەرنەکەوت کە بتوانێت ئەو دەورە وەك خۆی ببینێت غەیری ئەبوبەکر، ئەوەبوو یەکسەر بێ سێ و دوو کردن بە گشتی پەیمانیان پێدا، ئەوەبوو صدیقی ئەکرەمیش توانی بەرگەی ئەو هەموو کارەساتانە بگرێت کە لە سەرەتادا ڕووبەڕووبوونەوە، بەڵام ئایا چی بوو وای کرد لە ئەبوبەکر (خوای لێ ڕازی بێت)؟ بەڕاستی ڕۆژانی کۆچ کردن بوو، شەوانی کۆچ کردن بوو، شەڕی بەدر و خەندەق و ئوحود و بەنوقەینوقاع و بەنی قورەیزە و بەنی نەزیر بوو، بەڕاستی شەڕی خەیبەر و تەبوك و فەتحی مەککە و شەڕی موئتە بوو، ئەم شەڕو جیهادە بوو ئەبوبەکری تێگەیاند و پێی گەیاند، ئەگینا ئەگەر ئەبوبەکریش لە ماڵی خۆیدا دانیشتایە و بۆ خۆی بانگەوازی بکردایە بیگوتایە جارێ کاتی کۆچ کردن و جیهاد نەهاتووە، چۆن دەیتوانی بەو شێوە جێنشینایەتی پێغەمبەر ﷺ بکات؟ چۆن دەیتوانی بەوپەڕی ئازایەتی و لێ هاتنەوە ڕووبەڕووی ئەو هەموو ڕوداوە بێتەوە، چۆن دەیتوانی شەڕی (ردە) بەرپا بکات لەسەر نەدانی زەکات؟ کۆمەڵگەی

پێغەمبەر ﷺ بەو چەشنە بوون بۆیە بوون بە قیادە و شوان و مشوورخۆری هەموو جیهان]، بەڵام کۆمەڵگەیەکی وەستاو و سست و تەمەڵ و ترسنۆك کە جیهاد و بزووتنەوەی تێدا نەبوو، نازانم چۆن پیاوانی بەڕێزو فەرماندەی تێدا هەڵدەکەوێت؟! ئینسانێك هەموو هیوا و ئامانجێکی قسەی زل کردن بێت یان پارەیەکی زۆری پێ بێت، ئایا دەتوانێت بێت بە فەرماندە و مشورخۆری موسڵمانان؟! بێگومان نەخێر... لەبەرئەوە بزووتنەوەیەکی جیهادی دوورو درێژ زۆر زۆر پێویستە بۆ دەرکەوتن و پێگەیاندنی قیادەکان و بێگومان ئەو قیادانەی کە لەناو جیهاد و لە ئەنجامی شەڕو جیهاددا دروست دەبن بەهیچ شێوەیەك ئوممەتی ئیسلامی گومانیان لێ ناکەن، [بەڵکو وەکو کوپە زێڕو ئەڵماس سەیری دەکرێت]، کەواتە ئەی موسڵمانانی جیهان لەبەر ئەمە زۆر زۆر پێویستە کاروانێکی جیهادی بەهێز بەڕێ بخرێت.... وە بێگومان دەوڵەتی ئیسلامی بەرپا نابێت مەگەر لە ئەنجامی کاروانێکی بەهێز و پێزی جیهاددا نەبێت، بەڕاستی ئەوانەی کە چاوەڕوانی دروستی بوونی کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی دەکەن بەبێ جیهادو خوێن ڕشتن... ئەوانە لە سروشتی کۆمەڵگەکان بە تەواوی تێنەگەیشتوون، چونکە کۆمەڵگەیەك ئەگەر تێکۆشانی کرد و خوێنی بەخشی لەپێناوی گەیشتن بە دەوڵەتێکی ئیسلامی ئەوە ئەگەر دەوڵەتەکەی پێکهێنا بەو جۆرە دوژمنان ناتوانن بە ئاسانی لێیان بسێننەوە، بەڵام ئەگەر وانەبوو ئەوە بێگومان دوژمنان بە ئاسانی دەریان دەپەڕێنن.[1]

---

[1] هەروەك شاعیرێك دەڵێت:

من اخذ البلاد بغير حرب    يهون عليه تسليم البلاد

واتە: هەرکەسێك شارەکانی گرت بەبێ شەڕو کوشتار ئەوە زۆر ئاسانیش دەبێ دان بەدەستەوەی شارەکان بە دوژمنەکەی.

**بۆ وەرگێڕانی ئەم پەڕاوە سوودم لەم کتێبانە وەرگرتووە:**

١ـ المنجد في اللغة.

٢ـ مختار الصحاح.

٣ـ نيل الاوطار.

٤ـ سبل السلام.

٥ـ فقه السنة.

٦ـ تەفسیری قورئانی پیرۆز.

٧ـ رياض الصالحين.

٨ـ الرحيق المختوم.

٩ـ فقه السيرة.

١٠ـ ژیانی پێغەمبەری مەزن ﷺ.

١١ـ صفوة التفاسير.

١٢ـ مختصر تفسير ابن كثير.

١٣ـ فتح المجيد.

١٤ـ الوجيز في أصول الفقه.

١٥ـ رجال حول الرسول.

١٦ـ بانگەوازێك بۆ كۆمەڵە ئیسلامییەكان.

١٧ـ بلوغ المرام.

١٨ـ العمدة في أعداد العدة.

١٩ـ مختصر شرح العقيدة الطحاوية.

٢٠ـ بگە بە كاروان.

## کورتەیەك لە ژیانی مامۆستای شەهید
## دکتۆر عبدالله عزام[1]

* ساڵی ١٩٤١ له دێی (سیلة الحارثیة) له (لواء جنین) له فەلەستین لەدایك بووه.

* پەیوەندی کردووه بە کۆلێژی شەریعەی زانکۆی دیمەشقەوە و ساڵی ١٩٦٦ بڕوانامەی (لیسانس)ی بە تەقدیری (زۆر باشه) وەرگرتووه، دواتر لە یەکێك لە دواناوەندییەکانی شاری عەممان بۆ ماوەیەك مامۆستا بووه.

* پەیوەندی بە (کتائب الإخوان المجاهدین)ەوە کردووە ساڵی ١٩٦٩، دوای ئەوەی کەناری خۆرئاواو مزگەوتی ئەقسا لەلایەن یەهودەوە دەستی بەسەردا گیرا، زۆر ناڕەحەت بووە بەوەی یەهود ببینێ بەو شێوە پیرۆزییەکانی موسڵمانان ژێر پێ دەکەن، بەڵام کارەساتەکانی (ئەیلولی ڕەش) لە نێوان فیداییە فەلەستینییەکان و سوپای ئەردەندا بووە هۆی ئەوەی نەتوانێ بەردەوامی بە جیهاد بدات لە فەلەستین.

* ساڵی ١٩٦٩ بڕوانامەی (ماجستێر) لە (أصول الفقه)دا وەرگرتووە بە تەقدیری (زۆر باشه).

* وەکو موحاضر لە کۆلێژی شەریعەی زانکۆی ئەردەن وانەی وتووەتەوە، پاشان نێرراوەتە قاهیرە بۆ وەرگرتنی بڕوانامەی دکتۆرا، لە ساڵی ١٩٧٣ بڕوانامەی دکتۆرای لە (أصول الفقه)دا وەرگرتووە. بە (مرتبة الشرف الأولی).

* ساڵی ١٩٧٣. ١٩٨٠ لە کۆلێژی شەریعەی زانکۆی ئەردەن مامۆستا بووه.

* ساڵی ١٩٨٠ بە بڕیارێکی حاکمی سەربازی گشتی ئەردەنی لەسەر کار لابراوە.

* ساڵی ١٩٨١ لە زانکۆی (الملك عبدالعزیز) لە (جدە) مامۆستایی کردووە.

* دواتر لە (الجامعة الإسلامیة العالمیة / إسلام آباد) ساڵی ١٩٨١ داوای کاری کردووە تا لە نزیکەوە ئاگای لە جیهادی ئەفغانی بێت.

---

[1] لە کتێبی (بگە بە کاروان) لە ئامادەکردنی (باوکی عبدالرحمن)، بە درێژتر لەسەر ژیانی (د. عبدالله عزام)مان نووسیوە. (سەردار).

* ساڵی ١٩٨٤ دەستی لەکارکێشاوەتەوەو لەگەڵ رێکخراوی (رابطة العالم الإسلامي) وەك ڕاوێژکاری فێرکاری بۆ جیهادی ئەفغانی دەست بەکاربووە.

* دواتر بە یەکجاری خۆی یەکلاکردووەتەوە بۆ جیهادی ئەفغانی و (مکتب خدمات المجاهدین)ی دامەزراند، کە بە ڕاستی خزمەتێکی دیار و بەرچاوی بە جیهادی ئەفغانی گەیاند لە بواری کۆکردنەوەی یارمەتی ماددی بۆیان و پاشان لەڕێی گۆڤاری (الجهاد) و نووسراوەکانیەوە توانی جیهادی ئەفغانی بکاتە جیهادێکی گشتی کە لە هەموو لایەکەوە موسڵمانان بە شەوقەوە خۆیان گەیاندە ئەفغانستان و چەندین لاوی موسڵمان لەو پێناوەدا شەهید بوون و لە کۆتاییشدا دکتۆر عبدالله عزام خۆی و دوو کوڕی دوا وانەی شەهادەتیان بۆ موسڵمانان تۆمار کرد.

خوای گەورە دکتۆر عبدالله عزام و هەموو شەهیدانی بەرگری لە ئیسلام و ئاڵای بەرزی لا الە الا اللە بە بەهەشتی بەرین شاد بکات. ئامین

## ناوەڕۆك

# پرۆژەی ( باشترین هاوڕێ )
# بڵاوکردنەوەی پەیام و بیری ڕەسەن و سەردەمیانە لە ڕێگەی کتێب و نامیلکەوە بۆ سەرجەم توێژەکان .

بەرهەمەکانی پرۆژە :

١ـ هاکا ئیسلام گەڕایەوە، (توێژینەوەیەکی کورتە لەسەر داهاتووی ئیسلام) نوسینی ئیکرام کریم.

٢ـ فەرهەنگی بانگخوازان، نوسینی (ئەندازیار عوسمان).

٣ـ بەرەو پەروەردەی ئیسلامی، نوسینی (ئەندازیار عوسمان)

٤ـ ڕامان لە قورئان، نوسینی (ئەندازیار عوسمان).

٥ـ بەخشین لە پێناوی خوادا، نوسینی (عەمر خالید) وەرگێڕانی (روقیە صدیق).

٦ـمانای ناوە جوانەکانی خوا، وەرگێڕانی (م.عمر نیظامی).

٧ـ گەڕانەوە لای خوا (سبحانە وتعالی)، نوسینی: عەلی باپیر.

٨ـ نائومێدنەبوون لە سۆز و میهری خوایی، نوسینی ئەحلام حەمەشەریف

٩ـ باڵاپۆشی، رێگرەکانی و مەرجەکانی.

١٠ـ بگە بە کاروان، نوسینی عبداللە عەزام، وەرگێڕانی باوکی عبدالرحمن.

١١ـ سەرداری مرۆڤایەتی (ﷺ)، نوسینی مەلا ئەحمەدی شەریعە.

١٢ـ سەروەرانمان لە مێژوودا، نوسینی د. مصطفی سباعی، وەرگێڕانی روقیە صدیق .

١٣ـ مامۆستاکەم بەم شێوە فێری کردین ، نوسینی : د.عائض القرني ، وەرگێڕانی : ئامینە صدیق .

١٤ـ تیرۆژێك لە کەسایەتی و ڕەوشتی پێغەمبەری پێشەوا (محمد) ﷺ ، ئامادەکردنی : یاسین زەنگەنە.

١٥ـ سودەکانی هاوڕێ یەتی پیاو چاکان ، ئامادەکردنی: حەمزە بەرزنجی .

١٦ـ تێگەیشتن و ئیجتهاد لە جیهاددا ، نوسینی : د.عبداللە عەززام ، وەرگێڕانی : هەورامان گەچێنەیی .

فيا ايها المسلمون ان حياتكم الجهاد وعزكم الجهاد
ووجودكم مرتبط ارتباطا مصيريا بالجهاد
فيا علماء الاسلام لقد ضاعت بلاد المسلمين
بقعة بقعة وابتلعت قطعة قطعة
وتسلط على رقابنا الطغاة واستنثر
بارضنا البغاة فنحن ندعوكم كالمتفرجين
فهل تتحولون لانقاذ الامة؟؟



چاپخانەی شارستان

لە بەریوەبەرایەتی گشتی کتیبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی ( 1655 )ی سالی 2012 پیدراوە